زنجیرەی نەوەی زێڕین



# تابلۆی نەوەیەکی چاوەڕوانکراو

کەریم کێسکین






# تابلۆی نەوەیەکی چاوەڕوانکراو

نووسینی: کەریم کێسکین
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مایس- ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢١٦)ی سالّی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

# ١. تەوەککول

بە هەزار و یەك ئەزموون سەلماوە زۆرجار کاتێك وتراوە "بەم هۆکارانە بێگومان دەگەین بە ئامانج"، زۆری پێ نەچووە ئەو هۆکارانە وردوخاش بوون. ئەوەی کە لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە گیانمان بدەین بە کۆڵماندا و لە بازنەی تەوەککولدا کاروبارەکانمان ڕاپەڕێنین.

## تەوەککول چییە؟

تەوەککول، بریتییە لە سپاردنی کارێك بە خوا دوای کردن و ڕەچاوکردنی هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانەی کە پێویستن. واتە تەوەککول بریتییە لە بەجێهێشتنی ئەنجامی کارێك بۆ خوای گەورە، پاش گرتنەبەری هەموو هۆکارەکانی. جا ئەو کارە کارێکی ئاینی بێت یان دونیایی، وە ڕەچاوکردنی هەموو ئەو هەنگاوانەی کە پەیوەستن پێیەوە. خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی تەوەککولمان بۆ دەکات:

﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ (آل عمران: ١٢٢)

واتە: "با موسوڵمانان تەنها پشت بە خوای گەورە ببەستن."
سەروەریشمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْه) دەفەرموێت: "ئەگەر ئێوە بەڕاستی تەوەککولتان بە خوا هەبێت هەروەك چۆن ڕۆزیی باڵندە دەدات ڕۆزیی ئێوەش دەدات."[1]

لەبەرئەوەی تەوەککول حاڵەتێکە پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، هەوڵدان و کۆششکردن بۆ بەدەستهێنانی شتێك بە جەستە دژی تەوەککول نییە. بەڵکو بریتییە لە ئەنجامدانی بەندایەتی کرداریی بە جەستە و پەیوەست بوونی دڵ بە خواوە و قەناعەتکردن بەو پێداویستییە سەرەکییانەی کە بۆ ژیانێکی ئاسایی پێویستن.

تەوەککول بە خوا بریتییە لەوەی کە بەندە لە نیعمەت و موسیبەت و خۆشی و ناخۆشی و هەموو ئەو شتانەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووە، تەنها خوای گەورەی بەس بێت. ڕاستی ئەنجامی کارێك لە مرۆڤەکان شاردراوەتەوە. ئەوەی کە خوا بۆ مرۆڤی هەڵدەبژێرێت باشترە لەوەی مرۆڤ بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێت. تەوەککول بریتییە لەوەی مرۆڤ لە هەموو کارێکدا متمانەی تەواوی بە خوا هەبێت و ڕازی بێت بە هەموو بڕیارێکی ئەو. نیشانە و پێوەری تەوەککولیش بریتییە لە ئارامگرتن لەسەر بەڵا و موسیبەتەکان.

---

١. ابن ماجة، الزهد، ١٤.

## ژیانی ئاسوودە لە "تەوەککول"دایە

ئەو کەسەی کە تەوەککولی نییە، لە بەرامبەر کێشە و گرفت و خەمەکانی ژیاندا دەتاسێت و لاواز دەبێت و لەوانەیە تەندروستیی رۆحی تێك بچێت. نەبوونی تەوەککول واتە خۆخستنە ژێر ئەو بارانەی کە مرۆڤ ناتوانێت لە ژێریاندا هەڵبسێتەوە. خودا هیچ کاتێك بارێك نادات بەسەر مرۆڤەکاندا کە لە توانایاندا نەبێت، بەڵام مرۆڤەکان بە نەبوونی تەوەککول خۆیان دەخەنە ژێر ئەو کۆڵە قورسانەوە.

هەندێك کەسیش سەرەڕای کۆڵی قورسی "ئێستا" دەچن باری گرانی "داهاتوو"ش دەدەن بە شانی خۆیاندا. ئەو ناخۆشییانەی کە لە ڕابردوودا ڕوویان داوە و ئەگەری دووبارە بوونەوەیان هەیە لە داهاتوودا، هەندێك لە مرۆڤەکان دووچاری ترس و بیم و خەفەت دەکەن. ئەم ترسەش هێزی مرۆڤ لەناودەبات. مرۆڤ ئەو هێزەی بۆ ژیانی ئەمڕۆ هەیەتی دەچێت دابەشی دەکات بەسەر ڕابردوو و داهاتوودا و، لە ئەنجامدا بەرامبەر بە ژیانی ئێستای لاواز و بێ هێز دەمێنێتەوە.

هەروەها مرۆڤ پێویستی بە هێزێکە لە ژیاندا پشتی پێ ببەستێت، ئەگەر ئەو هێز و توانا و وزەیەی کە لە داهاتوودا پێویستی پێی دەبێت، لە ئەمڕۆدا تەواوی بکات، ئەوا هیچ هێزێکی بۆ داهاتوو پێ نامێنێت.

## تێگەیشتن لە تەوەککول ترس و خەمەکان ناهێڵێت

ئەو ڕستانەی بۆ داهاتوو دەوترێن و بە "ئەی ئەگەر" دەست پێ دەکەن نیشانەی ترس و ئەندێشەن. "ئەی ئەگەر لە تاقیکردنەوەکەدا

دەرنەچم؟"، "ئەی ئەگەر نەخۆش بکەوم؟"، "ئەی ئەگەر لە کارەکەم ببم؟"، "ئەی ئەگەر بمرم؟". چارەسەری ڕزگاربوونیش لەم ڕستەی "ئەگەر"انە، تەوەککولە.

لە کاتێکدا داهاتوو هێشتا بوونی نییە. ئەو سەربازەی کە هەموو فیشەکەکانی دەگرێتە تارماییەکان و تەواویان دەکات، هەر کە ڕووبەڕووی دوژمن بووەوە بێ چارە دەمێنێتەوە. ئەگەر جەستە وزەی پێویست کۆنەکاتەوە لە کاتی نارەحەتیدا بەرگە ناگرێت. چونکە ئەو کەسەی تەوەککولی نییە هەم وزەی خۆی بە فیڕۆ دەدات و هەم هێزی خوای گەورەش لە پشتی خۆیەوە نابینێت.

لە تەوەککولدا قەبوڵ کردن و ڕازی بوون بە هەموو بارێك هەیە کە خوای گەورە دروستی کردبێت. چونکە ئەو کەسەی کە تەوەککولی هەیە هەموو هۆکارەکان دەگرێتەبەر، بەڵام دەزانێت کە بە ئیرادەی خۆی ناتوانێت هیچ شتێك بکات. لە بەر ئەوە خۆی لە ئەندێشەی بێ سوود ناتاڵێنێت، هەموو شتێك بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی بەجێ دەهێڵێت و هیچ شتێك بۆ خۆی ناهێڵێتەوە کە شانازیی پێوە بکات و، لە کەش و هەوایەکی مەعنەویی ئارامدا ئاسوودە دەبێت. چونکە لە تەوەککولدا ئاسودەیی و حەوانەوەیەکی بەردەوام هەیە. هەر لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە لەپێش هەموویانەوە سەرورمان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پاشان هەموو زانا و پیاوچاکان و هەموو مرۆڤە کامڵەکان، حەوانەوە و ئاسودەییان لە تەوەککولدا بینیوەتەوە و بەردەوام ئامۆژگاری خەڵکیان بۆ لای کردووە.

لە دونیادا هەموو کەسێك دەیەوێت پشت بە کەسێك ببەستێت، یان

ناوی یەکێك بەکاربهێنێت، یان پەنا بەرێت بۆ ناوی دەسەڵاتدارێك و کارەکانی بەناوی ئەوەوە ڕاپەڕێنێت و بحەوێتەوە. تەوەککولیش ئامانجێکی وەها ئارام بەخشی هەیە. لە قورئانی پیرۆزدا ئەم حەقیقەتە بەم شێوەیە باسکراوە: ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾ (الأحزاب: ٣) "هەمیشە و بەردەوام پشت بەخوا ببەستە، تەنها خوا بەسە کە پشتیوان و یاریدەدەر بێت."

کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەکەوە، کۆتا وتەی ئەمە بوو: "خوای گەورە بەسە بۆ من. خوا بریکارێکی چەند باش و جوانە." وە لە ئەنجامی ئەم تەوەککولەدا ئەو شاخە ئاگرینە بوو بە باخچەیەکی ڕازاوە.

## پشت بە خوا ببەستە و ئاسوودە بە

تەوەککول سپاردنی کارەکانمانە بە خوا، بەڵام وازهێنان لە هۆکارەکان نییە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بیەوێت بگات بە ئامانجێك بەڵام هەوڵی پێویستی نەدابێت و بڵێت: "من کارەکەم بە خوا سپاردووە" و پاشان چاوەڕێی سەرکەوتن بکات، ئەمە پێی ناوترێت تەوەککول. بە پێچەوانەوە ئەو کەسە بۆ ئەوەی بگات بەو ئامانجە بە ڕێکوپێکی و وردی هەوڵ دەدات و، هەموو هۆکارە پێویستەکان و ئەوەی لە توانایدا هەبێت دەیکات و، لە دوای هەموو ئەمانەوە چاوەڕێی ئەنجامەکەی تەنها لە خودا دەکات و ئەنجامەکەش هەرچی بێت پێی ڕازی دەبێت.

لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە، ئەویش نەگەڕاندنەوەی

ئەنجامەكانە بۆ هۆكارەكان. با ئەمەش بە نموونەیەك ڕوون بكەینەوە:
"با بڵێین نەخۆشێك بۆ چارەسەر دەچێت بۆ باشترین نەخۆشخانە و باشترین پزیشك لەو بوارەدا پشكنینی بۆ دەكات و دەرمانەكانی بە بەردەوامی و لە كاتی خۆیدا بەكاردەهێنێت و بە لەشساغی خۆی دەگات. ئەگەر ئەم كەسە چاكبوونەوەكەی ببەستێت بە نەخۆشخانە و پزیشك و دەرمانەكانەوە، ئەوا دژی تەوەككول دەبێت چونكە شیفابەخشی ڕاستەقینە تەنها خوایە. ئەوەی كە پزیشكی دروست كردووە خوایە و ئەوەی كە كاریگەریی چاكبوونەوەی لە دەرمانەكاندا داناوە هەر خوایە."

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بەم ڕاستییە كراوە.

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ (التوبة: ٥١)

واتە: "ئەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، پێیان بڵێ هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگە لەوەی كە خوا بۆی نوسیووین (هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان)، ئەو زاتە هەمیشە یار و پشتیوانمانە، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەو خوایە ببەستن."

بەدیهێنەرمان بۆ ئەوەی میوەمان پێشكەش بكات درەخت و بۆئەوەی درەختەكەش گەورە ببێت خۆڵ و تۆو و ئاو و تیشكی خۆری كردووە بە هۆكار. لەبەرئەوەی ئەم دونیایە شوێنی تاقیكردنەوەیە، ئەو نیعمەت و بەخششانەی خوای گەورە كە بە ئێمەی دەبەخشێت بەستوونیەتەوە بە كۆمەڵێك هۆكارەوە. ئەگینا ئەو خوایەی توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە پێویستی بە هۆكارەكان نییە. بەڵام ڕەچاوكردنی هۆكارەكان و

هەڵسوکەوتی ڕێکوپێك ڕێزگرتنی ئەو یاسایانەیە کە خوای گەورە دایناوە و یەکێکە لە داخوازییەکانی بەندایەتی.

ئیمانداری ڕاستەقینەی خاوەن تەوەککول لە هەموو کارەکانیدا ئەوەندەی لە توانایدا بێت بە بەرنامە و بە ڕێکوپێکی کار دەکات و هۆکارەکان دەگرێتەبەر، بەڵام پشت بە هیچ کام لەمانە نابەستێت. تەنها پشت بە خوا دەبەستێت و متمانەی پێدەکات. دەزانێت کە هەر خوایە هۆکار و ئەنجامەکانی دروست کردووە و لە دڵەوە باوەڕی پێیەتی. ئەگەر ناڕەحەتییەك یان ناخۆشییەکی بەسەردا هات دەڵێت: "ئەو خودایەی کە ڕەحمەتەکەی بێ سنوورە، ئاگای لە حاڵی منە و ئەمەش بێگومان خێرێکی تێدایە." بەم شێوەیە ئارام دەگرێت. کاتێکیش سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا یان گەیشت بە نیعمەتێك دەڵێت: "ئەمە لوتفێکی خوایە" و شوکر دەکات. ئەو مرۆڤەی کە تەوەککولی هەیە بەم تێگەیشتنەوە لە بەرامبەر ناڕەحەتترین بەڵادا بێئومێد نابێت. ئەگەر کەمێکیش بلەرزێت، ناڕووخێت. لە بەرامبەر گەورەترین سەرکەوتندا لەخۆبایی نابێت، بە پێچەوانەوە سوپاسگوزاری خوا دەبێت. بەم شێوەیەش دەگات بە ئاسودەیی ڕاستەقینە.

## ٢. وەفاداری و ڕاستگۆیی

ڕاستگۆیی کەسێك بەرامبەر بە دۆستەکانی بەوە دەپێورێت تا چەند ئازارەکانی ئەوان لە ویژدانیدا هەست پێدەکات و خۆشییەکانی ئەوان بە خۆشی خۆی دەزانێت. دۆستێك نەتوانێت بگری بە گریانی دۆستەکانی و نەتوانێت پێبکەنێت بە پێکەنینیان، بە دۆستێکی بە وەفا لە قەڵەم نادرێت.

### وەفاداری و ڕاستگۆیی چیمان فێردەکەن؟

وەفا نەشکاندنی پەیمان و پێدانی مافی تەواوە بە شتێك، وەفا ڕێز و ستایش و شوکرانەبژێرییە بەرامبەر بەو بەخشش و نیعمەتانەی خوای گەورە پێی بەخشیوین.

ڕاستگۆییش بە واتای ڕاستڕەوی و نەشکاندنی پەیمان و سەرڕاستی دێت. جگە لەمانە ڕاستگۆیی چەندین مانای دیکەی هەیە. وەك داواکردن و ویستنی چاکە بۆ براکەت لەبەر خوا، دۆستایەتی، وەفا بەرامبەر بە بەڵێن، پەیمان نەشکاندن، پاراستنی ئەمانەت و بەجێ

گەیاندنی ئەرکەکانی سەرشانمان. هەستی وەفاداری و ڕاستگۆیی یەکێکن لەو ئامرازە گرنگانەی کە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی مرۆڤ لای خوا و لای بەندەکانیش.

ئەرکی سەرشانی ئیمانداره کە بەوەفا و ڕاستگۆبێت بەرامبەر ئەو بانگەواز و بەها بڵندانەی کە باوەڕی پێ هێناوە و، هەروەها بەرامبەر بەو کەسانەش کە بوونەتە هۆکاری هەستکردن و ژیان لەگەڵ ئەم بەها بڵندانەدا هەمان ڕاستگۆیی و وەفا بنوێنێت.

یەکێك لە مەرجە گرنگەکانی وەفاداری و ڕاستگۆیی ئەوەیە باوەڕمان وابێت کە هەموو مرۆڤێك بەشێك لە چاکەی تێدایە. چەندین نەوە چاوەڕێی دەستی یارمەتیی مرۆڤە ڕاستگۆکانن. بەجێهێشتنی ئەوان بە بێکەسی، لە پاڵەوانانی وەفا و ڕاستگۆیی ناوەشێتەوە.

بەشی خوێندنەوە

## هاوەڵی بەوەفا کێیە؟

مرۆڤ سێ هاوەڵی گرنگی هەیە. یەکێك لەمانە بەوەفا و دوانەکەی دیکەیان بێ وەفان. لەم سێ هاوەڵە؛ یەکێکیان ماڵ و موڵك و ئەوی تریان خزم و دۆست و، سێهەمینیان کارە باشەکانیەتی.

کاتێك مرۆڤ دەمرێت، ئەو ماڵ و موڵك و سامانەی بە درێژایی ژیانی دونیا پێکەوەی ناوە بەجێیدەهێڵێت.دۆستەکانی تا دەرگای گۆڕ لەگەڵیدا دەڕۆن. دوای ئەوەی ئەم ئەمانەتە قورسەیان ناردەوە بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی، بە دڵگرانییەوە خواحافیزی لێدەکەن و دەگەڕێنەوە.

بەوەفاترین دۆستی مرۆڤ کە هیچ کاتێك بەجێی ناهێڵێت، بریتییە لەو بەندایەتییانەی کە وەك توێشووی ئەبەدیی وان و ئەو ئێش و ئازارانەی لەڕێی خوادا دەچێژرێن و، ئەو ماندووبوون و ناڕەحەتییانەی لەکاتی خزمەتکردنی ڕێگای خوادا دووچاری دەبێت. دان بەخۆدا گرتن لە بەرامبەر ناڕەحەتییەکان و ماندوویەتی لە کاتی خزمەتکردنی ڕێی خوا، ئەو شتانەن کە لێرەوە لەگەڵ خۆیدا دەیانبات و گۆڕ تێدەپەڕێنن و لە پردی سیرات دەپەڕنەوە و لەکۆتاییشدا لەشێوەی بەختەوەری هەمیشەییدا خۆیان دەنوێنن.

## وەفاداری و ڕاستگۆیی دەبێت بەرامبەر چی و چۆن بێت؟

هەوڵ دەدەین لە چەند خاڵێکدا کورتی بکەینەوە.

١) وەفا بەرامبەر پەروەردگارمان کە هەموو هۆکارەکان دەگەنەوە سەر ئەو و تاکە ئامانج و تاکە مەبەستمانە.ئەمەش بەوە دەبێت کە بەو شێوازەی قورئان و سوننەت فەرمانیان پێکردووین، بەندایەتی خوای گەورە بکەین.

٢) وەفا بەرامبەر پێغەمبەر(صَلَّىَ اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). ئەمەش بەوە دەبێت کە شوێنکەوتەی ئەو بین و بە مرۆڤایەتی بناسێنین و ئەو ئاینەی کە ئەو لەپێناویدا هەزار و یەك ئازار و ناڕەحەتی کێشا، بگەیەنین بە هەموو کەسێك.

٣) وەفا بەرامبەر قورئان. ئەمەش بەوە دەبێت کە زۆر بیخوێنینەوە و کاربکەین بە فەرمانەکانی و لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە بیکەین بە تاجی سەرمان و هەوڵبدەین بۆ گەیاندنی ئەو ڕاستییە بڵند و هەستە باڵایانەی کە لە قورئانەوە وەرمانگرتووە بە هەموو جیهان.

٤) وەفا بەرامبەر بە نایابترین ئاین کە کۆتا ئاینە و چاکەیەکی گەورەی پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی، کە ئەویش ئیسلامە. ئەمەش بەوە دەبێت وەك ئەسپێکی بە هیممەت لەکاتی ڕاکردندا و لەساتی خزمەتکردنی ئەم ئاینەدا بمرین و، هەوڵبدەین هەستیارییەکی وا بەدەست بهێنین، کە هەتا ئەم قورئانە، کە ڕەچەتەی ڕزگاریی ماددی و مەعنەویی مرۆڤایەتییە نەگەیەنین بە دوورترین گۆشەی ئەم جیهانە، دڵمان ئاو نەخواتەوە.

٥) وەفا بەرامبەر هەموو کەسایەتییە گەورەکانی ئەم ئاینە، کە لە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە دەست پێ دەکات تا پیاوە مەزنەکانی ئەمڕۆ.

ئەویش بە لەبیر نەکردنی ئەو شتە چاکانە دەبێت کە ئەوان بوونەتە هۆکاری و بەوە دەبێت بەردەوام یادی بەخێریان بکەین و، ڕێز و ستایشی شایانیان لێ بگرین و، هەوڵبدەین بۆ بەخشینی ئەو جوانییانەی کە بەهۆی ئەوانەوە پێمان گەیشتوون بە کەسانی دیکە.

٦) وەفا بەرامبەر بەو کەسانەی کە لەم سەردەمەدا و لە ڕێگای خزمەتی ئیمان و ئیسلامدا ڕابەرێتیمان دەکەن. وەفا بەرامبەر بەو کەسانەی نیشانیان داوین کە چۆن لە هەلومەرجەکانی ئەم ڕۆژگارەماندا لە ڕاستییەکانی ئیسلام تێبگەین و کار بە ناوەڕۆکەکانیان بکەین. ئەمەش تەنها بەوە دەبێت خۆمان بە هاوخەمیان بزانین و دوعای خێریان بۆ بکەین و ئەو تایبەتمەندییانە لەخۆماندا بەرجەستە بکەین کە ئەوان خەونیان پێوە بینیوە و حەسرەتیان بۆی کێشاوە.

بەشی خوێندنەوە

## وەفاداری

وەفا یەکێکە لەو گوڵانەی کە لە کۆڕی دۆستانەدا دەڕوێت. بە دەگمەن لە کەشی دوژمنایەتیدا دەبینرێت، تەنانەت مەحاڵیشە. وەفا بەردەوام وەك هەوا لە دەوروبەری ئەو کەسانەدا هەڵدەکات کە هەمان هەست و هزر و خەیاڵیان هەیە. هەرچی ڕق و قین و حەسودیشە بۆ ساتێکیش بێت مافی ژیان بەگوڵی وەفا نادەن و دەیکوژن. بەڵێ، ئەو لە ژێر سایەی خۆشەویستی و مرۆڤایەتیدا بەرز دەبێتەوە و پێدەگات، بەڵام یەك سات لە ناو ئاو و هەوای دوژمنایەتیدا بێت دەژاکێت و نامێنێت.

هەندێك پێناسەی وەفایان بەوە کردووە کە: مرۆڤ ئاوێتەی ناخی بێت. ئەم پێناسەیە گەر کەم و کورتییەکیشی تێدابێت واتاکەی هەر ڕاستە. لەڕاستیدا هەبوونی وەفا لای کەسانێك کە خاوەنی ژیانی ڕۆحی و گیانی نین، یەکجار دەگمەنە. دەربڕینی وتەی ڕاست لە کاتی قسەکردن و وەفاداریی بەرامبەر بەو سوێند و پەیمانانەی کە دراون، وابەستەن بە ژیانی ڕۆحەوە. ئەوانەی نەیانتوانیوە خۆیان لە درۆ و هەڵخەڵەتاندن بپارێزن، هەمیشە بە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی داویانە مامەڵە دەکەن و هەست بە قورسایی لێپرسراوێتی سەرشانیان ناکەن.

بەڵێ، گریمانکردنی هەبوونی ژیانی مەعنەوی لەم مرۆڤە موونافیق و ڕیاکارانەدا تەنها خۆهەڵخەڵەتاندنە. چاوەڕێکردنی وەفاش لەم جۆرە کەسانە نیشانەی بێئاگایی تەواو و خۆشباوەڕییە.

بەڵێ ئەو کەسەی متمانە بە بێوەفا بکات، زوو یان درەنگ پەشیمان دەبێتەوە. ئەوەی بێوەفا هاوسەفەری ڕێی دووری بێت، لە ڕێگەدا بە تەنیا دەمێنێتەوە. ئەوانەش کە بێوەفایەك بە ڕابەر و چاوساغی خۆیان دەزانن، بەردەوام چاویان پڕە لە هیجران و ئەسرین.

تاك، بە هەبوونی وەفا شایەنی باوەڕپێکراویی دەبێت و بەرز دەبێتەوە. ئەگەر خێزان لەسەر بنەمای وەفا بنیاتنرابێت بەردەوام دەبێت و هەمیشە بە زیندوویی دەمێنێتەوە. گەلیش بەم هەستە بڵندە دەگاتە فەزیلەت. دەوڵەت تەنها بەم هەستە دەتوانێت پێگە و متمانەی خۆی بپارێزێت لە بەرامبەر هاوڵاتییەکانیدا.

لە وڵاتێکدا کە وەفای تێدا کاڵ بێت، نە تاکەکانی پێگەیشتوو دەبن و، نە خێزانەکان ئاشتییان تێدا دەبێت و، نە دەوڵەت خاوەنی متمانە و دامەزراویی دەبێت. لە وڵاتێکی وەهادا کەسەکان دەبن بە سەرچاوەی گومان بۆ یەکتر و، ئەندامانی ناو خانەوادەش نا ئاسودەن و، دەوڵەتیش بۆ گەلەکەی دەبێت بە بەدبەختی و، هەموو شتەکان وەك بێگیانان بە یەکتری نامۆ دەبن، هەرچەندە لەسەر یەك و لە ناو یەکیشدان... وەفا یەکگرتن و یەکێتی تاکەکان دەستەبەر دەکات. لە سایەی وەفادا بەشەکان دەبنە گشت، پارچە جیاجیاکان دەگەن بەیەك و یەکبوون دروست دەکەن. کاتێك هەستی وەفا گەیشتە مەنزڵی بێپایانی،

ئەوکات لەو مەنزڵەوە شەبەنگی ڕووناکی دەگاتە سەر کۆمەڵەکان و، ڕێگاکانیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە و، هەرچی بەربەستی ناو کۆمەڵگە هەیە هەڵیدەگرێت. بەو مەرجەی ئەو کۆمەڵگەیە بە هەستی وەفا پێگەیشتبێت و خۆیان تەسلیمی باوەشی میهرەبانیی ئەو بکەن.

دڵت داوە بە پەیامێك؟! یان وابەستەی ئامانجێك بوویت؟!.. دۆستایەتیت لەگەڵ یەکێك بەستووە؟! مادەم وایە وەرە، درێغی مەکە و گیانت فیدای بکە، با سەروەت و ماڵت تاڵان بکرێت و بڕوات، بەڵام تۆ هەر بە وەفا بە!! وەفا و وەفاداران لای خوا و لای خەڵکیش خاوەنی پلە و پایەن.

"بانگێك هات لە خواوە. وەرە ئەی عاشق تۆ مەحرەمیت
ئێرە مەقامی مەحرەمەییەتە، تۆ لە ئەهلی وەفا حسێبیت"

(نەسیمی)

حەزرەتی ئادەم (عَلَیْهِالسَّلَام) دەرگا داخراوەکانی بە کلیلی نهێنی وەفا کە لە دڵیدا هەڵیگرتبوو یەك یەك واڵا کرد و گەیشتە چاوگەکانی (لێخۆشبوون). لە هەمان ڕووداودا ئیبلیسی لەڕێ دەرچوو بە ئاشکرا ڕۆیشت و خۆی فڕێدایە نێو چاڵی دۆزەخەوە و تێیدا خنکا.

پێغەمبەری تۆفانیش، حەزرەتی نوح (عَلَیْهِالسَّلَام)، تەمەنێکی چەندین سەدەیی پڕ لە خەم، بەڵام تەژی لە وەفا ژیا. ئاگادارکردنەوەی چەندین ساڵەی ئەم پێغەمبەرە کاریگەری لە کۆمەڵێکی زۆری نێو گەلەکەی نەکرد، بەڵام ئەمە نەبووە هۆی دوورخستنەوەی حەزرەتی نوح لەو

هەستی وەفایەی کە بەرامبەر دەرگانەی پەروەردگاری هەیبوو. لەو کاتەشدا کە زەوی و ئاسمان شەپۆلی تووڕەییان ئاڕاستەی مرۆڤایەتی دەکرد، ئەم وەفادارییەی بوو بە کەشتییەکی فریادڕەس بۆی.

دۆستی هەق و باوکی پێغەمبەرانیش لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاگری نەمرووددا چەندە وەفاداربوو! هەناسەی وەفادارانەی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە کە لە شێوەی (حەسبی حەسبی!)دا بوو، ئاسمانەکانی دەهێنایە هاوار، کاتێکیش لەگەڵ شەماڵی لەدوورەوەهاتووی ڕەحمەتدا یەکانگیر دەبوو، سینەی ئاگری دۆزەخئاسا لەبەرامبەر ئەمدا بێگومان دەبووە (بەرد و سەلام).

پێشەنگی قودسییەکان، یەکەمینی سەرجەم هاتوو و ڕۆیشتووەکان، لە گەشتی ئەوپەڕی ئاسمانەکاندا کە بە نسیبی کەس نەبووە، لە سایەی وەفای نێو ڕۆحیدا سەرکەوتوو بوو. بەڵێ، ئەو لەم سایەیەدا گەیشتە ئەو هەرێمانەی کە فریشتەکان پێی ناگەن، بەو دەوڵەتانە گەیشت کە هیچ فانییەك نایگاتێ. دواتریش لەگەڵ هەستی وەفاداریی بۆ ئوممەتەکەیدا ئەو جیهانی بەختەوەرییەی جێهێشت کە چاوەکان لە بەرامبەریدا ئەبڵەق دەبوون و دڵەکان لەبەردەمیدا سەرسام و مەست دەبوون. دەستەویەخە لەگەڵ ڕووداوەکاندا، بە چوونە ژێر باری بەرپرسیارێتییە قورسەکان، ئەوانیشی بەرەو ئەو هەرێمە مەزنانە بەرز دەکردەوە. هەستی وەفاداری بەرامبەر دۆست و هاوڕێیانی بوو وای لێکرد بەهەشت و حۆرییەکانی بیر بچێتەوە. ئەو پەیمانێکی وەفاداریی بەوان دابوو، ئەم پەیمانە وایکرد لە کاتی گەیشتن بە سەرجەم جوانییە

ئاسمانییەکاندا، هەموو پلە و پایە مەعنەوییەکان لە لایەکەوە دابنێت و دیسان بگەڕێتەوە بۆلایان. بۆ ناو ئەم دونیا پڕ خەم و پەژارەیە!..

دەفتەری کردەوە چاکەکانی هەموو ئەوانەی بەرزبوونەتەوە، بە وەفا کۆتایی پێهاتووە و بە وەفاش مۆر کراووە. کتێبی ناشرینی لەڕێ جێماوانیش مۆری بێوەفایی لێدراوە. بەڵێ، ئەوانەی فەرمانبەرییەکەی سەر شانیان پاش چەند هەنگاوێك دادەنێن و لەم بارەیەوە بێوەفایی دەنوێنن و دەخزێنە سووچێکەوە، مۆری زەلیلەت و ڕیسواییان لێدەدرێت و فڕێدەدرێنە نزمترینی نزمییەکانەوە. ئەوانەی تەنانەت بۆ چارەکە ڕۆژێك ئارامیان لەسەر ئەم ئەرك و ڕێبوارییە پیرۆزە نەگرت و خۆیان لێ دزییەوە، بوونە گروهی ملهوڕانی ڕێ ونکردوو.

دواجار کاتێك نۆبەی خەمی پیرۆز هاتە سەر ئێمە، بە چاکترین پەیمانی وەفاوە هاتینە ژێر باری ئەم بەرپرسیارێتییە مەزنەوە. بە جۆش و خرۆش و عەزمەوە بوین و بڕیارمان دامەزراو بوو. بەڵام هەیهات... دێوێکی چاوەڕواننەکراو ڕێی پێگرتین و هەموو ئەو پەیمانانەمان شکاند. دواتریش، هەموو لایەك بوو بە بیابان. هەموو جوامێرییەکان وەك ڕۆن توانەوە. دڕکەکان شوێنی گوڵەکانیان گرتەوە. کاتێك مانگ و خۆرەکان یەك لە دوای یەك ئاوا بوون، هەورە پڕ زوڵمەتەکان چواردەوریان تەنی. باخ نەما و باخەوانیش مرد، "شانەی هەنگ خامۆشبوو و، هەنگوینیش نەما." ئیدی بەدبەختانی ئەم سەردەمە، گیرۆدەی کەمبوونەوەی مرۆڤ بوون، کەوتنە پیاهەڵدان و مەراییکردن بۆ ئەو ڕۆحە مردووانەی کە دڵیان خاڵییە لە هێندەی

گەردێك لە ئەمانەت و هەستی وەفا. بە وتنی "چەند ئاقڵە، چەند جوامێرە!"، ڕۆحی خاو نەما چەپڵەی بۆ لێنەدەن... ئەمە ئەو دوا ناڵە و دوا نەعرەتەیەیە کە لە دڵی خەلکی ئەم سەردەمەوە بەرز دەبێتەوە، قیژەیەکی تیژە، کە بە ویقاری یاخیبوون بەرامبەر بێوەفایی سەدای دێت.

لەم سەردەمەدا، چەندین دێو و درنج داهاتن کە دیلی درۆ و زیادەڕەوین، چواردەوریان تەنیوین. چەندین ئەژدیها کە هەر ڕۆژە چەند جارێك سوێند دەشکێنن، هەموو جارێك لە پەیمان پاشگەز دەبنەوە و بۆ هەمیشە لە هەستی وەفا بێبەش دەبن!.. زەوی و ئەوانەی لەسەرین نەفرەتیان لێدەکەن، ئاسمان و دانیشتووانیشی نەفرەتیان بۆ دەنێرن.

ئەم هەموو "ناچیز و بەدڕەوشت"ە لەکوێوە هاتن؟! کام خیانەتکارە باوەشی بۆ ئەمانە کردەوە و دایکایەتی بۆ کردن؟!.. کام بەدبەخت ئەمانەی لە سینەیدا گەورە کرد و کام دەمی شووم فەرمووی لەمانە کرد!..

ئای وەفا، تۆ لە کوێی! بێزاربووین لەوانەی هەموو ڕۆژێك چەند جارێك سوێندیان دەشکێنن و لە پەیمان پاشگەز دەبنەوە. لەو نامەردانەی هەموو وتەیەکیان زیادەڕەوی و هەموو ڕەفتارێکیان دەستکردە، لەو دڵە شوومانەی بێبەشبوون لە هەستی بەرزی وەفا!.. لەکوێن ئەی ئەو دۆستە وەفادارانەی بۆ نەشکاندنی پەیمانێك کە دابووتان چەندین ڕۆژ لەسەر یەك شوێنی دیدارتان جێ نەدەهێشت!.. لە کوێن ئەی ئەو مەردی کوڕی مەردانەی کە وەفا لەگەڵ ڕۆحتاندا یەکانگیر

بووه!.. لە کوێن ئەی ئەوانەی لەپێناو وەفایەکدا وێران بوون و بوون بە خاك و ڕۆیشتوون، ئەی مرۆڤە نێوچاوان سپییەکانی سەردەمێکی زۆر بەرەکەتدار!..

هەستن، وەرنە نێو ڕۆحمان.. خەیاڵەکانمان تاویدەن، چیتان بە ناوی وەفاوە پێیە بیرپێژنە نێو سینەمان، بۆ نێو ئەو سینەیەمان کە مەردایەتی و پاڵەوانێتی و وەفای تەواو لەیاد کردووە!.. بمانگەیەننە کانیی (خضر)! وەرن، وەرن ئەم دوو سێ مرۆڤە بەوەفایەی لێرە و لەوێ دەسوورێنەوە، لە تێکشکان و بێئومێدی ڕزگار بکەن!..

بە ئومێدی سەلامەتیی بیرۆکەی وەفا لەلای ئەم نەوەیەمان کە تینووی وەفایە[1]...

## وەفاداریی سەروەرمان چۆن بووە؟

سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کەسێکی بەوەفا بوو. پابەندی بەڵێنەکانی دەبوو و، ڕاستگۆبوو بەرامبەر پەیمانەکانی و، پەشیمان نەدەبوویەوە لە قسەکانی، هەر کەسێك یارمەتی خۆی یان هاوەڵانی دابێت، هەرگیز لەبیری نەدەچووەوە. ئەم چاکەیەی بە هیچ شێوازێك لەبیر نەدەکرد. زۆرجار سەری لە دۆستەکانی دەدا و حاڵی دەپرسین.

کاتێك باسی وەفا بکرایە پێغەمبەری خوا دەهاتەوە یاد. ئامۆژگاری موسڵمانانیشی دەکرد کە بە وەفا بن.

---

١. موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، چاخ و نەوە.

لەم بارەیەوە چەند ڕووداوێك وەك نموونە دەگێڕینەوە:

یەکێك لە هاوەڵەکانی کە عەبدوڵای کوڕی ئەبولحەمسەیە دەگێڕێتەوە: "لەگەڵ پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيهِ أَلفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) کڕین و فرۆشتنێکم ئەنجامدا، پێم وت: "تۆزێك چاوەڕێ بکە دێمەوە." بەڵام من ئەم بەڵێنەم لە بیرچووە و سێ ڕۆژ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕبوو، کاتێك هاتەوە یادم و ڕۆیشتم، بینیم لە هەمان شوێن هێشتا چاوەڕێی منی دەکرد."[١]

لەمەوە تێدەگەین پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) کەسێکی باوەڕ پێکراو بووە لە بازرگانیدا و، زۆر ڕاستگۆ بووە لە بەڵێنەکانیدا. تەنها بەوەندە نەوەستابوو کە چاوەڕێی هاوکارەکەی بکات، بەڵکو خەمی ئەوەشی بوو نەوەك شتێکی بەسەر هاتبێت.

موتعیمی کوڕی عەدیی یەکێك بوو لە سەرکردەکانی قوڕەیش. کاتێك پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) لە طائیف دەگەڕێتەوە، دوژمنەکانی دەیانەوێت نەهێڵن بێتە ناو شاری مەککە. پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيهِ) بە سەرە داوای پەنا و پارێزگاری لە زۆربەی سەرکردەکانی قوڕەیش کرد، بەڵام کەسیان ڕازی نەبوون. تەنها موتعیم قەبوڵی کرد و، کوڕەکانی پڕچەك کرد و، پەنای پێغەمبەری سەروەرمانی دا و هێنایە شارەوە.

دوای چەند ساڵێك موتعیم لە شەڕی بەدردا لەناو بێباوەڕەکانی قوڕەیشدا دژی موسوڵمانەکان جەنگا و کوژرا. حەسسانی شاعیری

---

١. ابن سعد، الطبقات، ٥٩/٧؛ شبلي، عصر السعادة، ١٣٧/١.

پێغەمبەر لە دوای مردنی ئەم پیاوە، لە شیعرێکیدا وەسفی چاکەکانی ئەو دەکات کە لە کاتی خۆیدا پارێزگاریی لە پێغەمبەرمان کردووە.

سەروەرمان زۆر دڵ خۆش بوو بەرامبەر بەم وەفادارییە. کاتێکیش مشتومڕی ئەوەبوو داخۆ چی بکرێت لە دیلەکانی دوژمن، فەرمووی: "ئەگەر موتعیم بمایە و داوای ئازادکردنی دیلەکانی بکردایە بێ ئەوەی داوای فیدیەش بکەم هەموویانم ئازاد دەکرد." ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە وەفاداریی لای پێغەمبەر (عَلَيهِ ألفُ صَلاةٍ وَسَلام) گەیشتووەتە لوتکە.

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلى آلِهِ وصَحبِهِ وَسَلَّم) بەوەفاش بوو بەرامبەر هاوپەیمانەکانی.هۆزی بەنی بەکر کە لە ڕێکەوتننامەی حودەیبییەدا لەگەڵ قوڕەیشییەکان بوون، هێرش دەکەنە سەر هۆزی خوزاعە کە لە ڕێکەوتنامەی حودەیبیەدا بەیعەتیان بە موسوڵمانەکان دابوو. قوڕەیشیەکان لە ژێرەوە یارمەتی ئەم هێرشەیان دەدا. کاتێك ئەندامانی هۆزی خوزاعە هەواڵەکەیان بە سەروەرمان (عَلَيهِ أفضَلُ صَلاةٍ وَسَلَام) گەیاند، ئەویش ڕاستەوخۆ نووسراوێکی نارد بۆ قوڕەیش و پاشان هێزێکی سەربازیی ئامادە کرد. ئەم ڕووداوە بە هۆکاری ڕزگارکردنی مەککە لە مێژوودا شوێنی خۆی کردەوە. بەم شێوازە سەروەرمان (صَلَواتُ اللهِ عَلَيهِ) هاوپەیمانێکی خۆی بە تەنها نەهێشتەوە.

سەروەرمان زۆر بەوەفاش بوو بەرامبەر ئەوانەی کە کۆمەکی هاوەڵانیان کردووە.

ڕۆژێك نوێنەرانی حوکمڕانیی (حەبەشە) دێنە خزمەت پێغەمبەرمان

(صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). پێغەمبەرمان گرنگییەکی زۆریان پێدەدات. هەندێك لە هاوەڵان فەرموویان "ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە خزمەتیان دەکەین، تۆ پشوو بدە." بەڵام پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەم شێوازە وەڵامی دانەوە: "ئەوان میوانداری هاوەڵەکانی منیان کردووە لە کاتی هیجرەت کردنیاندا. منیش دەمەوێت لە بەرامبەردا خزمەتیان بکەم." ئەو هۆزانەی کە سەردانی مەدینەیان دەکرد بە جوانترین شێواز بەڕێی دەکردن.

## وەفا بەرامبەر سەروەرمان چۆن دەبێت؟

پاراستنی میراتی ماددی و مەعنەویی سەروەرمان بە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی وەفا بەرامبەر بە ئەو دادەنرێت. هاوەڵە بەڕێزەکانی هەروەك چۆن پاڵپشت و پارێزەری بانگەوازە پیرۆزەکەی بوون،هەرواش هەموو شوێنەوارێکی ئەویان بە ئەمانەتێکی پیرۆز زانیوە و وەك گیانی خۆیان پاراستوویانە. چ تاڵی قژی یان ڕیشی موبارەکی یان نینۆکەکانی یان هەر شتێك پەیوەندی بە سەروەرمانەوە هەبووبێت بە گرنگییەکی زۆرەوە پاراستوویانە. هەندێك لە هاوەڵان دڵیان نەهاتووە لەدوای خۆیان جێی بهێڵن و حەزیان کردووە پارچەیەك لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ جیهانی هەمیشەیی.

دیسان زۆربەی ئەمانەتە پیرۆزەکان گەیشتوون بەم سەردەمەش. هەروەك چۆن قورئان و سوننەت بوون بە شیفا بۆ ژیریی و دڵمان، ئەمانەتەکانی تریش بوون بە شیفا بۆ چاوەکانمان. حەزرەتی عەبدوڵای

کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت) لە شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلاةِ وَسَلَام) و لێکۆڵینەوە و یادکردنەوەی ئەمانەتە ماددی و مەعنەوییەکانی پێغەمبەری خوا و گەڕان بە دوایاندا شوێنێکی تایبەتی هەیە. حەزرەتی عەبدوڵڵا یەکێکە لەو هاوەڵە ناوازانەی کە خۆشەویستی پێغەمبەری کردبوو بە ئامانجی ژیانی خۆی. تاسەیەکی بێوێنەی هەبوو بۆ ئەو یادگارییانەی کە پێغەمبەری سەروەرمان بەجێی هێشتبوون. کاتێك پێغەمبەری خوا لە ژیاندا بوو لاسایی هەڵسوکەوتەکانی ئەوی دەکردەوە و وەکو ئەو دەڕۆیشت و وەك ئەو دەیخوارد و دەیخواردەوە. تەنانەت پێغەمبەر لە ژێر سێبەری چ دارێکدا دانیشتبێت ئەویش دادەنیشت و، ئاوی ئەو دارانەی دەدا بۆ ئەوەی وشك نەبن.

لە دوای وەفاتی پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلاةِ وَسَلَام) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کاتێك سەروەرمانی دەهاتەوە یاد لە حەسرەتدا چاوەکانی پڕ دەبوون لە ئەسرین. عاسمی کوڕی موحەممەد، باسی ئەوە دەکات هەرکاتێك باسی پێغەمبەری سەروەرمان بکرایە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەستی دەکرد بە گریانێکی بەکوڵ.

لە حەسرەتی سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بەهەموو هۆکارەکان ڕێزی لە یادگارییەکانی ئەو دەگرت، دەستی بەو شوێنانەی سەر مینبەرەکەدا دەهێنا کە کاتی خۆی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێی پیرۆزی لەسەریان دانابوو. پاشان دەستی دەهێنا بە دەموچاویدا و بە یادگارییەکانی ئەو دەژیا.

گرنگییەکی تایبەتی دەدا بەو شوێنانەی کە پێغەمبەر نوێژی تێدا کردووە. دوای فەتحی مەککە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ناو کەعبەدا نوێژی کرد، یەکسەر بەدوایدا هاوەڵانیش ویستیان بچنە ژوورەوە و نوێژ بکەن. یەکەم کەس کە خۆی کرد بە ژوورەوەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو. یەکسەر لە بیلالی پرسی داخۆ پێغەمبەر لەکوێدا نوێژی کردووە. کاتێکیش بە گوندەکانی دەوروبەری مەدینەدا دەگەڕا و ڕێی کەوتە گوندی کوڕانی موعاوییە، لێی پرسین داخۆ پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لە چ جێگایەکی مزگەوتەکەیاندا نوێژی کردووە.[1]

پاراستنی ئەمانەتەکانی پێغەمبەر و، ڕێزگرتنی و، یادکردنەوە و سڵاوات لێدانی، داخوازییەکانی وەفادارین. هەم هاوەڵە بەڕێزەکان و هەم باو و باپیرانیشمان ئەم وەفایەیان نیشانداوە و وەك ڕێبەرێك ڕێنموونییان کردووین کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

١. امام مالك، موطآ، قورئان، ٣٥.

بەشی خوێندنەوە

## وەفا بەرامبەر بانگەواز پێویستە چۆن بێت؟

خوای گەورە شاخەکانی بۆ ڕاگیرکردنی زەوی دروست کردووە. شاخەکان بە ئەندازەی ئەو بەشەی کە دەبینرێت، بەلایەنی کەمەوە دوو ئەوەندەشیان لە ژێرەوەیە. بەڵێ ئەوانەی کە دڵیان وابەستەی ئەم بانگەوازە پیرۆزە کردووە پێویستە بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێن کە یارمەتییان دەدات ڕێبواری هەمان ڕێی حەزرەتی "خضر" بن و لە کانیاوی "خضر" ئاوی حەیات بنۆشن. دەبێت شەوانیان وەك ڕۆژ ڕووناك و، جیهانی ناوەویان لە دەرەویان فراوانتر بێت و، هەر یەکە وەك چیا پاڵەوانی مەعنا بن و لە حزووری پەروەردگاردا فرمێسك بڕێژن.

بەڵێ، مرۆڤ دەبێت هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆنترۆڵ بکات. چۆن فڕۆکەیەك پێش ئەوەی بفڕێت پشکنینی باڵ و پەروانە و مەکینە و تەنانەت بچووکترین پارچەکانی دەکرێت، ئاواش مرۆڤ دەبێت تەنانەت بچوکترین هەستەوەرەکانیشی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

ئەمەش پێوەری لێپرسینەوەیە لەخۆمان: ئەگەر کەسێك لای خەڵکی بڵێت "خزمەت" و "ڕەزامەندی خوا" و ئەم وشانەی لە گەرووی نەچێت بەودیودا و، هەمان هەستی نەبێت و، تەنانەت دەمارەکانی لاجانگی بۆ

هەمان هەست تەپە تەپ نەکات و، سکی نەداتە ئێش، ئەوا لەوانەیە هەڵگری یەکێك لە نیشانە دیارەکانی دووڕوویی بێت.

نیشاندانی وەفاداریی بەرامبەر بانگەواز بە گرنگترین لێپرسراوێتی شوێنکەوتوانی دادەنرێت. باسکردنی کەڵەپیاوانی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر کە لە سەروو دونیای هزری ئێمەوەن بە ئێمە ناکرێت، بەڵام گەر حەزرەتی ئەبوبەکری ڕاستگۆ (رضي الله عنه) پارچە پارچە بکرێت، هەر دڵۆپە خوێنێکی ناڵەی "وەفا و وەفا"ی لێ بەرز دەبێتەوە. گەر سەیری ئەم حەزرەتە بکەین لە کاتی هیجرەتدا کچە حەوت هەشت ساڵەکەی لەگەڵدا نەبوو کە حەزرەتی عائیشەیە.هەروەها حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) کاتێك هیجرەت دەکات عەبدوڵڵای کوڕە بچوکی لەگەڵدا نەبووە.

سەروەرمان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە حەزرەتی سەلمان (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ”ئەگەر ئاین لەسەر ئەستێرەی سورەییاش بێت کەسانێك لە هۆزەکەی تۆ دەچن و دەیهێننە خوارەوە.“ بەڵێ تەنانەت ئەگەر ڕاستییەکانی ئاین بە ئەستێرەی سورەییاشدا هەڵواسرابن پێویستە لە سەر پاڵەوانی بانگەواز هێندە وەفای هەبێت کە بڕوات و دایانبگرێت.

جگە لەوەش بانگەوازکار بە ئەندازەی باوەڕی بە بانگەوازەکەی، ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکات کە دەکەونە سەرشانی. لەم ڕۆژگارەدا لەژێر ناوی جامی سەرۆك وەزیران و جامی سەرۆك کۆماردا[1] چەندین

[1]. نوسەر لێرەدا مەبەستی ئەو خول و پێشبڕکێ وەرزشیانەیە کە لەژێر ئەم جۆرە ناوانەدا ساز دەکرێن، وەك {جامی شای ئیسپانیا}.

پێشبڕکێی جیا جیا و یاری ساز دەکرێت. ئەو کەسانەی لە سەر بانگەوازی ئیسلامن پێشبڕکێ بۆ جامێك دەکەن کە براوە لایەکی جامەکە بەرزدەکاتەوە و لایەکەی دیکەش خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە. لە ڕاستیدا، تا ئەوپەڕی شایەنیەتی ئەگەر گیان فیدای جامێکی لەم جۆرە بکرێت!..

# ٣. گوێڕایەڵی

## گوێڕایەڵی چییە؟

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾
(النساء: ٦٩)

واتە: "ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر بکات، ئەوا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کە خوا نازونیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمێکی چاك و بێ وێنەن!"

گوێڕایەڵی لە فەرهەنگدا بە واتای ملکەچی، قایلبوون لە بەرامبەر فەرمانێك، بەجێگەیاندنی فەرمانێك، یاخود جووڵان و کردارێك بە پێی فەرمانێك دێت. پێچەوانەی گوێڕایەڵی یاخیبوونە.

لە زۆربەی شوێنەکانی قورئانی پیرۆزدا وشەی گوێڕایەڵی بە

واتاگەلێکی وەك: ڕازیبوون لە دڵەوە بەرامبەر ئەو بڕیارانەی کە خوا و پەیامبەرەکەی داویانە و، ملکەچبوون و تەسلیم بوون هاتووە.

پێویستە لەسەر ئیماندار باوەڕێکی تەواوی هەبێت دەربارەی ڕاستیی ڕێگەی پێغەمبەرەکەی و سوننەتەکانی و دەبێت هیچ دوودڵییەك و گومانێك لە گوێڕایەڵییەکەیدا نەبێت. مادەم مرۆڤ ناچارە بە کۆمەڵ بژی بۆ ئەوەی لە بەربادی و فەساد ڕزگاری بێت، کەواتە پێویستی بە ڕاستگۆیی و گوێڕایەڵی هەیە، بە پێچەوانەوە ئاژاوە و بێ سەروبەری پەیدا دەبێت.

## پەروەردگارمان چۆن باسی گوێڕایەڵی دەکات

خوای گەورە بە هێنانی وشەی "إطاعة (گوێڕایەڵی)" لە (١٢٩) شوێنی جیاواز لە قورئانی پیرۆزدا فێری ئەوەمان دەکات کە چەندە وشەیەکی گرنگ و بەهادارە. لە بنەڕەتدا وشەی "گوێڕایەڵی" لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا بە مانای ملکەچکردن بۆ یەکێك و ڕازیبوون لە بەرامبەر فەرمانێك و قەبوڵکردنی دێت. کاتێك سەیری ئەم ئایاتانە دەکەین دەبینین باس لە دوو جۆری سەرەکی "گوێڕایەڵی" دەکرێت:

١) گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە.

٢) گوێڕایەڵیکردن بۆ کەسێکی دیکە بێجگە لە خوای گەورە.

گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە پێکهاتووە لە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکانی.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾ (النساء: ٥٩)

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخوا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، ڕەفتارکردنتان بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان"

ئەو ئایەتانەی لە قورئانی پیرۆزدا باسی گوێڕایەڵی دەکەن، گوێڕایەڵیکردنی پێغەمبەری ئازیزیان لەگەڵ گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورەدا پێکەوە باسکردووە.[1] گوێڕایەڵیکردنی پێغەمبەران گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورەیە، چونکە گوێڕایەڵی کردنی پەیامبەر گوێڕایەڵیکردنی خاوەنی پەیامەکەیە. خوای گەورەش لە سورەتی "النساء" دا دەفەرموێت:

﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴾ (النساء: ٨٠)

---

١. بڕوانە: البقرة: ٣٢، النساء: ١٣، المائدة: ٩٢، الانفال: ١ ، ٢٠ ، ٤٦...

واتە: "ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (صَلَوَاتُاللّٰهعَلَيْه) بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە، ئەوەش پشتی هەڵکردووە (ئەوە خۆی زەرەرمەند دەبێت) خۆ ئێمە تۆمان نەناردوە تا ببیتە چاودێر بەسەر ئەوانەوە"

هەروەك زانراوە پێغەمبەران بۆ ئەوە ڕەوانەکراون تا گوێڕایەڵی بکرێن. ئەم ڕاستییەش بە ڕوونی لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە کە دەفەرمووێت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴾ ( النساء: ٦٤ )

واتە: "هیچ فرستادەیەکمان نەناردووە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بەفەرمانی خوا، خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بەڕاستی کاتێك ستەمیان لە خۆیان کرد (بە لادان لە شەریعەت) بهاتنایە بۆ لای تۆ و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومان ئەو کاتە دەیانزانی کە خوا تەوبە و پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە (ئەگەر بەڕاستیان بوایە)."

سەبارەت بە گوێڕایەڵیکردن بۆ کەسێکی دیکە بێجگە لە خوای گەورە، بریتییە لەو گوێڕایەڵیکردنانەی کە پەروەدگار فەرمانی پێنەکردووە و قەدەغەی کردووە. لەم دونیایەدا تەنها مرۆڤ سەربەستیی ئەوەی پێدراوە کە گوێڕایەڵیی یاخود سەرپێچی بکات. کاتێك لە قورئانی پیرۆزدا تەماشای ئەو ئایەتانە دەکەین کە پەیوەندیدارن بە گوێڕایەڵیکردنەوە، دەبینین هەندێکجار مرۆڤ گوێڕایەڵیی چەند

دەستە و تاقمێك لە مرۆڤەكان دەكات، وەك ئەم نموونانەی لای خوارەوە:

أ) كافران و مونافیقەكان:

﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾ (الأحزاب: ٤٨)

واتە: "ملكەچ و فەرمانداری كافر و دووڕووەكان مەبە، گوێ مەدە بەو ئازارو ناخۆشییانەی (كە پێشی دەهێنن بۆ خۆت و بانگەوازەكەت)، هەمیشە پشت بەخوا ببەستە، تەنها خواش بەسە كە پشتیوان و یاریدەدەربێت."

ب) گوناهكاران و خاوەن ڕەوشتە خراپەكان:

﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴾ (القلم: ١٠ - ١٣)

واتە: "بەقسەی هەموو ئەوانە مەكە كە زۆر سوێند دەخۆن و زۆر سووك و ڕیسوان. ئەوانەی كە بەشوێن عەیب و عاردا دەگەڕێن و دووزمانی دەكەن و فیتنە دەگێڕن و حەزیان لە ئاشووبە. زۆر دژی خێرو چاكەن و دەستدرێژی دەكەن و گوناهـ ئەنجام دەدەن و پیلان دەگێڕن. لە هەمان كاتدا ئێسك تاڵ و ڕەوشت ناشرین و ناكەس بەچەو باوك نادیارن"

ج) ئەوانەی ئەو سنوورانە دەبەزێنن کە خوا دیاری کردووە:

﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ (الشعراء: ١٥١)

واتە: "گوێڕایەڵی زیادە ڕەوان مەکەن."

بەشی خوێندنەوە

## هەموو دروستکراوەکان گوێڕایەڵیی فەرمانڕەوای گەردوون دەکەن

هەروەك چۆن لە گەردووندا هەر لە خۆر و ئەستێرەکانەوە هەتا دەریا و شاخ و بەردەکان لە گوێڕایەڵیی خوای گەورەدان، بە هەمان شێوە هەموو ڕووەك و گیاندار و مرۆڤەکانیش ملکەچی فەرمانەکانی ئەون. ئەم گوێڕایەڵی کردنە هەمەکییە بوونی فەرمانڕەوایەکی خاوەن شکۆ دەسەلمێنێت.

بۆ نموونە کاتێك درەختێك فەرمانی وەستانی پێ دەدرێت بە هیچ شێوەیەك لە شوێنی خۆی ناجووڵێت. وەستانی بەرامبەر ڕەشەباکان و بەرگەگرتنی لەهەمبەر لافاوەکاندا نیشاندەری هەستیاریی درەختەکەیە لە گوێڕایەڵیدا. وشترێك بۆ ئەوەی باری لێ بنرێت چۆك دادەدات کە لە ڕاستیدا دژی بەرژەوەندی خۆیەتی، ئەمە ڕەچاوکردنی یاساکانی گوێڕایەڵی و بەندایەتی کرداری ئەو ئاژەڵە نیشان دەدات.

هەسارەیەکیش کاتێك فەرمانێکی پێچەوانەی درەختی وەرگرتووە و ئەمری "بگەڕێ"ی بۆ دەرچووە، بە تەواوەتی گوێڕایەڵیی ئەم فەرمانە دەکات و بۆ ساتێکیش ناوەستێت.

مرۆڤەکانیش بۆ ئەوەی بەردەوامبن لە ژیانی ئەم دونیایە بەوپەڕی هەستیارییەوە گوێڕایەڵیی چەندین فەرمان دەکەن. بۆ نموونە لە ناو

هەوادا دەژین، بە چاو دەبینن و بەگوێ دەبیستن و بە زوبان قسەدەکەن.

بەدیهێنەری خاوەن شکۆ هەموو ئەم گوێڕایەڵییانە تەنانەت بە نابینایانیش نیشان دەدات و دەیانناسێنێت.

## ئیبلیس لەبەر یاخیبوونەکەی بوو بە شەیتان

خواوەند حەزرەتی ئادەمی دروستکرد، لە ڕۆحی خۆی فووی بە بەردا کرد و فەرمانی بۆ فریشتەکان دەرکرد سوجدە بۆ ئەم بەدیهێنراوە ببەن[1]. ئەم فەرمانی سوجدە بردنە وەك تۆمارکردنی ناوی مرۆڤ وایە بە سیفەتی "جێنشینی". لە ڕاستیدا ئەوەی سوجدەی بۆ برا خوای گەورە خۆی بوو، چونکە بێجگە لەو سوجدە بۆ هیچ دروستکراوێك نابرێت. حەزرەتی ئادەم تەنها قیبلەیەك بوو، بەڵام هەڵبژاردنی ئەو وەك قیبلەیەك لەبەر سیفەتی "جێنشینی"یەکەی بوو. فریشتەکانیش ئەم هەڵبژاردنە ئیلاهییەیان بە ئەدەبەوە وەرگرت و ئەمەشیان بە گوێڕایەڵی کردن و سوجدەبردن نیشاندا.

بەڵێ، هەموو فریشتەکان لەو ساتەدا چووبوونە سوجدەوە. بەڵام یەکێك هەبوو گوێڕایەڵی فەرمانەکەی نەکرد. ئەو یەکێك بوو کە لووتبەرزی و خۆ بەگەورەزانین زاڵ بووبوو بەسەریدا. تێنەگەیشتبوو لەوەی کە نهێنی گەورەیی ڕاستەقینە لە سوجدەدا شاراوەتەوە. ئیبلیس پشتی هەڵکردبوو لە فەرمان و لە بازنەی گوێڕایەڵی دەرچووبوو.

---

١. الحجر: ٢٨-٢٩.

قورئانی پیرۆز لە چەندین شوێنی جیاوازدا باسی هۆکارەکانی سوجدە نەبردنی ئیبلیس دەکات.

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (البقرة: ٣٤)

واتە: "کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوجدە بەرن بۆ ئادەم (سوجدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەك) سوجدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە."

تا ئەو کاتە شەیتان هەزاران ساڵ وەك کەسێکی زاهید و خواناس دەرکەوتبوو. تەنها ڕووکاری دەرەوەی حەزرەتی ئادەمی بینی کە لە قوڕ دروستکرابوو، نەیتوانی قووڵیی ماهییەتی حەزرەتی ئادەم ببینێت. خۆ بەگەورەزانین و لوتبەرزیی بووبوو بە بەربەست لەبەردەم ئەمەدا. ڕاستترە بوترێت شەیتان یاخی بوو لە فەرمانی سوجدەبردن لەبەر ئەوەی نەیتوانی لە نهێنی وردی گوێڕایەڵی تێبگات و، نەیتوانی سەر لە مانای بەندایەتی ڕاستەقینە دەربکات و، بە هەموو هەستەکانی هەرسی بکات و، نەیتوانی پەی بە نهێنی سوجدەبردنەکە ببات.

## قورئان نموونەی تاڵووت بۆ باسی گوێڕایەڵی دەهێنێتەوە

یەکێك لەو نموونانەی کە قورئانی پیرۆز بۆ باسکردنی گوێڕایەڵی بۆ ئێمەی دەهێنێتەوە، نموونەی تاڵووت و لەشکرەکەیەتی. ئەی باشە

تاڵووت کێیە؟ بۆ ئەوەی لەمە تێبگەین پێویستە سەیری مێژووی ڕابردووی بەنی ئیسرائیل بکەین.

سەردەمی دەسەڵاتداریی پێغەمبەران لەناو بەنی ئیسرائیلدا لە دوای حەزرەتی یوشەع (عَلَيْهِ السَّلَامُ)ەوە دەستی پێکردووە و نزیکەی پێنج سەد ساڵی خایاندووە. کۆتا پادشای ئەم سەردەمەش حەزرەتی سولەیمانە. ئەم سەردەمەش نزیکەی هەزار ساڵ پێش هاتنی حەزرەتی عیسایە (عَلَيْهِ السَّلَامُ). حەزرەتی سامویێل هەم پێغەمبەر و هەم فەرمانڕەوای گەلەکەی بووە. لە هەمان سەردەمدا لە نێوان میسر و فەڵەستیندا گەلێك دەژیان بە ناوی ئەمالیکا. فەرمانڕەوای ئەم گەلە ناوی جالوت بوو. ئەم فەرمانڕەوا ستەمکارە بە لەشکرەکەیەوە هێرشی کردبووە سەر بەنی ئیسرائیل و لە وڵاتی خۆیان دەریکردبوون. بەنی ئیسرائیلییەکان لە دوای ئەم شکستە دەچنە لای پێغەمبەرەکەیان و داوای لێدەکەن کەسێکیان وەك فەرمانڕەوا و ئەفسەر بۆ هەڵبژێرێت.

پێغەمبەرەکەیان زۆر باش کەسایەتی نەتەوەکەی دەناسی. دەیزانی گەلەکەی لەکاتی نارەحەتیدا دووردەکەونەوە لە گوێڕایەڵی و پاشگەز دەبنەوە. چونکە داخوازییەکی لەم جۆرە لەوانەیە بە فەرزکردنی جەنگ کۆتایی پێبێت. ئەگەر فەرمانێکی وەها بێت و گەلەکەشی هەڵبگەڕێنەوە، ئەوا بارێکی خراپتر ڕوودەدات. لەبەر ئەم هۆکارە بە ئاشکرا بە گەلەکەی وت: "ئەی ئەگەر جەنگ لەسەرتان ببێت بە فەرز، ئێوە نەتوانن شەڕ بکەن؟"

بەنی ئیسرائیل پێغەمبەرەکەیان دڵنیاکردەوە، وتیان بێجگە لە جەنگ

هیچ چارەیەکی دیکەیان نەماوە. چونکە دەرکراون لە زێدی خۆیان و زۆربەشیان خێزان یان منداڵەکانیان لەدەست داوە.

تاکە ڕێگەیەك بۆ دەرباز بوون لەم سەرشۆڕییە، جەنگ بوو. بەڵام لە ڕاستیدا ترس و هەڵگەڕانەوە، لە کەسایەتی زۆربەیاندا ڕەگی داکوتابوو. لەبەر ئەم هۆیە حەزرەتی سولەیمان هەستی بەوە کرد کە پێویستە پێشتر ئاگاداریان بکاتەوە.

پێغەمبەر ساموێل بەپێی ئاڕاستە کردنی وەحی، "تالووت"ی وەك فەرماندە دەستنیشانکرد. بەڵام بەنی ئیسرائیل ڕەخنەیان لەم دەستنیشانکردنە گرت. ئەمە لە کاتێکدا کە لە سەرەتادا بەڵێنی گوێڕایەڵی تەواویان دابوو. مافی هەڵبژاردنیان دابوو بە پێغەمبەرەکەیان. کەچی ئێستا هەڵبژاردنی پێغەمبەرەکەیان بەدڵ نەبوو. لە کاتێکدا هەڵبژاردنی تالووت وەك فەرماندە بە فەرمانی وەحی بوو.[1] لە کۆتایدا هەرچەندە بە دڵیان نەبوو بەڵام تالووت وەك فەرماندە قەبوڵ کرا.

لە دوای ئەمە تالووت لەشکرێکی ئامادەکرد و کەوتە ڕێ. بەڵام ئەوانەی بەشدار بوون لەم لەشکرەدا هێشتا دیار نەبوو چەند دڵسۆز و گوێڕایەڵن. ئەم گەلە چەندین ساڵ بە ژێردەستەیی ژیابوون. لە باری دۆڕاودا بوون. زۆر گرنگ بوو بزانرێت کاتێك بەرامبەر گەلێکی سەرکەوتوو دەوەستنەوە چ بار و ڕەفتارێکیان دەبێت.

چونکە شەڕ دەبێت بە لەشکرێك بکرێت کە ئامادەی شەڕ و، سەربازەکانی ئازا و ورە بەرزبن.

---

١. البقرة: ٢٤٧.

چونکە ئەگەری بەرگەگرتنی لەشکرێك کە پێکهاتبێت لە ترسنۆك و هەڵگەڕاوە و کەسانی بێ ورە و لاواز لە گوێڕایەڵیدا، یەکجار کەمە. لە لایەکی دیکەوە هەڵگەڕاوە و ترسنۆکەکان دەگونجا کاریگەری خراپیان هەبێت لەسەر ئەوانەی تر و ببنە مایەی شکانی ورەی سوپاکە. لەبەر ئەمە گرنگ بوو کە ئەم لەشکرە بە تاقیکردنەوەی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی و هێزی بەرگەگرتندا بڕوات.

دوای ماوەیەك لە ڕۆشتن، لە کاتێکدا لەشکرەکەی زۆر تینوویان بوو، تاڵووت پێی وتن کە خوای گەورە تاقییان دەکاتەوە بە ئاوی ڕووبارێك، ئەوەی لێی بخواتەوە لە ئەو نییە و، ئەوەی لێی نەخواتەوە دەبێت بە سەربازی ئەو. تەنها مۆڵەتی ئەوە هەیە کە لەوێچێکی لێ بخۆنەوە، کاتێك گەیشتنە ڕووبارەکە بێجگە لە چەند کەسێکی کەم ئەوانی دیکە بە دڵی خۆیان ئاویان خواردەوە. بەم شێوەیە نەیانتوانی یەکەم ناڕەحەتی کە هاتە بەردەمیان ببڕن. لەکاتێکدا ئەمە تاقیکردنەوەیەك بوو بۆیان. بەم هەڵسوکەوتەیان لە تاقیکردنەوەکەدا شکستیان هێنا. لەم بارەیەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ ۚ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ ۚ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ (البقرة: ٢٤٩)

واتە: "ئینجا لەکاتێکدا طالوت سەربازەکانی جیاکردەوە و پێی وتن: (وا ئێمە دەڕۆین)، بێگومان خوا (لە ڕێ گوزەرماندا) تاقیتان دەکاتەوە بە ڕووبارێك (دوای ماندوو بوون و تینوویەتی)، جا ئەوەی لێی بخواتەوە (ئەوە سەربازی) من نیە و (بگەڕێتەوە) و ئەوەی ئەیچێژێت یان تەنها لەوێچێك بەدەستی خۆی بخواتەوە ئەوە بەڕاستی سەربازی منە و (دەپەڕێتەوەو دەڕۆین، جا لەگەڵ ئەو ڕوون کردنەوەیەشدا) زۆربەیان (لە ئاوی ڕووبارەکەیان) خواردەوە، کەمێکیان نەبێت، جا کاتێك لێی پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیدا (هەندێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە) دەرەقەتی جالوت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی دڵنیا بوون بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چونکە چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خواو خوا یارو یاوەری خۆگر و ئارامگرانە."

لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە ژمارەی ئەوانەی پەڕینەوە لەو ڕووبارە یەکسانە بە ژمارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) کە بەشداریی جەنگی بەدریان کردووە.[1] لە ئەنجامدا کۆمەڵێك کە بە ژمارە کەم بوون سەرکەوتن بەسەر کۆمەڵێکی دیکەدا کە بە ژمارە زۆر زیاتر بوون و توانییان لەشکرە ترسناکەکەیان بشکێنن و، سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست بهێنن و، میوەی گوێڕایەڵییەکەیان چنییەوە.

---

١. مسند، احمد بن حنبل، ٤/٢٩٠.

بەشی خوێندنەوە

## هیچ شتێک هێندەی فەرمانی پادشا گرانبەها نییە

ڕۆژێك سوڵتان مەحمود غەزنەوی دەڕواتە دیوانی خۆی و دەبینێت هەموو گەورەکانی وڵات لەوێ کۆبوونەتەوە، ویستی وەزیرەکان تاقی بکاتەوە. گەوهەرێکی دەرهێنا و دای بە وەزیرێك و، لێی پرسی:

- گەوهەرێکی چۆنە؟ بەڕای تۆ چەند دەکات؟

- ئەمە گەوهەرێکی زۆر گرانبەهایە، سەد بار ئاڵتوون دەهێنێت.

پادشا فەرمان بە وەزیرەکە دەکات و، دەڵێت:

- ئەم گەوهەرە بشکێنە!

- گەورەم! من چۆن دەتوانم ئەوە بکەم، من کەسێکم حەز بە چاکەی پادشاکەم دەکەم، گەر ئەمە بشکێنم واتای ئەوەیە خراپەم دەرهەق کردوویت.

پادشا ئەم هەڵسوکەوتەی وەزیر بەرز دەنرخێنێت و خشڵێکی گران بەهای بە دیاری پێ دەبەخشێت. پادشا پاش ماوەیەك گفتوگۆ و دوای ئەوەی ئەم باسە لەبیر کرابوو، هەمان گەوهەر دەداتە دەست پەردەدروویەك و، پێی دەڵێت:

- ئەگەر موشتەری هەبێت چەندی دەداتێ؟

- ئەم گەوهەرە بەهای بە هێندەی نیوەی وڵاتێك دەبێت.

- ئەم گەوهەرە بشکێنە و پارچە پارچەی بکە!

- گەورەم، زۆر حەیف دەبێت گەر ئەمە بشکێنرێت، خشڵێکی ئاوا گرانبەها تەنها شایەنی پادشایەکی وەك جەنابتانە، بۆیە ناکرێت ئەمە بشکێنرێت، شکاندنی ئەمە دوژمنایەتی پادشا و گەنجینەکەیەتی.

پادشا قسەکانی پەردەدرووی زۆر بە دڵ دەبێت و دیارییەکی گرانبەهای پێشکەش دەکات.

دوای ماوەیەك خشڵەکەی دەدات بە یەکێکی دیکە و، ئەویش هەمان شێواز وەڵامی دەداتەوە و، پادشا ئەویش خەڵات دەکات. بەم شێوازە چەندین کەس تاقیدەکاتەوە و، لە کۆتاییدا هەیاسی دانا بانگ دەکات و، خشڵەکەی دەداتێ و، پرسیاری نرخەکەی لێ دەکات. دوایی فەرمانی پێ دەکات کە بیشکێنێت، هەیاسیش بێ بیرکردنەوە پارچە پارچەی دەکات. کەسانی دەوروبەری سەرزەنشتیان کرد و، پێیان وت:

- ئەی هەیاس! چۆن دڵت هات خشڵێکی وەها گرانبەها بشکێنیت، ئەمە ناپاکییە بەرامبەر پادشا و گەنجینەکەی، چۆن ئەمەت کرد؟

هەیاس بەم شێوازە وەڵامی دانەوە:

- بۆ ئەوانەی بە خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە بەستراونەتەوە بە پادشاوە هیچ شتێك لە فەرمان و ویستی پادشا گرانبەهاتر نییە لەلایان.

## سەرورەرمان لە بارەی گوێڕایەڵییەوە چی دەفەرموێت؟

کاتێك سەیری فەرموودە پیرۆزەکانی دەکەین، دەبینین کە گرنگییەکی تایبەتی داوە بە بابەتی گوێڕایەڵی. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکیدا لە بارەی گرنگی و جددییەتی ئەم بابەتەوە دەفەرموێت: "کێ گوێڕایەڵی منی کردبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، کێش یاخی بووبێت لە من ئەوا بە دڵنیاییەوە یاخی بووە لە خوا، کێ گوێڕایەڵی بەرپرسی شەرعیی کردبێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە گوێڕایەڵی منی کردووە، کێش یاخی بووبێت لە بەرپرسەکەی، ئەوا بە دڵنیاییەوە یاخی دەبێت لە من"[1]

"ئوممەتەکەم هەموویان دەچنە بەهەشت بێجگە لەوانەی پشت هەڵدەکەن. هاوەڵان پرسیاریان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، کێ خۆی بە دوور دەگرێت لە چوونە بەهەشت؟" پێغەمبەری خواش (صَلَواتُ اللهِ عَلَيْهِ) دەفەرموێت: "کێ گوێڕایەڵی من بکات دەڕواتە بەهەشت. کێش یاخی بێت لە من پشت هەڵدەکات و ناچێتە بەهەشت."[2]"

لە فەرموودەیەکی دیکەدا سەرورەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەو لێپرسراوەی بەسەرتانەوەیە هەتا دەست بە کتێبی خواوە بگرێت و بە گوێرەی کتێبی خوا کارەکانی بەڕێوە ببات، ئەوا گوێڕایەڵی بکەن، ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیش بێت کە دەموچاوی وەك دانەی ترێ ڕەش بێت."[3]

---

١. البخاري، الاحكام،١، ٧٧/٩؛ مسلم، العمارة، ٣٢-٣٣؛ النسائي، البيعة، ٢٧، ١٣٨/٧؛ ابن ماجة، الجهاد، ٣٩.
٢. البخاري، الاعتصام، ١٢.
٣. البخاري، الاحكام، ٤.

چەندین فەرموودەی وەك ئەمانە لە کتێبەکانی فەرمووەدەدا لەبارەی گوێڕایەڵییەوە هەیە. بۆ ئەوەی زیاتر لەفەرمووەدەکەی سەرەوە بگەین دەمانەوێت باسی نموونەی حەزرەتی ئوسامەی کوڕی زەید بکەین.

حەزرەتی ئوسامە، کوڕی زەیدی کوڕی حاریسەیە کە بەندەیەکی ڕەش پێست بووە. پێغەمبەری سەروەرمان ئەو دەکات بە فەرماندەی ئەو لەشکرەی کە ویستی بینێرێت بۆ شام. حەزرەتی ئوسامە فەرماندەیی لەشکرێکی دەکرد کە چەندین کەسی بەناویانگ و بەتەمەنتری تێدا بوو.[1] حەزرەتی ئوسامە لەو ڕۆژانەدا تەمەنی هێشتا ١٨ ساڵان بوو.

هەندێ کەس ئەم بڕیارەیان پێ هەرس نەکرا کە سەرەڕای بوونی کەسانێکی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدە لە ناو ئەو لەشکرەدا، بەڵام کەسێکی گەنجی وەك حەزرەتی ئوسامە دەکرێت بە فەرماندە و، هەندێك ڕەخنە و بۆڵەیان لە دەم دەرچوو. گومان لە بوونی دەستی مونافیقەکان دەکرێت لەپشتی ئەم فیتنەیەوە. کاتێك ئەم حاڵەتە دەگاتەوە بە پێغەمبەرمان، سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم شێوازە ئاگاداریان دەکاتەوە: "بیستوومە ئێوە ڕەخنەتان لە دیاری کردنی ئوسامە هەبووە وەك فەرماندەی سوپاکە، کاتی خۆیشی ڕەخنەتان گرتبوو لەسەر فەرماندەیی باوکی کە زەیدە. سوێند بە خوا ئەو کەسێکی تا بڵێی لێهاتوو بوو بۆ فەرماندەیی و یەکێك بوو لە خۆشەویستترینی مرۆڤەکان بە لامەوە. ئێستاش ئەم ئوسامەیە بەم شێوازە لێهاتووە بۆ فەرماندەیی و، ئوسامە دوای باوکی یەکێکە لە

---

١. ابن هشام، السيرة، ٤٣٦/٣.

خۆشەویستترین کەسەکان بەلامەوە. ئامۆژگاریتان دەکەم گوێڕایەڵی بکەن، بە دڵنیاییەوە ئەو یەکێکە لە چاکەکارانی ناوتان.[1]

دانانی حەزرەتی ئوسامە بە فەرماندە ڕەخنەی لێ گیرا بوو. بەڵام سەروەرمان دەیویست سەرەتا لە هاوەڵەکانیدا و پاشان لە ئوممەتەکەیدا هەستی گوێڕایەڵی بچێنێت. ئەمە جگە لەوەی کە پێغەمبەری خوا کاتێك کەسێکی هەڵبسەنگاندایە، یاخود کارێکی پێ سپاردبایە سەیری لێهاتوویی دەکرد نەك تەمەن. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرەڕای بوونی چەندین هاوەڵی مەزن و بەتەمەن حەزرەتی ئوسامەی هەڵبژارد، بێ ئەوەی تەماشای تەمەن و پێگەی کۆمەڵایەتی بکات، بەرەنگاری ڕەخنەکان بوویەوە و، نیشانی دا کە کەسی شایان پێویستە کاری شایەن بە خۆی پێ بدرێت.

چەندین هاوەڵی بەڕێز لەسەرویانەوە حەزرەتی عومەر ڕێزیان لە بڕیارەکەی پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گرت و گوێڕایەڵی حەزرەتی ئوسامەیان کرد. تەنانەت جارێکیان حەزرەتی عومەر کاتێك حەزرەتی ئوسامەی بینی، پێی وت: "سەلامی خوات لەسەر بێت ئەی ئەمیری موسوڵمانان." حەزرەتی ئوسامەش وەڵامی دایەوە و وتی: "خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەی ئەمیری موسوڵمانان. تۆ وا بە من دەڵێیت!" حەزرەتی عومەریش وتی: "هەتا لە ژیاندا بم بەم شێوازە بانگت دەکەم، چونکە کاتێك حەزرەتی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) وەفاتی کرد تۆ ئەمیری من بوویت."[2]

---

١. مسلم، فضائل الصحابة، ٦٣-٦٤؛ البخاري، المغازي، ٨٧.
٢. القطاني، تراتيب، ١٣٦/١.

بەڵێ، حەزرەتی ئوسامە کوڕی بەندەیەکی ڕەش پێستی هەژار بوو. سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە هاندانی گوێڕایەڵیی ئوممەتەکەی بۆ کۆیلەیەکی هەژاری گەنج، سەرنجمان بۆ گەورەیی و گرنگی گوێڕایەڵی ڕادەکێشێت.

## پێویستە چۆن تێبگەین لە گوێڕایەڵی کردنی کەسانی لێپرسراو؟

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ ﴾
(النساء: ٥٩ )

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)"

هەروەك لە ئایەتەکەی سەرەوەدا هاتووە خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات بە گوێڕایەڵی کردنی کەسانی لێپرسراو لە خۆمان. چۆن لە دەستەواژەی "فەرمانڕەوا" تێبگەین؟ پێوانەی گوێڕایەڵی کردنمان بۆ ئەوان چی بێت؟

ئەم ئایەتە فەرمانمان پێ دەکات بەشوێنکەوتنی هەموو ئەو ڕابەر و چاوساغانەی بەو ڕێیەدا دەڕۆن کە خوای گەورە نیشانی داوە و، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە مەشخەڵەکەی ڕووناکی کردووەتەوە و، دامەزراو و سوورن لە سەر ئەو ڕێیە. سا ئەم ڕابەرانە ڕابەرایەتی سێ چوار کەس یان هەزاران وە یان ملیۆنان خەڵك بکەن!

ئایەتەکە باسی سێ جۆر گوێڕایەڵی دەکات کە پەیوەندییان بەیەکەوە

هەیە، ئەویش گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی و بەرپرسانە. گەورەیی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە نێردراوی خوایە. ئەو مرۆڤە، بەڵام هۆکارە بۆ گەیشتنمان بە خوای گەورە کە ئامانجمانە. ئێمەش دەستمان بەم هۆکارەوە گرتووە. هەر وەك ئەم ڕێیە تا پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە ژیاندا بوو ڕووناك بوو، دوای ئەویش هەر ڕووناك دەبێت. هەروەك چۆن پێغەمبەر بەناوی خواوە حوکم دەکات و بڕیار دەدات و پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت، بەهەمان شێوە ئەو کەسانەی کە پێیان دەوترێت "کەسانی بەرپرس"، سەرەتا دەبێت لەسەر ڕێگەی پێغەمبەری خوا بن و ئینجا گوێڕایەڵیی بکرێن.

ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکری ڕاستگۆ و، حەزرەتی عومەری فاروق و، حەزرەتی عوسمان و، حەزرەتی عەلی شاهی مەردان (رضيَ اللهُ عَنْهُم)، ئەمانە هێندەی سەری دەرزییەك پێچەوانەی سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەدەجووڵانەوە.

بازنەی گوێڕایەڵی زۆر فراوانە. سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "ئەگەر لە شوێنێکدا سێ کەس بوون، ئەوا یەکێکتان با ببێت بە براگەورە و لێپرسراوتان."[1] یەکێك لەو سیانە دەبێت بە براگەورە و دوانەکەی تر دەبێت گوێڕایەڵی بکەن. کاتی سەفەر کردن یەکێك لە نێوانتاندا بە لێپرسراو هەڵدەبژێردرێت. هەستان و دانیشتن و ڕۆیشتن و مانەوە و خواردن و خەوتن بە پرسی ئەو دەکرێت. بەڵێ، بازنەی گوێڕایەڵی لێرەوە دەست پێ دەکات.

---

١. ابو داود، الجهاد، ٢٢.

بەتایبەت ئەو ئیماندارانەی دڵیان وابەستەی بانگەوازێکی پیرۆز کردووە، نابێت بە هیچ شێوازێك ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە موسوڵمانێتییەوە هەیە لە خۆیانەوە بڕیاری لەسەر بدەن. پێویستە موسوڵمانان یەکتر ببینن و، پرس بە یەکتری بکەن و، ڕاوێژی لەسەر بکەن، تەنانەت گەر پێویست بوو شوراکە دەبرێتە لای کەسێکی شارەزاتر، کارەکە بە وەڵامەکەی ئەو دەبڕێتەوە و دوای ئەوە بڕیارەکە هەرچی دەربچێت، دەبێت هەمووان گوێڕایەڵی بکەن. لە ڕاستیدا شوێنکەوتووانی کاربەدەستێك گەر بە بڕیاری شورا کار بکەن، وەك گوێڕایەڵی کردنی خوا وایە.

گوێڕایەڵی تایبەتمەندییەکە پەیوەستە بە ژیانی بە کۆمەڵ. کاتێك مرۆڤەکان دەچنە ژیانی بەکۆمەڵەوە ئەوا گوێڕایەڵی لە بازنە هەرە بچووکەکانەوە هەتا بازنە هەرە گەورەکان دارای گرنگییەکی یەکجار مەزن دەبێت. ئیماندار پێویستە لە گرنگیی گوێڕایەڵی تێگەیشتبێت و بە دڵنیاییەوە دەبێت گوێڕایەڵی بکات. سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لەم بارەیەوە زۆر هەستیار بووە و هەموو شتێکی کردووە بۆ ئەوەی ئەم هەستە پەرەی پێ بدرێت.[1]

---

١. موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، پرسیارە گوماناوییەکانی سەردەم، ١٦٨/٤.

## ئاین تەنها لەلای ئەو کەسانە ڕەنگدەداتەوە و نوێنەرایەتی دەکرێت کە لە هەستی گوێڕایەڵیکردن تێگەیشتوون

پێویستە ئیماندار خۆی بە لێپرسراوی پلە یەك بزانێت لە جێکردنەوەی ڕاستییەکان لەناو دڵی مرۆڤەکاندا. چونکە لە چەندین ئایەت و فەرموودەدا فەرمان بەم بابەتە کراوە. ئەو ئاسۆیەی کە پێغەمبەرمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێی نیشانداوین، گەیاندنی ئەم ئاینە حەقەیە بە هەموو مرۆڤایەتی.

باسکردنی جوانییەکانی ئەم ئاینە بۆ هەموو مرۆڤایەتی کاری یەك کەس نیە، بەڵکو کاری کۆمەڵە. کەواتە پێویستە ئەم کۆمەڵە پیرۆزە هەندێك تایبەتمەندیی خۆیان هەبێت، یەکێکیش لە گرنگترینی ئەم تایبەتمەندییانە گوێڕایەڵییە.

بەڵێ، ئەگەر ئەرکەکەمان باسکردنی خوای گەورە بێت و ئەگەر ئەوەی ئەرکەکە دابەش دەکات و ئەوەشی ئەرکەکە وەردەگرێت تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا کار بکات، بێگومان دەبێت بە دڵخۆشییەوە گوێڕایەڵی بکات و ئەرکی سەرشانی ئەنجامبدات. جوانترین نموونە لەم ئەرکە پیرۆزەدا هاوەڵانی پێغەمبەرن (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

داخۆ هاوەڵان لەبەر چی گوێڕایەڵیی پێغەمبەرەکەیان (عَلَيْهِ صَلاَةٌ وَسَلاَمٌ) دەکرد؟ هەوڵدەدەین بە کورتی ئەمە لە دوو خاڵدا ڕوون بکەینەوە:

١) هەرچەندە پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلاَمُهُ عَلَيْهِ) وەك مرۆڤ لەوان جیاواز نەبوو بەڵام چونکە لە ڕووی ئەرکەکەیەوە نوێنەرایەتیی خوای

گەورەی دەکرد، بۆیە کاتێك ئەرکێکی بە هاوەڵەکانی دەسپارد، بەوپەڕی چێژ و جۆش و خرۆشەوە وەریاندەگرت و جێبەجێیان دەکرد.

لەبەر ئەوەی پێغەمبەرمان و خەلیفەکانی دوای ئەویش هیچ شتێکیان لەبەر خاتری نەفسی خۆیان داوا نەدەکرد، خەڵکیش باش دەیانزانی کە لەبەر خوای گەورەیە و دەشیانزانی ئەو کارانەی لەبەر خوای گەورە دەکرێن، لە ڕۆژی دواییدا پاداشتەکەی وەردەگرن، بۆیە بە تاسە و چێژەوە ئەرکەکانیان ڕادەپەڕاند.

٢) ناتوانرێت بیر لە وڵاتێکی بێ فەرمانڕەوا و پارێزگایەکی بێ پارێزگار و لەشکرێکی بێ فەرماندە بکرێتەوە. بەڵێ، بە دڵنیاییەوە لە ناو کۆمەڵێکدا کە لە پێناو چەند ئامانجێکدا کۆبوونەتەوە، دەبێت کەسێك هەبێت کە ئەرکەکان دابەش بکات. ئەمە جاری وا هەیە پێغەمبەرانن، یان جاری وا هەیە میراتگرانی پێغەمبەران ئەم کارە دەکەن. بەڵام هەر کۆمەڵەیەك (جا هەرچییەك بن) گەر بەرپرسەکەیان بە ئارەزووی خۆی بڕیار بدات و ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەش سەرکەش بن و گوێڕایەڵ نەبن، ئەوا بە هیچ جۆرێك سەرکەوتوو نابن. زۆرن ئەو لەشکرانەی کە بەهۆی سەربازە سەرکەشەکانیانەوە دۆڕاون. مادەم وایە کەواتە هەرکەس ئەوەی دەکەوێتە سەرشانی بۆ سەرکەوتنی حەق پێویستە بە تەواوەتی بیکات.

ئێستاش با هەندێك نموونە لەسەر گوێڕایەڵیی هاوەڵە بەڕێزەکان بهێنینەوە:

"حەزرەتی موصعەبی کوڕی عومەیر (رضيَ اللهُ عَنْهُ)، کوڕی یەکێك لە هەرە دەوڵەمەندەکانی مەککە بوو. تەمەنی چوارده ساڵان دەبێت کە ئاشنای پێغەمبەری خوا دەبێت. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ صَلاةٌوَسَلام) تەنها بە وتنی "بڕۆ"، فەرمان دەدات بەم هاوەڵە و دەبێتە یەکەم مامۆستای ئیسلام لە مەدینە. بەڵێ، منداڵێکی تەمەن چوارده ساڵ بەس تەنها لەبەر وەرگرتنی فەرمانی "بڕۆ"، خۆی بە تەنیا و بە پێ دەکەوێتە ڕێ بۆ مەدینە کە ٥٠٠ کم ڕێیە و لە هەمان کاتیشدا شارێکی بێ ئەمانە!"

"حەزرەتی خالیدی کوڕی وەلید (رضيَ اللهُ عَنْهُ)، کە بەیەك هێرش ئیمپراتۆرییەتی ساسانی دەڕوخێنێت و بێزەنتییەکان لە شوێنی خۆیان ڕادەگرێت. دوای سەرکەوتنی لە جەنگێکدا حەزرەتی عومەر لەسەر کارەکەی لای دەبات و، دەچێتە ژێر فەرمانی حەزرەتی ئەبو عوبەیدە کە پێشتر سەربازی خۆی بووە. بەڵێ، ئەو وتەکانی خەلیفەی پێغەمبەری خوای بە ملکەچییەکی تەواوەوە وەك فەرمانێك وەرگرت، چونکە ئەو نەفس و خۆپەرستی و شان و شۆرەتی تەرك کردبوو. بەڵێ، ئاینێك کە لە شاری مەککەوە دەستی پێکرد و بە چوارلای دنیادا بڵاوبوویەوە، تەنها ئەوانە دەتوانن نوێنەرایەتی بکەن کە لە گوێڕایەڵیی تێگەیشتوون."

لەم سەردەمەشدا ئاشقانی حەقیقەت تەنها بە فەرمانی "بڕۆ"یەك، هەر لە سیبیریاوە تا چین و، هەر لە ئوستوراڵیاوە تاکو تایلەند، بە هەموو لایەکی دنیادا بڵاوبوونەتەوە.

بەڵێ، "بڕۆ"، ئەگەر دەتەوێت خوا و پێغەمبەرەکەی باس بکەیت "بڕۆ".

لە سایەی ئەم هەستی گوێڕایەڵییەوەیە کە کەسانێك ماڵ و خانەوادە

و نیشتیمانیان جێهێشتووه و ڕۆیشتوون. ئەو کەسەی گوێڕایەڵی خوا بکات گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەشی دەکات، ئەوەش گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئەوا گوێڕایەڵی نوێنەرەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللّٰهِ عَلَيْهِ) دەکات کە بە ناوی خوای گەورەوە قسە دەکەن. خوای گەورەش هەمان ئەرکی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەدات بەو کەسانەی کە ئەم تایبەتمەندییەیان هەیە.

## ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمان نەکرێت چی ڕوودەدات؟

ئەگەر گوێڕایەڵی نەکرێت دەرئەنجامەکەی ماڵ وێرانی دەبێت، ئەمەش نموونەیەکە:

لە ڕۆژی ئوحوددا سوارەکانی لەشکری مەککە سێ جار هێرشیان هێنایە سەر موسوڵمانەکان، بەڵام هەر سێ جارەکە لەلایەن تیر هاوێژەکانەوە وەڵام درانەوە و شکان. لەڕاستیدا ئەسپەکان لە بەرامبەر تیربارانی تیرهاوێژەکاندا نەیان دەتوانی پێشڕەوی بکەن. پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پەنجا تیرهاوێژی لەسەر کێوێك جێگیر کرد و فەرمانی پێ دان کە لە هیچ حاڵ و بارێکدا ئەوێ جێ نەهێڵن و چۆڵی نەکەن. ئێستا حیکمەتی ئەو هەستیاری و سووربوونەی پێغەمبەری خوا جوانتر دەردەکەوێت.

بەڵام تێکشکانی کافرەکان و دەستکردنیان بە ڕاکردن بووبووە هۆکاری جیاوازیی بیرکردنەوە لە ناو تیرهاوێژەکاندا، هەندێکیان کاتێك ئەم ڕووداوەیان بینی بە هاوەڵەکانیان وت:

- دەی بابڕۆین بۆ غەنیمەت... غەنیمەت!

دوژمن تێکشکێنراوە و ئێوەش هیچ کارێك نییە بیکەن، ئیتر بۆچی لێرە وەستاون؟! ئەوەتا بڕوانن براکانتان سەرکەوتن و کافرەکانیش تێکشکێنراون! کەوایە ئێوەش بکەونە شوێن کافرەکان و لەگەڵ براکانتان دەست بکەن بە کۆکردنەوەی غەنیمەت!

ئەم وتانە بوونە هۆکاری یەکەم خاڵی وەرچەرخان لە ئوحوددا. وا دەردەکەوت کە لە نهێنی فەرمانەکەی پێغەمبەر بە تەواوەتی تێنەگەیشتوون. دیارە وا لێکیان داوەتەوە کە فەرمانەکە تا کۆتایی جەنگەکەیە، بەڵام لە ڕاستیدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێی فەرمووبوون کە تا فەرمان لەوەوە وەرنەگرن بە هیچ شێوەیەك شوێنەکەیان چۆڵ نەکەن.

حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر لەگەڵ هەندێك هاوەڵی تر لەم وتانە سڵەمینەوە و، وتیان: ”چەند زوو وتەکانی پێغەمبەری خواتان لەبیر چووەوە کاتێك فەرمووی ئێمە بپارێزن لەو مەترسییانەی کە لەدوواوە بۆمان دێن، تەنانەت گەر بینیتان ئێمە دەکوژرێین بە هیچ جۆرێك شوێنی خۆتان جێ مەهێڵن و مەیەن بۆ یارمەتیمان!! گەر بینیتان غەنیمەت کۆدەکەینەوە نەیەن بەشدار بن لەگەڵمان، ئێوە تەنیا ئێمە بپارێزن لەو مەترسییانەی کە لە پشتمانەوە دێن.“

بەڵام بە ڕای ئەوانەی تر نەدەبوو بەو شێوەیە لە فەرمانەکەی پێغەمبەر تێبگەن. بەڕای خۆیان چەند هۆکارێکیشیان هەبوو و، وتیان:

- پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم وتانەی مەبەستی ئەم قسانەی ئێوە نیە.

بەم شێوازە ڕاڤەیەکی جیاوازیان بۆ فەرمانەکە کرد. ئەم ڕاڤەیە وای لێکردن کە ئەوانیش بکەونە شوێن کافرەکان و دەست بکەن بە کۆکردنەوەی غەنیمەت. تا وای لێهات تەنها حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر و چەند کەسێکی تر مانەوە.

لەولاشەوە هێزێکی سوارچاکی دووسەد نەفەری بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید، کە هێشتا موسوڵمان نەبووبوو، هەستیان بەم حاڵەتە کرد و لە ڕاستیشدا لە دەرفەتێکی وا دەگەڕان، خۆیان ئامادەکرد بۆ لەناوبردنی ئەو کەسە کەمانەی کە مابوونەوە، عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهلیش یارمەتی خالیدی کوڕی وەلیدی دەدا.

گوێ پێنەدانێك کە بچووك دیارە، بووبووە هۆکاری گۆڕانکارییەکی گەورە. ئەزموونێکی ناخۆش بوو، دیارە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) لە پشت تیرهاوێژەکانەوە وانەیەکی گەورەی دەدا بەوانەی دوای خۆیان.

کەواتە ئەو فەرمانانەی کە لە سەرووی خۆمانەوە دێن بێ ئەوەی ڕاڤە و تەئویلیان بۆ بکرێت، پێویستە بە هەمان شێوازی خۆی جێبەجێ بکرێن و کەمتەرخەمی لە گوێڕایەڵیاندا نەکرێت.

# ٤. حەیا و عیففەت

حەزرەتی ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "بێ شەرمی لە هەر شتێکدا بوونی هەبێت، ئەو شتە خراپ دەکات و ناشرینی دەکات. لە بەرامبەر ئەمەشەوە هەستی شەرم کردن و حەیا لە هەر شتێکدا هەبێت، دەیڕازێنێتەوە و جوانی دەکات."[١]

## حەیا چییە؟

حەیا بە واتای سڵەمینەوە و شەرمکردن و پارێزگاریکردن لە شەرەف و نامووس دێت. حەیا بریتییە لەوەی تاك لە هەموو حاڵەتێکدا سنووری خۆی بزانێت، سەرەتا بەرامبەر بە خوا و پاشان لە ناو خەڵکیدا پێگە و پایەی خۆی بپارێزێت.

حەیا خەسڵەتێکی زۆر گرنگە و مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ. حەیا ڕازێنەرەوەی مەعنەویی مرۆڤە و جوانترین حاڵەتە کە پەروەردگار دەیەوێت لە بەندەکانیدا بیبینێت. حەیا بریتییە لە دوورکەوتنەوە

١. الترمذي، البر ٤٧.

لە هەموو ئەو خووڕەوشتە ناشرینانەی کە پەروەردگار نایەوێت لە بەندەکانیدا بیانبینێت.

پەروەردگاری مەزنمان لە قورئانی پیرۆزدا پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەموو جۆرەکانی بێ شەرمیی حەرام کردووە.[1] پێغەمبەری ئازیزیشمان (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە فەرمایشتی "هەموو ئاینێك خاوەنی ڕەوشتێکە، ڕەوشتی ئیسلامیش حەیایە"[2] جەختی لە گرنگی پێگەی ئەم هەستە لە نێو ژیانی موسوڵماناندا کردووەتەوە.

ئەم فەرموودەیەی کە لە خوارەوە ئاماژەمان پێداوە ئەم گرنگییە زیاتر ڕوون دەکاتەوە: "عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ أفضَلُ صَلَاةِ وَسَلَامِ) گەیشت بە پیاوێك ئامۆژگاری براکەی دەکرد کە زۆر شەرمن نەبێت. پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) پێی فەرموو: "وازی لێ بێنە، چونکە شەرم کردن بەشێکە لە ئیمان."[3] لە فەرموودەیەکی دیکەشدا هاتووە کە "ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە، بەرزترینیان وتنی (لا إله إلا الله)یە و، نزمترینیشیان لابردنی شتانی زیانبەخشە لەسەر ڕێگاوبانی ڕێبواران. حەیاش بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان"[4]

زاناکانمان ئەم فەرمودەیەیان بەم شێوەیە هەڵسەنگاندووە: " کەسی بە شەرم و حەیا لە گوناهەکان دووردەکەوێتەوە. بەم شێوەیە حەیا بە

---

١. الأعراف: ٣٣.

٢. الموطأ، حسن الخلق، ٢.

٣. البخاري، الايمان،١٦، ٣؛ مسلم، الايمان، ٥٩، ١٢ .

٤. مسلم، الايمان، ٥٨ .

دروستکردنی بەربەستێك لە نێوان مرۆڤ و گوناهەکاندا یەکێك لە کارە گرنگەکانی ئیمان بەجێ دەهێنێت کە بریتییە لە دوورخستنەوەی مرۆڤەکان لە تاوان. لە فەرموودەکەدا حەیا بە بەشێك لە ئیمان باس کراوە. چونکە لە ئەنجامدا ئیمان بریتییە لە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی پەروەردگار و دوورکەوتنەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردووە. بەم شێوەیە کاتێك بەهۆی حەیاوە مرۆڤەکان لە گوناهەکان بە دوور دەبن، حەیا دەبێتە بەشێك لە ئیمان.[1]

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمووی: "بە پێی پێویست شەرم لە خوای گەورە بکەن." هاوەڵان لێیان پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن دەتوانین بە پێی پێویست شەرم لە پەروەردگار بکەین؟" لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمووی: "هەرکەسێك پارێزگاری لە سەری و ئەو ئەندامانەی لە سەریدا بوونیان هەیە و، سکی و ئەو ئەندامانەی کە پەیوەندییان پێوەی هەیە بکات و، خۆی وابەستەی زرق و برقی دونیا نەکات و، مردن لە یاد نەکات، ئەوا ئەو کەسە بە پێی پێویست شەرم و حەیای لە پەروەردگار کردووە."[2]

لە فەرموودە پیرۆزەکەدا پارێزگاریکردن لە "سەر" بریتییە لەوەی مرۆڤ هەست و بیری خۆی لە خێر و چاکەدا بەکاربهێنێت. پاراستنی ئەندامەکانی نێو سەریش بریتییە لە پاراستنی دەم لە گوفتار و پارووی حەرام و، پاراستنی چاو لە قەدەغەکراوەکان. بە هەمان شێوەش پارێزگاری کردن لە سکیش بەوە دەبێت بە خۆراکی حەرام گۆش

١. إبن الأثير، النهاية في غريب الحديث، ١/٧٠.
٢. الترمذي، القيامة، ٢٣.

نەکرێت. هەروەها مەبەست لە پاراستنی ئەو ئەندامانەی کە پەیوەستن بە سکەوە بە پێی زانایانی فەرمووده، بریتییە لە دوورەپەرێز بوون لە زینا. پاراستنی هەموو ئەم ئەندامانە پێویستی سەرەکی شەرمکردنە لە خوای گەورە.

ئەو کەسەی دەیەوێت بگات بە بەختەوەری دونیا و ئاخیرەت پێویستە خاوەنی ئەدەب و حەیا بێت. چاوەڕوانیی کاری خێر لە کەسێك ناکرێت کە خاوەنی ئەدەب و حەیا نەبێت. شەرم و ئیمان تەواوکەری یەکترین، بە نەمانی هەر یەکەیان ئەوەی تریش دەڕوات و نامێنێت.

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "شەرم جگە لە خێر هیچی دیکە تووشی مرۆڤ ناکات."[1] بە دەربڕینێکی دیکەش: "هەموو جۆرەکانی شەرم چاکەن."[2] ئەمەش گرنگیی ئەم بابەتە نیشان دەدات.

## "گەر شەرم ناکەیت چیت پێ خۆشە بیکە!"

حەیا کە لە هەمان کاتدا بە واتای شەرمکردنیش دێت، پێگەیەکی زۆر گرنگی هەیە لە نێو ڕەوشتەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا. بۆ ئەوەی کەسێکی خاوەن حەیا لە کارێکی خراپ پاشگەز بکەیتەوە، تەنها وتنی "ئایا شەرم ناکەیت؟" بەسە. پێشینان وتوویانە: "ئەوەی شەرم لە مرۆڤەکان نەکات، شەرم لە خواش ناکات."

---

١. مسلم، الايمان، ١٢.
٢. مسلم، الايمان، ١٣.

ئەو کەسانەی کە هەڵگری هەستی شەرم کردنن، کەسانێکن کە نەك تەنها لەو جێگایانەی کە کەسانی دی دەیانبینن، بەڵکو لەو شوێنانەش کە کەس نایانبینێت خۆیان بە دوور دەگرن لە کاری خراپە. ئەم جۆرە کەسانە ناخیان تەندروست و ویژدانیان ئارامە. کۆمەڵە کەسانێکن کە هەموو کات باوەڕپێکراو و خاکی و دەم بە خەندەن.

یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان بە ناوی "قوررەی کوڕی عییاس" (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: "لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پێکەوە بووین، لەخزمەتیدا باسی حەیا کرا. لێیان پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا ئایا حەیا لە ئاینەوەیە؟""

پێغەمبەر (عليه أفضل صلاة وسلام) بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە: "حەیا خودی ئاینە. بێگومان حەیا، بەدووربوونە لە حەرام و، پارێزگاری کردنە لە زمان و، عیففەتە. ئەمانە دەبنە هۆی زیادکردنی چاکە و پاداشت لە ڕۆژی دواییدا و پەیوەست بوونیش بە دونیاوە کەم دەکەنەوە. بەڵام ئەو چاکە و پاداشتانەی کە لە دوارۆژدا زیادی دەکات زۆر زیاترە لەو شتانەی کە لە دونیادا کەمی دەکاتەوە."[1]

مرۆڤی بێ شەرم هەموو جۆرە خراپەیەکی لێدەوەشێتەوە. لە ڕاستیدا کەسێك کە دەماری شەرمی پسابێت، هیچ جۆرە خراپە و بێ ڕێزیەك نییە نەتوانێت بیکات. ئەمەش نموونەیەك بۆ ئێوە:

ئەبو حەنیفە ڕۆژێك دەچێت بۆ حەمام، لە کاتی خۆشتندا پیاوێك بە ڕووتی دێتە لای، ئیمام چاوەکانی دادەخات. ئەو پیاوە کەسێکی

١. رواه الداري، المقدمة، ٤٣.

بێ شەرم بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بێ باك بوو. گاڵتە بە ئیمام دەکات و پێیدەڵێت: "ئەی ئیمام! کەی نووری چاوەکانتیان لێ سەندیتەوە؟"

ئیمامی ئەعزەم بەم شێوەیە وەڵامی ئەو بێ ئابڕووەی دایەوە: "ئەو کاتەی کە پەردەی حەیای تۆ لادرا."

بەڵێ، هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێکی دوور لە ئەدەب و ڕەوشت دەکرێ لە کەسانێك چاوەڕێ بکرێت کە پەردەی شەرمیان نەماوە. ئازیزمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە فەرموودەیەکدا پێمان ڕادەگەیەنێت کە یەکێك لەو وتانەی مرۆڤەکان لە هەموو پێغەمبەرانەوە بیستوویانە ئەوەیە کە دەڵێت: "گەر شەرمت نەکرد، ئەوا چی دەکەیت بیکە!"[1]

مەبەست لەمە ئەوە نییە کە ئەگەر شەرمت نەکرد ئەوا دەتوانی چیت بوێت بیکەیت و، ناشبێت بەو شێوەیە لێك بدرێتەوە. چونکە ئەو جۆرە تێگەیشتنە یەکناگرێتەوە لەگەڵ مەبەستی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هەروەها چوارچێوە و سنووری تێگەشتنی گونجاو دەبەزێنێت. بەڵکو:

١) گەر شەرمت نەکرد چیت پێخۆشە بیکە، بەڵام لە کۆتاییدا حسابی سزاکەشی بکە. چونکە لە دەستدانی هەستی شەرمکردن مرۆڤ لە بەرپرسیارێتی دەرباز ناکات.

٢) گەر شەرمت نەکرد ئەوەی دەتەوێت بیکە، چونکە ئەوەی کە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ هەستی شەرم کردنە. بە لە دەستدانی ئەم

---

١. البخاري، كتاب الأنبياء، ١٠٠/٧؛ ابن ماجة، كتاب الزهد، ٢؛ المسند، ١٢١/٤.

هەستە، هیچ هێزێك نامێنێتەوە كە پێشت پێ بگرێت و ویژدانت بە ئاگا بێنێتەوە و پێت بڵێت ئەو كارەی دەیكەیت خراپە. پێویستە وا لێی تێبگەین كە بە نەمانی ئەو هەستە مرۆڤ دەبێت بە كەسێكی هێندە بێ شەرم كە بەبێ جیاكردنەوەی چاكە و خراپە هەموو شتێك بە ڕێگە پێدراو لە قەڵەم دەدات و، دەبێت بە بوونەوەرێكی بێهەستی وەك ئاژەڵ.

## چەند جۆر حەیا هەیە؟

هەستی حەیا دەكرێت بە دوو بەشەوە. یەكەمیان: ئەو هەستە سروشتیەیە كە لە هەموو مرۆڤێكدا هەیە یاخود پێویستە بوونی هەبێت. مرۆڤیش لە ئاكامی ئەمەوە، شەرم دەكات لە دەرخستنی ئەو بەشانەی لەشی كە حەرام كراون بۆ كەسانی دیكە. لە ئایندا بەمە دەوترێت "داپۆشینی عەورەت". وەك دەشزانن عەورەت، لە ئافرەتاندا جگە لە دەست و ڕوخسار هەموو گیانی دەگرێتەوە و، لە پیاوانیشدا عەورەت لە سكەوە بۆ ئەژنۆكان و هەرچی لە نێوانیاندایە دەگرێتەوە. دەرخستنی عەورەت بێ ڕەوشتییە. یەكەمین هەست كە لە مرۆڤدا سەر هەڵدەدات ئەمەیە. وە یەكەمین هەستێك كە لە ناخی منداڵی چوار پێنج ساڵاندا چەكەرە دەكات و دەردەكەوێت ئەم هەستەیە. پاشانیش بەها ڕەوشتییەكانی دیكە بە گوێرەی ئەم هەستە، بەرەوپێشچوون بە خۆیانەوە دەبینن.

دووەمیان: دووركەوتنەوەی مرۆڤە لە ناڕەحەتكردن و شەرمەزاركردنی كەسانی دیكە و نەبەزاندنی سنوورەكانی ڕەوشت و ئەدەبە. دەكرێت ئەم

بەشەی حەیا بکەین بە سێ بەشی دیکەوە:

١)شەرم کردن لە پەروەردگار: بچووکترین پێوەری ئەمە بریتییە لە بەجێهێنانی فەرزەکان و دوورکەوتنەوە لە حەرامەکان.

٢) شەرم کردن لە مرۆڤەکان: ئەمەش بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی کە دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی ڕەوشتەوە و ئازاری بۆ مرۆڤەکان تێدایە.

٣) شەرم کردن لە نەفسی خۆت: بریتییە لە دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە تاوان، تەنانەت لەو کاتانەدا کە بە تەنیا دەمێنێتەوە.

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بە فەرمایشتی "کەمیی حەیا بە تێپەڕبوونی کات مرۆڤ بەرەو کوفر دەبات" هەروەها بە فەرمایشتی "حەیا دەستوور و یاسای ئیمانە، هەر شتێك دەستوور و یاساکەی تێکبچێت ئەوا پارچە پارچە دەبێت و نامێنێت. ڕەوشتی ئاینیش حەیایە."[١] پێمان ڕادەگەیەنێت کە بێشەرمی دەکرێت مەترسییەکی هێندە گەورە دروست بکات مرۆڤ ڕاپێچ بکات بەرەو چەندین کەندەڵانی گەورە. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە باسی تایبەتمەندییەکانی ئیمانداران دەکات:

﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ۝٤ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ﴾

(المؤمنون: ١-٥)

١. ابن ماجة، الزهد، ١٧.

واتە: "بە ڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو و سەرفراز بوون. ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خوایە. ئەوانەش کە لە گوفتاری بێ سوودو کرداری نابەجێ و بێ هوودە دوورەپەریزن. هەروەها ئەوانەش کە زەکاتی ماڵیان دەردەکەن. ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن"

بە گوێرەی ئایەتەکە ئیماندار پێویستە خاوەنی تایبەتمەندییەکانی چەشنی "ئیمان، نوێژ، زەکات، پاکیزەیی، حەیا، ئەمانەتپارێزی، ڕاستگۆیی" بێت. چونکە ئەمانە کۆمەڵە خەسڵەتێکن بەختەوەریی دونیا و قیامەتیان پێ بەدەست دەهێنرێت.

## ئایا مرۆڤ لە شوێنی پەنهان و چۆڵدا بە ڕاستی تەنیایە؟

بە زۆریی بەرجەستە بوونی هەستی شەرم و حەیا لای مرۆڤ لەو کاتانەدایە کە بزانێت لە لایەن کەسانی دیکەوە دەبینرێت. بۆ نموونە، هەندێك لەو کردارانەی کە لە تەنیاییدا دەیکەین، ئەگەر بزانین کەسێك چاودێریمان دەکات ئەوا ئەنجامی نادەین. لە بنەڕەتدا ئەم هەستە زۆربەی کات لە ئەنجامدانی کاری خراپ و ناشرین بە دوورمان دەگرێت. بە دڵنیاییەوە ئەمەش پەیوەندییەکی ڕاستەوانەی هەیە بە ئاستی هەستی شەرم و حەیا لە مرۆڤەکاندا. هەر لەبەر ئەمەشە پێشینانمان وتوویانە: "کەسەکان بە ئەندازەی شەرم و حەیایان دووردەکەونەوە لە ئەنجامدانی گوناهی ئاشکرا و بە پێچەوانەشەوە بە ئەندازەی بێ شەرمییان گوناهی ئاشکرا ئەنجام دەدەن."

ئێستا با لێرەدا ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین: ئایا مرۆڤ لە شوێنی چۆڵ و پەنهانیدا بەڕاستی بە تەنیایە؟ بە دڵنیاییەوە تەنیا نییە! خوای گەورە بوونی هەیە، ئەو فریشتانەی لێن کە بەرپرسیارن لە تۆمارکردنی کار و کردەوەکان. واتە لە ڕاستیدا کەسێك یان کەسانێك هەن کە سات بە سات چاودێری مرۆڤ دەکەن. بۆیە مرۆڤی هەڵگری ئەم هەست و بیروبۆچوونە لە کاتی تەنیاییشدا دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە بە تەنیا نییە! ئەو کار و کردەوانەی کە شەرم دەکات لە کاتی ئامادەبوونی کەسانی دیکەدا ئەنجامی بدات، بە دڵنیایەوە زۆر زیاتر شەرم دەکات لە کردنیان لە بەردەم پەروەردگاری بیسەر و بینەر و زانا و ئاگادار بە هەموو شتێك و فریشتەکانیدا.

بۆیە ئیماندارێك بیەوێت ببێتە خاوەنی شەرم و حەیا، پێویستە بۆ ساتێکیش ئەم بیروبۆچوون و هەستەی باسمان کرد بە هیچ جۆرێك لە بیر نەکات. ئایا ئەو شتەی کە حەزرەتی عوسمان (رضي الله عنه)ی گەیاندە لوتکە لە شەرم و حەیادا هەمان ئەم هەست و هزرە نەبوو؟! بەڵێ، حەزرەتی عوسمان (رضي الله عنه) نموونەی ئەدەب و حەیایە.

"حەزرەتی ئەبوبەکر نموونەی میهرەبانی و نەرم و نیانی و، حەزرەتی عومەر نموونەی بەهێزی و عەدالەت بوو. حەزرەتی عوسمان شەرم و حەیا و، حەزرەتی عەلیش عەقڵ و حیکمەت بەرجەستە دەکات. ئەم چوار هاوەڵە بەڕێزە کەسایەتی مرۆڤ کامڵ دەکەن. ئەم چوارە وەك شووشەی چوارلای چرایەك وان کە ناوەوەی نوور و ڕووناکی تێدایە."

بێگومان یەکێك لە خەسڵەتە هەرە دیارەکانی حەزرەتی عوسمان بریتی

بوو لە ئەدەب و حەیاکەی. دەربارەی ئەم تایبەتمەندییەی حەزرەتی عوسمان، دایکی موسوڵمانان حەزرەتی عائیشە ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە.

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەماڵەوە پشووی دەدا، سەرچەفێکی دابوو بە خۆیدا، بەڵام پێیەکانی بەدەرەوە بوون. لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر تەشریفی هێنا و داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد. پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێکبدات مۆڵەتی دا بێتە ژوورەوە و بە یەکەوە دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن. دواتر حەزرەتی عومەر هات. بە هەمان شێوە بە بێ ئەوەی خۆی تێك بدات مۆڵەتی ئەویشی دا کە بێتە ژورەوە و لەگەڵ ئەویشدا گفتوگۆیان کرد. ئینجا حەزرەتی عوسمان هات و داوای مۆڵەتی کرد. ئەم جارەیان پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) یەکسەر هەستایەوە و خۆی کۆکردەوە.

منیش بۆ زانینی حیکمەتی ئەم ڕووداوە، وتم: "ئەی پێغەمبەری خوا! کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر هاتن هیچ خۆت تێك نەدا، بەڵام کاتێك حەزرەتی عوسمان هات، هەستایتەوە و جلەکانت چاك کرد. حیکمەتی ئەم هەڵسوکەوتەت چی بوو؟" پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "حەزرەتی عوسمان کەسێکی زۆر بە شەرم و حەیایە. ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە تەنانەت فریشتەکانیش شەرمی لێدەکەن؟!"

حەزرەتی عوسمان بە هۆی شەرم و حەیاکەیەوە زۆر بەخێرایی پێش هاوەڵەکانی دیکەی دایەوە و بەرزبوویەوە بۆ پلەی سێهەم. بە دڵنیاییەوە

تایبەتمەندی شەرم و حەیای حەزرەتی عوسمان پسوولەیەکی گرنگی ڕزگاربوونی دوارۆژی مرۆڤی ئەم سەردەمەیە. پێویستە ئیماندار خۆی لەو هەڵسوکەوت و حاڵەت و شوێنانە بە دووربگرێت کە دەبنە هۆی شەرمەزاربوونی لە خزمەت پەروەردگاردا. بە تایبەتی گەنجان پێویستە زۆر ئاگایان لەمە بێت و بە پاکی و بێگەردی بژین ، وە سنووری ڕێگە پێدراوەکان نەبەزێنن و بەهۆی کەف و کوڵی لاوێتییەوە کارێك نەکەن کە دواتر لێی پەشیمان ببن و شەرمی لێبکەن.

بەشی خوێندنەوە

## ئەو گەنجانەی کە سنووری ڕێگەپێدراوەکانیان بەزاندووە

بە تەلەفۆن لەگەڵ گەنجێکدا گفتوگۆم دەکرد، لە دوای وتە بەپێز و جوانەکانی، بەم شێوەیە پرسیاری دەربارەی بەزاندنی سنووری ڕێگە پێدراوەکان کرد: "لەگەڵ هاوڕێیەکمدا لە قوتابخانە دەمانەوێت نیکاحی شەرعی ئەنجام بدەین. بەڵام بە بێ ئاگاداری خێزانەکانمان، ئێوە چی دەڵێن دەربارەی ئەمە؟! پێتان باشە؟"

دیارە بە هۆی ئەوەی کە پێشتر زۆر گوێبیستی پەشیمانبوونەوەی کۆمەڵە کەسانێك بووم کە بە هۆی ئەنجامدانی کۆمەڵە کارێکی لەم جۆرە کە سنووری ڕێگەپێدراوەکانی تێدا بەزێنرابوو، وەڵامەکەم بەو شێوەیە نەبوو کە گەنجەکە چاوەڕوانی دەکرد، وەڵامەکەم کەمێك ڕەق بوو.

"من لە دژی هەموو جۆرە خۆ کوشتنێکم. کچێکی گەنج کە لە بەهاری ژیانیدایە بە بێ ئاگاداری خێزانی، پێش تەواوکردنی قوتابخانەی بە مارەکردنێکی نارەسمی، بە شاراوەیی ژیانی بخاتە مەترسییەوە، ئەگەری زۆرە کۆمەڵە دەرئەنجامێکی وەك خۆکوشتنی لێ بکەوێتەوە. ڕەنگە بۆ کوڕەکە بە هەمان ئاست نەبێت، بەڵام ئەگەری

زۆره دەرەنجام بۆ کچە بێ تاوانەکە لەو شێوەیە بێت.“

پێداگری کرد و وتی: ”ئەی ڕێگە چارەیەك نییە؟!“

منیش وتم: ”هەیە، پێویست دەکات نیکاحی ڕەسمی بکرێت کە مافەکانی هاوسەرگیری هەردوولای تێدا تۆماربکرێت. بەو شێوەیە مافەکانی خۆی دەپارێزێت و خێزانەکەی لە کێشە و گرفت بە دووردەخات. واتە بەڕەسمیکردنی کارەکە.“

وتی: ”بەڵام لە ئێستادا ناتوانین ئەو کارە ئەنجام بدەین، نە خێزانەکانمان ڕازی دەبن، نە قوتابخانەکەمان، نە تەمەنمان گونجاوە و نە باری ئابووریشمان لەبارە.“

منیش وتم: ”واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە نە خێزان و نە قوتابخانە و نە باری ئابوریتان و نە تەمەنتان گونجاون، هێشتا هەر دەوێرێت ئەم مارەکردنە شاراوەیە بکەیت. ئەبێ هۆکاری ئەوە چی بێت کە بە لە بەرچاوگرتنی ئەو هەموو لایەنە نەرێنییانە ئامادەن داهاتوتان بخەنە مەترسییەوە؟!“

وەڵامی دایەوە و وتی: ”هەر لە سەرەتاوە ڕەچاوی سنورەکانمان نەکرد، بەبێ گوێدانە هیچ شتێك، خۆمان نەگرتەوە لە یەکتر بینین و قسەکردن لەگەڵ یەکتر. وا هەست دەکەم دوای ماوەیەکیش عاشقی یەکتر بووین.“

بەڵێ، تێکشکاندنی سنورەکان و خۆ بە دوورنەگرتن لە یەکتربینین و هاتوچۆکردن لەگەڵ بێگانەدا وا دەکات لە دوو گەنج کە نەتوانن بیر لە

ئەنجامەکەی بکەنەوە. دەگەنە ئاستێك کە ئیدی تەنانەت ئەنجامدانی ئەو هەڵانەش کە بە درێژایی ژیانیان لێی پەشیمان دەبنەوە، دەگرنە بەر چاو. چونکە ئیتر سنووره پارێزەر و یارمەتیدەرەکانی مەحرەمییەتی نێوانیان تێکشکاندووە. گڕیان بەرداوەتە ئەو هەستانەی کە پێشیان پێناگیرێت. ئیتر ئەو بەرگە ساختەیەیان ئامادەکردووە بۆ ئەوەی بەهانەی پێ بهێننەوە: عاشق بوون. واتە هەستکردنی ئەوەی کە گەیشتوونەتە ئاستێك چیتر ناتوانن لە یەك جیاببنەوە.

ئەم گەنجەی کە سنوورەکانی مەحرەمییەتی شکاندووە، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ گەنجێکی ناخ پڕ لە خەفەت و توڕەیی کە بە هۆی توڕەییەکەیەوە خەریکە پەلەپیتکەی دەمانچەکەی دەستی ڕابکێشێت و کەسێك بکوژێت. بە بێ بیرکردنەوە پەلەپیتکەکە ڕادەکێشێت، نیشانەکەی دەپێکێت، ئەو هەڵەیە ئەنجام دەدات کە بە درێژایی ژیانی لێی پەشیمان دەبێتەوە و ئازاری بۆ دەچێژێت. دواتر نرکە و ناڵەی پەشیمانیی دەگاتە لوتکە. بەڵام ئەم نرکە و ناڵەیە هیچ سوودێکی نابێت. چونکە فیشەکەکە لە دەمانچەکە دەرچووە و نیشانەکەی پێکاوە. ئیدی ئێستا تەنها تەرمێك بوونی هەیە. کێ بەرپرسیارێتی ئەم تەرمە دەخاتە ئەستۆی خۆی؟!

لە وەڵامی پرسیاری گەنجەکەدا کاتێك پرسی: "لەم حاڵەتەدا هیچ ڕێگە چارەیەك نییە بۆمان؟" پێم وت: "چارە هەیە." ڕێگە چارە بریتییە لە خۆپاراستن لە چوارچێوەی سنورەکانی مەحرەمییەتدا! دوای تەواوکردنی قوتابخانەکەت بە سەرکەوتوویی، دواتر هێنانەدی

هەموو مەرجەکانی خۆشگوزەرانی لە لایەنی ماددیەوە و دواتریش هاوسەرگیری کردن و بە ئەنجام گەیاندنی مارەبڕینی ڕەسمی و هاوبەشی کردنی خێزانەکانتان لە خۆشیەکانتاندا."

ئەو گەنجە لە کۆتاییدا چی بەسەر هات نازانم، بەڵام لێرەدا ڕوودەکەمە هەموو گەنجان و، پێیان دەڵێم:

"ئەی گەنجە خۆشەویستەکان! لە دەمی خوێندنتاندا خۆتان بپارێزن. پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَسَلَامُ) لە فەرمایشتی "ئەگەر کچ و کوڕێکی نامەحرەم لە جێگایەکدا بە تەنیا مانەوە، ئەوا سێهەمیان شەیتانە."[1] بە دەربڕینێکی ناخهەژێن ڕایدەگەیەنێت کە ئەو دەرەنجامانەی لە بینینی کەسێکی نامەحرەمەوە دێنە کایەوە، چاککردنەوە و ڕاستکردنەوەیان مەحاڵە. بەڵام گەر گوێ بەمە نەدەن و خۆتان بە دوور نەگرن لە چاو پێکەوتن لەگەڵ کەسانی نامەحرەمدا، بە شێوەیەکی ناپەسەند لێشاوی ئارەزوو لێتان دەدات و لەگەڵ خۆیدا دەتانبات و هەڵەیەکتان پێ ئەنجام دەدات کە بە درێژایی ژیانتان لێی پەشیمان دەبنەوە.

بەم پێیە، لە پێناوی نەڕۆشتن بە ڕێگەیەکی هەڵەدا کە کۆتاییەکەی کەندەڵانە، هەر لە سەرەتاوە ئاگاتان لە پاراستنی خۆتان بێت لە چوارچێوەی سنوورەکانی مەحرەمییەتدا، لە پێشدا قوتابخانەکەتان تەواو بکەن، دواتریش ئامانجتان ئەوە بێت کە ئەو خۆشییە لەگەڵ خێزانەکانتاندا بەش بکەن. ئەوەی کە لێرەدا لەسەر شانتانە ئەوەیە کە خۆتان بپارێزن لەو چاوپێکەوتنانەی کە کەسی سێهەم تیایاندا

---

١. البخاري، النكاح، ١١١-١١٢.

شەیتانە. بیرتان نەچێت، میوەی سەر شاخەکان تاڵە بەڵام شیفابەخشە. لە کۆتاییدا دیسان خۆتان سوودمەند دەبن.

## عیففەت واتای چییە؟

عیففەت بریتییە لە دووربوون لە وتە و ئاکاری ناشرین و، مانەوە لە نێو بازنەی حەیا و ئەدەبدا و، بەسەربردنی ژیانێکە کە پەیوەستە بە ڕاستی و دروستی و بەها ئەخلاقییەکانەوە. لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبییە و، بە واتای خاوەن شەرەف و نامووس و ڕەوشت دێت. بە تایبەتی لە پەخشان و هەڵبەستە کۆنەکاندا بۆ کەسێك کە بە سەربەرزی و هەستیاری ژیابێت، دوور لە دزی و ساختەکاری، دوورەپەرێز لە قەدەغەکراوەکان و، دەربارەی پاراستنی نامووسی بە شێوەیەکی دەراسا هەڵسوکەوتی کردبێت، بۆ ئەم جۆرە کەسانە وشەی "عەفیف" بەکارهاتووە.

بیریارانی بواری ئەخلاقی ئیسلامی وتوویانە کە لە مرۆڤدا سێ هەستی سەرەکی بوونی هەیە: "هێزی عەقڵی؛ ئەو توانایەیە کە بە ئەندازەیەکی دیاریکراو لە ڕاستییەکان تێدەگات و قازانج و زیان لە یەکتری جیا دەکاتەوە. هێزی تووڕەیی؛ ئەو توانایەیە کە سەرچاوەی ڕق و توندی و تووڕەیی و هەڵچوونەکانە. هێزە شەهوانییەکانیش؛ سەرچاوەی ئارەزوو و حەز و چێژە جەستەییەکانە."

زیادەڕەوی لە هێزە شەهوانییەکاندا و دابڕان لە هەستی حەیا و گرنگی نەدان بە حەڵاڵ و حەرام، بە ڕادەیەك کە بگاتە ئەوەی

هەرچی تاوان و گوناهێك هەیە بکرێت، "تاوان و لە ڕێ دەرچوونە". کورترەوی و بێباك بوون و نەبوونی ئیشتیهاش لە بەرامبەر لەزەت و نیعمەتە حەڵاڵەکاندا، بەمەیان وتراوە "پووکانەوە و خەسان". دامەزراوی و ناوەندگیری لە ڕوانگەی "هێزە شەهوانییەکان"ەوە و حەزکردنی ئارەزوومەندانە لە چێژ و نیعمەتە حەڵاڵەکان و دوورکەوتنەوەی ئیرادەی ئارەزوومەندانە لە چێژە حەرامەکان پێی دەوترێت "عیففەت". لەم ڕوانگەیەوە عیففەت بە واتا گشتییەکەی بریتییە لە بەکارهێنانی ئیرادەی مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردنی حەزو ئارەزووە جەستەییەکان و، دوورکەوتنەوە لە داوێنپیسی و زینا.

قورئانی پیرۆز ئەوەمان دەخاتە بەرچاو کە ئیمانداران کۆمەڵە کەسانێکن کە خاوەن عیففەت و حەیان و پارێزەری داوێنیانن،[1] هەروەها وەك پاداشتێك بۆ ژیانی پاکیزەیی موژدەی لێخۆشبونی پەروەردگار و پاداشتێکی گەورە دەدات،[2] بۆ نیشاندانی گرنگی بابەتەکە بە جیا ئاماژە بۆ ژن و پیاوەکان دەکات و ڕوودەکاتە گشت ئیمانداران و فەرمانیان پێ دەکات کە بە (عیففەت)ەوە بژین و دووربکەونەوە لە ڕوانینی حەرام کە بە دەرگای بێ ڕەوشتی دادەنرێت.[3] جگە لەوەش هێنانەوەی نموونە بە ژیانی کەسانی وەك حەزرەتی یوسف و حەزرەتی مەریەم، ئاسۆیەکی بڵندی حەیا و عیصمەت نیشانی بڕواداران دەدات.

حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ‌السَّلَامُ) لە بەرامبەر داوای هاوسەری وەزیردا

---

١. المؤمنون: ٥-٧.
٢. الأحزاب: ٣٥
٣. النور: ٣٠-٣١

بۆ گوناهکاری فەرمووی: "ئەی پەروەردگارم! چوونە بەندیخانەم زۆر لە کردنی ئەوکارە بەلاوە باشترە کە ئەم ئافرەتانە داوام لێ دەکەن بیکەم."[1] پێی باشە چەندین ساڵ لە بەندیخانەدا بمێنێتەوە وەك لەوەی عیففەتی لەکەدار بکرێت. بەم شێوەیەش بوو بە نموونەیەکی بەرز و بڵندی حەیا بۆ گشت ئەهلی ئیمان.

لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەم واتا گشتییەی عیففەت، دەکرێت واتایەکی فراوان و گشتگیرتریش لەبەرچاو بگیرێت. بە پێی ئەو پێوانەیەی کە بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی باسی لێوە دەکات دەفەرموێت: "مەودا و چوارچێوەی حەڵاڵەکان زۆر بەرفراوانە و بەشی هەموو کەیف و ئارەزووەکان دەکات و بەسە بۆیان، هیچ پێویست بە چوونە ناو چوارچێوەی حەرامەکانەوە ناکات." عیففەت واتە ژیان لە نێو چوارچێوەی ڕێگەپێدراوەکاندا و تەماشانەکردن و دەست نەبردن و هەنگاونەنان بۆ نێو بازنەی قەدەغەکراوەکان، لەبەرئەوە مرۆڤی بە عیففەت دەبێت بزانێت کە تام و چێژەکانی نێو بازنەی حەڵاڵ بەسە بۆ چاو و گوێ و دەست و قاچ و هەموو ئەندامەکانی دیکەی. نابێت بە هیچ شێوەیەك توخنی حەرام بکەوێت و، دەبێت خۆی بپارێزێت لە هەموو ئەو شتانەی کە سەربەرزی و بڵندیی لەکەدار دەکەن.[2]

---

١. یوسف: ٣٣.
٢. موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، بارانەکانی پاش نیوەڕۆ.

بەشی خوێندەوە

## چەند وتەیەک دەربارەی حەیا و عیففەت

• نامووس هەویرێکی پیرۆزە و لە عیففەت و وەفا و ڕاستگۆیی پێك هاتووە. گەر وەکو کەرەستەی خاو لە دروستکردنی تەلارێکدا بەکار بهێنرێت، ئەوا ڕووخانی تەلارێکی لەو جۆرە نەبینراوە، یاخود زۆر دەگمەن ڕوویداوە.

• نامووس، گرنگترین تایبەتمەندی و بەرزترین لایەنی کەسە ئازا و بەجەرگەکانە. وە نزمترین و بێنرخترین سیفەتیش گرنگی نەدان و پشتگوێ خستنی نامووسە.

• پیرۆزترین و گرنگترین لایەنی ئافرەتیش ئەوەیە کە لە ڕوانگەی عیففەت و نامووسیەوە بێ پەڵە و لەکە بمێنیتەوە. ئەوانەی هەستیار نین لە پاراستنی نامووسی خۆیان و خێزانیاندا، ئاشکرایە کە بەرامبەر نامووسی نەتەوایەتی و شەرەفی میللەتەکەشیان هەستیار نابن.

• نامووس لای گشت نەتەوەکان، بە ڕادەیەك پیرۆزە کە سوێندی پێ بخۆن، وە لە نێو پایەکانی چاکەکاریدا یەکێکە لە گەوهەرە هەرە گرانبەهاکان. ئەو کەسانەی کە گرنگی بۆ نامووس دانانێن شەرەف و چاکەکارییەکانیشیان ساختە و درۆیە.

• ناموس، گەوهەرێکی بێوێنەیە و پێویست دەکات لە نێو پارێزراوترین بەرگ و سندوقەکاندا هەڵبگیرێت. بەم شێوەیەش نرخەکەی دووهێندە زیاد دەکات.

• ئەو کەسانەی کە لە بابەتی پارێزگاریکردن لە شەرەف و ناموسی کەسانی تر هاوشێوەی پارێزگاریکردن لە شەرەف و ناموسی خۆیان هەستیار نین، ناکرێت هیچ ئەمانەتێکیان پێ بسپێردرێت و لە هیچ بوارێکیشدا جێی بڕوا نین.

• هەروەك چۆن شەمشەمەکوێرەکان ڕووناکییان پێ خۆش نییە و نایانەوێت، بە هەمان شێوەش بێ ئاینەکان ئاین و، جاهیلەکان زانست و، بێ ئەدەبەکان ئەدەب و، بێ ناموسەکانیش ناموسیان ناوێت.

## ناتوانم پارێزگاری لە عیففەتەکەم بکەم!

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کە بێ ڕەوشتی تێیدا پەرەی سەندووە و عیففەت و پەردەی حەیا و حورمەت تێیدا دڕاوە، بێگومان پاراستنی عیففەت شتێکی گەلێك قورسە. دەگونجێ دەربڕینێکی لەم شێوەیە لە زاری زۆرێك لە گەنجانەوە ببیستین: "کێشەکەم ئەوەیە کە بێ ئیرادەم، ناتوانم کۆنترۆڵی خۆم بکەم، زۆر کات ناتوانم پارێزگاری لە عیففەتم بکەم، دەکەومە گوناهەکانەوە، بەڵێنی زۆرم بە خۆمدا بەڵام سەرکەوتوو نەبووم لە جێبەجێکردنیاندا."

پەروەردگاری مەزن هەندێك لە ناو و سیفەتەکانی خۆی، بە ئەندازەی دڵۆپێك لەچاو ئۆقیانوسێکدا، بەخشیوە بە بەندەکانی.

بۆ نموونە: لێبوردەیی پەروەردگار ناوازە و تاقانەیە، ئێمەش ئەم تایبەتمەندییەمان، واتە لێبوردەیی و لێخۆشبوون، بە برێکی دیاریکراو پێ بەخشراوە. هاوشێوەی ئەمەش، بە بەکارهێنانی جوزئی ئیختیاریمان، کە پارچەیەکی یەکجار بچووکە لە چاو ویست و ئیرادەی گشتی پەروەردگار، دەتوانین ژیانمان پڕ بکەین لە نوور یاخود بیکەینە تاریکستان. دەتوانین سەرکەوتوو بین یا خود بدۆڕێین.

بیر لە کۆشکێك بکەنەوە کە جوانترین کارە هونەرییەکانی دونیای تێدا بێت. هیچ شتێك نەمابێت کە تێیدا بوونی نەبێت. هەموو ئەو شتانەشی کە تێیدان تا بڵێیت جوانترین و ڕازاوەترین و بەنرخترین و مۆدێرنترینی شتەکان بن و هەمووشیان ئامادەبن بۆ بەکارهێنان. ڕێك و پێکی و ناوازەیی سیستەمی ڕووناکی و کارەبایی کۆشکەکە ناوی چاو دەبات و، ئێوەش کۆنترۆڵێکتان بەدەستەوەیە، هەر چییەك حەزتان لێیەتی و دێت بە خەیاڵتاندا، پەنجە بە دوگمەی کۆنترۆڵەکەدا بنێن دێتە بەردەمتان. کارەباکانیش بە هەمان شێوەن، بە دوگمەیەك دادەگیرسێن و بە دوگمەیەکیش دەکوژێنەوە.

ئەو کۆشکە گەورەیە ئەم دونیا مەزنەیە کە پێتان دراوە و ئێوە خاوەنین و کۆنترۆڵەکەی لە دەستی ویست و ئیرادە بچووکەکەی ئێوەدایە. گەر بڵێن "نەخێر، وانییە"، ئەوا ئینکاری ئەو نیعمەتە دەکەن کە پێتان دراوە و، تاوانبارکردنی خاوەنی کۆشکەکە دەگەیەنێت. بەڵام گەر بڵێن "ئەو کۆنترۆڵەی کە پێمان بەخشراوە نازانین بەکاری بهێنین" ئەمەیان بەڕاستی تاوانە بەرامبەر بە خۆتان و کۆشکەکەش.

ڕێبەری ئەم کۆشکە (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) دەفەرموێت: "لە یەکەم بینیندا گوناهتان ناگات، چاوەکانتان بەرامبەر گوناهەکان دابخەن یان چاوەکانتان بە لایەکی تردا وەربگێڕن" پێمان ڕادەگەیەنێت: "ئەگەر کۆنترۆڵەکە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بەکار بهێنن ئەوا هەم لەم کۆشکەدا دەحەوێنەوە، هەم وەك پاداشتێك لە لایەن خاوەنی کۆشکەکەوە کۆمەڵە تەلارێك وەردەگرن." کتێبی ڕێنیشاندەری کۆشکەکەش -کە قورئانی پیرۆزە- پاڵپشتی ئەم وتانەی دەکات.

بەڵێ، جگە لەوەش لەو کتێبەدا و لە کۆمەڵە کتێبێکی یارمەتیدەردا هاتووە کە خاوەنی کۆشکەکە لە شادەمارتان لێتانەوە نزیکترە و، لە کاتێکدا کە ئەم کۆشکانە شوێنی ئەویان تێدا نابێتەوە، کەچی "ئەو" لە دڵی ئێوەدا جێگەی دەبێتەوە. هەروەها باسی ئەوەش کراوە کە ئەگەر ئەو کۆنترۆڵە بە باشی بەکار بهێنن ئەوا "ئەو" دەبێتە ئەو چاوەی تەماشای پێدەکەن.

لەم بارەدا، لە بری وتنی "ناتوانم، لە دەستم نایەت" یاخود "بێ ئیرادەم"، پێویست دەکات بڵێین: "ئیرادەم هەیە، بەڵام هەتا ئەمڕۆ ئەو کتێبە دەستییەی کە ئاگام لە بوونی هەبووە، باش نەمخوێندووەتەوە و بە جوانی گوێم بۆ فەرمایشتەکانی ڕێبەرەکەش نەگرتووە. لە ئێستا بە دواوە بە باشی کۆنترۆڵەکەی دەستم بەکار دەهێنم و دەبمە فەرماندەی نەفسی خۆم و، ئەم کۆشکە ناوازەیەش بە شێوەیەك هەڵدەسەنگێنم کە ببێتە هۆی بەدەستهێنانی هەزارەها کۆشکی دیکەی لەم شێوەیە."

ئەو چاوانەی کە هەتا ئەمڕۆ هەموو ڕۆژێك سەدان جار بە بێئاگایی

دەمانکردنەوە و دامان دەخستن، لە ئێستا بە دواوە بە ویستی خۆمان دایان دەخەین، هەر ئەوەندە...

## سەردارمان، دەربارەی عیففەتی هاوەڵەکانی زۆر هەستیار بووە

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە بابەتی پاراستنی ئوممەتەکەی لە گوناهـ زۆر هەستیار بوو. لە سەردەمێکدا کە هەمووان وابەستەی عیففەت بوون و، لە کاتی بەجێهێنانی مەراسیمی حەج و گەڕانەوە لە عەرەفات، فەضلی کوڕی عەبباسی سواری وڵاخەکەی کردبوو، سەری ئەوی بەم لاولادا دەسوڕاند بەم شێوەیەش یارمەتی دەدا بۆ ئەوەی چاوی بە ئافرەتان نەکەوێت.

کات چەرخی بەختەوەرییە، وەرز وەرزی حەجە، ئەو زاتەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) سواری وڵاخەکە بووبوو و سەروەرمان سەریی بەلای ڕاست و چەپدا دەسوڕاند، حەزرەتی فەضل بوو، کە هیچ کەسێك گومانی لە عیففەتیدا نەبوو. لە کاتێکدا کە ڕوودانی شتێکی لەو بابەتە ئەستەمە، بەڵام پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيْهِ) بۆ ئەوەی کە هیچ جۆرە گوناهێك تێکەڵی ڕوانینی حەزرەتی فەضل نەبێت و تیرێکی ژەهراوی دڵی کون نەکات، ڕووی حەزرەتی فەضلی جارێك بەم لادا و جارێك بەو لادا وەردەگێڕا. ئەمەش هەستیاریی پێغەمبەرمان بۆ دەردەخات بەرامبەر ئەم بابەتە و دەیکاتە نموونەیەکی بەرز و نیشانی نەتەوەکەی دەدات.

بەشی خوێندنەوە

## سێ پاڵەوانەکەی عیففەت

کۆمەڵە مرۆڤانێکی ئازا و نەبەرد هەن کە توانیویانە لە لێواری کەندەڵانی گوناهدا بگەڕێنە دواوە و لە کارەساتێکی گەورە ڕزگاریان بووە. کاتێك باس لەو حەوت تاقمە دەکرێت کە لە نێو مەترسییە زۆر و سەرسوڕهێنەرەکانی حەشردا "سێبەری خوای گەورە" دەیانگرێتەوە، لە نێو ئەوانەدا ئاماژە بۆ پاڵەوانی عیففەت دەکات. چونکە لە پارێزگاری کردن لە نامووس و شەرەفیدا لە ڕادەبەدەر هەستیارە. ئەو قارەمانە لە هەمبەر ویست و ئارەزوو و شەهەوات زۆر دامەزراوە. توانیویەتی بانگهێشتی ئافرەتێکی خاوەن سەروەت و جوانی، بە هاواری "من لە پەروەردگارم دەترسم!" ڕەتبکاتەوە و بەربەستێکی وەهای تێپەڕاندووە زۆر قورسە تەنها بە هێزی ئیرادە تێپەڕێنرێت.

ئەو گەنجە خوێنگەرمەش کە بووبووە نووری چاوی حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) یەکێکە لە نوێنەرانی ئەو ئاسۆی پاڵەوانێتییە. ئەویش کاتێك خەریکبوو بکەوێتە نێو تەڵەیەکەوە و مەیلێکی کەم بکات بە لای گوناهدا، یەکسەر ئەم ئایەتەی بیر دەکەوێتەوە "بێگومان ئەوانەی لە شیرك و کاری ناشەرعی پارێز دەکەن، هەرکە وەسوەسە و خەتەرەیەکیان

لە شەیتانەوە پێدەگات، بە خێرایی رادەچڵەکێن و بیردەکەنەوە و لەسەر ڕێگەی خوا پێدادەگرن و دەبینی زووبەزوو چاویان دەکرێتەوە و لە گوناهان وەردەگەڕێن."[1] ئەم لاوە شەرم لە پەروەردگار دەکات و لە لێواری گوناهـ دەگەڕێتەوە. گەڕایەوە، بەڵام ویژدانی تەنانەت ئەو مەیلە کەمەی بۆ تاوان بە شایەنی عیففەتەکەی نەزانی و قەبوڵی نەکرد. دڵی بەرگەی ئەو جۆش و خرۆشەی نەگرت کە لە ئاکامی ترس لە پەروەردگار هاتبووە کایەوە و هەر لەوێدا کەوت و وەفاتی کرد. گەر بە لاشە لەوێدا وەفاتی کردبێت، بەڵام ئەو پاڵەوانەی کە دەکرێت پێی بوترێت "شەهیدی عیففەت"، یادەوەرییەکەی وەك نموونەیەکی جوان گەیشتۆتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا کە بە فەرموودەی ئەشکەوتەکە ناسراوە، باسی قارەمانێکی تری عیففەت دەکرێت. سێ کەس پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتێك، تاشە بەردێکی گەورە لە شاخەکە بەردەبێتەوە و بەری دەرگای ئەشکەوتەکە دەگرێت و ناتوانن بێنە دەرەوە. لەبەر ئەمە، هەریەکەیان یەکێك لە کردارەکانیان، کە وا هەست دەکەن لای پەروەردگار وەرگیراوە، دەکەن بە تکاکار لە حزووری پەروەردگاردا، تا خوای گەورە بەردەکە لەبەردەم ئەشکەوتەکە لابدات. بە دوعای هەریەکەیان تاشە بەردەکە کەم کەم لەجێی خۆی دەجوڵێت و لە کۆتاییدا ڕزگاریان دەبێت.

یەکەمینیان، هەڵسوکەوت و ڕەفتارە چاکەکانی کە بەرامبەر دایك و باوکی کردوونی دەکاتە تکاکار و داوا لە پەروەردگار دەکات. دووەمیش،

---

١. الأعراف: ٢٠١.

لە کاتێکدا کە نەڕەخسابوو کرێی کرێکارەکەی بدات، پارەکەی لە ئیش و کاردا بەکاردەهێنێت و زیادی دەکات و دواتر بێ کەموکوڕی تەسلیمی خاوەنەکەی دەکاتەوە، ئەم کردارەی دەکاتە تکاکار و بە خاتری حورمەتی ئەم کارەی لە دەرگای ڕەحمەتی خوای گەورە دوعا دەکات.

کەسی سێیەمیش دەڵێت: "خوایە! کچێکی مامم هەبوو، ئەوم لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەویست، ویستم زەفەری پێ ببەم، بەڵام ڕووی نەدامێ. لەساڵێکی قات و قڕیدا کەوتە بەردەستم، بەو مەرجەی لە بەرامبەر خۆبەدەستەوەدانیدا سەد و بیست دیناری پێبدەم، بەڵام لەو ساتەی کە خەریك بوو دەگەیشتم بەوەی ئارەزووم دەکرد، وتی: "لە خوا بترسە و دەست لە عیففەتم مەدە!" منیش لەبەر خاتری ئەو قسەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە نێو مرۆڤەکاندا خۆشەویستترین کەس بوو لەلام، وازم لێهێنا و ئەو پارەیەشی کە پێمدابوو لێم وەرنەگرتەوە. پەروەردگارا! ئەگەر ئەم کارەم تەنها لەبەر تۆ کردبێت، ئەوا لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکە!" بەم شێوەیە ئەو کەسە پارێزگاریی کردن لە عیففەتی بە کارێکی وەرگیراو دادەنێت و عەرزی پەروەردگاری دەکات.

بەڵێ، ئەو قارەمانێتییەی کە کەسە پاکیزەکانی نێو نموونەکان نواندیان بۆ هەموو کەسێك ئاسان نابێت، ئەمانە سەرکەوتنی کەم وێنەی ئیرادەی مرۆڤن. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، نەخلیسکان شتێك نییە کە هەموو کەس بتوانێت تیایدا سەرکەوتوو بێت. زۆرینە لەو زەمینە خلیسکەدا هەڵدەخلیسکێن و دەکەون. لەبەر ئەم هۆیە، پێویست دەکات پێش ئەوەی ڕووداوەکە بگاتە ئەو ئاستە پێشی پێ بگیرێت. پێویستە

به هیچ جۆرێك نەچینە ئەو جۆرە مەیدانەوە، بە هیچ جۆرێك نزیکی لێواری کەندەڵان نەبینەوە و لە کەناری دەریاکانی گوناهدا هاتوچۆ نەکەین.

## پێویستە چی بکەین بۆ مانەوەمان بە عیففەت و کۆنترۆڵکردنی نەفسمان؟!

کاتێك سەیری مێژوو دەکەین، لەو کاتانەدا کە مرۆڤایەتی دوورکەوتوونەتەوە لە ئەدەب و حەیا و کەوتوونەتە دەردی بێ عیففەتییەوە، دەبینین ڕووبەڕووی کۆمەڵە بەڵا و موسیبەتێك بوونەتەوە کە کۆتایی پێ هێناون. دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە حەیا، دورکەوتنەوەیە لە ڕەچەڵەکی خۆی.

لە قورئانی پیرۆزدا کۆمەڵە ئایەتێکی زۆر باسی لەناوچوونی ئەو کۆمەڵگایانە دەکات کە حەیایان لەدەست داوە. نەتەوەکانی "عاد و سەموود و لوط" بە هۆی بێ حەیاییەکەیانەوە لە قوڵاییەکانی مێژوودا نێژراون. عیففەت و حەیا، بە گوێڕانەگرتن بۆ حەز و ئارەزووە ناشەرعیەکانی نەفس بە دەست دێ، ئەمەش لە بنەڕەتدا ئەرکێکی ئەخلاقییە لەسەر شانمان.

باشە بۆ پاراستنی عیففەتمان و بوون بە خاوەنی حەیا پێویستە ئاگامان لەچی بێت؟

### ١) نابێت بێزاریی ببێتە هۆکاری پاکیزە نەبوون

بە شێوەیەکی گشتی بێزاریی لە ئەنجامی نا ئاسودەیی دڵ و، نەبەستنی پەیوەندیی لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و، پەیوەست نەبوون بە بەندایەتییەکان و، نەبوونی هاوڕێ و، نەخوێندنەوە و بیرنەکردنەوە و، بێکاریی و خزمەت نەکردنەوە دێتە ئاراوە. دیارە کەلێنی هاتنەژوورەوەی شەیتان لەم مرۆڤەدا ئامادەیە.

دووبارە هاتوچۆکردنەوەی کەسێك لەو جێگایەی کە تیرەکانی شەیتانی لێدەبارێت، بەتایبەت پاش ئەوەی مارانگازی شەیتان بووە، وەك ئەوە وایە لە پاش سك ئێشان بە ئاوی سوێری دەریا، دیسان لە تینوێتیدا پەنا ببرێتەوە بەر هەمان ئاو.

لەبەر ئەوە دەبێت بەبێ پێویستیی نەچینە بازاڕ. پێویستە کاتێك کە هیچ کارێك یان فەرمانبەرییەکی خزمەتکردنی ئیمان و قورئانمان نەبوو، لەو شوێنانەش دوور بکەوینەوە کە وەك لافاو گوناهی لێ هەڵدەقوڵێت.

با بیر لەوە بکەینەوە کە مافی ڕێگاکەش بدەین. هاوەڵە بەڕێزەکان (رضي الله عنهم) زۆرجار لەپێناو باسکردنی حەق و ڕاستیدا دەچوونە دەرەوە و دەڕۆیشتن بۆ بازاڕ. حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر و حەزرەتی ئەبوزەڕیش (رضي الله عنهم) ئەمەیان دەکرد. ئەوانەی بە مەبەستێکی وەهاوە دەکەونە ڕێ مافی ڕێگاکە و شەقامەکە دەدەن و لە گوناه پارێزراو دەبن.

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) ڕێگری دەکرد لەوەی

هاوەڵانی لە کەنار ڕێگاکان و شەقامەکاندا دابنیشن. کاتێکیش دەیان فەرموو: "دانیشتنەکەمان بەرژەوەندی و سوودی تێدایە." ئەویش دەیفەرموو: " کەواتە مافی ڕێگاکە بدەن." واتە: "بەرد و دڕکەکانی سەر ڕێگاکە خاوێن بکەنەوە، وەڵامی سڵاوی ڕێبواران بدەنەوە، سڵاو بکەن و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن."[1] دەبێت ئەم نیەتە پاکە لە ئارادا بێت.

با بە بێداری و ئامادەباشیی بچینە دەرەوە. پێویستە مرۆڤ چۆن بە وریاییەکی زۆرەوە بە کێڵگەیەکی مین ڕێژکراودا تێدەپەڕێت یان بە شوێنێکدا گوزەر دەکات کە دوژمنە سەرسەختەکانی خۆی لێیە، هەمان وریاییشی لە بازاڕدا هەبێت، کە تێیدا گوناهەکان لەبەردەمیدا دێن و دەچن. ئەگینا گەر خۆی تەنها لەگەڵ هەستەکانیدا بمێنێتەوە و بەبێ ئامادەکاری و بێ چەك و بە بەتاڵی و بەبێ ئامادەکردنی قەڵغان و فیشەکە مەعنەوییەکان بۆ بەرگریکردن لە بەرامبەر تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان بکەوێتە ڕێ، ئەوکات لەوانەیە ڕۆحی بە خراپە و دیمەنە گوناهەکان و هەموو جۆرە خراپەیەك دابپۆشرێت. جا ئەگەر ئەمەش چەند جارێك دووبارە ببێتەوە ئەوا هەستەکانی ناوەوەی وای لێدێت لە بەرامبەر گوناهـ و خراپەکاندا بێباك دەبێت و بێ گوێدانە حەرام لە بازاڕدا دەگەڕێت و، بێگومان شەیتانیش هەر ئەمەی دەوێت.

پێویستە پێش ئەوەی بچینە دەرەوە بە دۆخی هەڵکشانی میتافیزیکیدا تێپەڕ ببین. واتە دەبێت پێش ئەوەی بچینە بازاڕ شتانێك بخوێنینەوە یان

---

١. البخاري، المظالم، ٢٢.

شتانێك تەماشا بكەین كە دڵمان بێنێتە جۆش و گڕوتینمان بهێنێتەوە بەر و، ئەشك لە چاوانمان بهێنێت و هەستەكانمان بهێنێتە جوڵە.

پێویستە بە هەڵكشانێكی وەهاوە بچینە بازاڕ، تا بتوانین میكانیزمێكی بەرگری لەبەرامبەر گوناهەكاندا دروستبكەین.

## ٢) پێویستە واز لە گوێڕایەڵی كردنی نەفس بهێنین

ویست و هەواكانی نەفسی هەریەكەمان وەك ژەهرێك وەهان، وەك كۆمەڵە قورساییەكن كە مرۆڤ بەرەو خوار ڕادەكێشن. ڕۆح بە ڕامكردنی نەفس گەشە دەكات و بەرزدەبێتەوە. واتە هەتا نەفس بەخێو بكرێت، ڕۆح بچوك دەبێتەوە و دەچێتەوە یەك و قورس دەبێت. لە ئەنجامی ئەمەشدا لە دڵ و ناخ و هەستە مەعنەوییەكانیشدا نەشازییەك ڕوو دەدات.

لە یەكێك لە ڕوونكردنەوەكانیدا سەرداری بوونەوەران (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەفەرموێت: "شەیتان لە نێوان دەمارەكانی مرۆڤدا دێت و دەچێت. مادەم وایە ئێوە ئەو شوێنانە كەمێك تەسك بكەنەوە كە ئەو تیایدا دەگەڕێت."[١] بە برسێتی و تینویەتی و بێبەشكردنی جەستە لە ویستەكانی، فشاری بخەنە سەر. ئەگەر كەسێك هەر هات بە خەیاڵیدا بخوات و بخواتەوە هەردەم سكی لە خۆراكی هەمەجۆر پڕبكات، شتێكی نامۆنییە كەسێكی لەم شێوەیە هۆگری شەهوەت بێت و بێبەش بێت لە حەیا و پاكیزەیی.

١. البخاري، الأحكام، ٢١.

کەواتە کزکردنی سەرچاوەکانی گەورەبوون و تێربوونی نەفس کارێکی گەلێ گرنگە، بە پێچەوانەوە نەفس هەمیشە دەبێتە دەرگایەکی کراوە بەڕووی شەیتاندا. نەفسیش وەکو شەیتان هەرگیز نابێتە دۆستی مرۆڤ. زانینی ئەوەی نەفس نەیارێکی گەورەیە کە بەرەو حەرامەکان دەماندات بەر و، ئەو دوژمنەیە کە پێویستە گەورەترین تێکۆشانی بەرامبەر بکرێت و، ڕزگارکردنی خود لە چنگی ئەو و شەیتان لە یەکەمین ئەو هەنگاوانەن کە پێویستە بۆ نزیکبوونەوە لە خوای گەورە بنرێن.

لەبەر ئەوە پێویستە بتوانین بە نەفسمان بڵێین: "بووەستە." هەوڵ و کۆششی پێویست ئەنجام بدەین بۆ پەروەردەکردنی.

## ٣) پێویستە کتێب بخوێنینەوە و بەردەوام تێبفکرین

هەموو مرۆڤێك ڕۆژانە پێویستە لە ڕێگەی قووڵبوونەوەی زیاتر لەنێو تێفکرین و بیردا، وەك هەنگێك شیلەی مەعریفەت لە کتێبی بوونەوەراندا کۆبکاتەوە کە لە بەردەمماندا واڵاکراوە. هەروەها شوێن ئەو ڕێگا فراوانە بکەوێت کە پێغەمبەرانی خوا کردوویانەتەوە. لە سایەی ئەم ڕێگایەدا ئەو کەسە ژیانەوە بە ڕۆحی دەبەخشێت و هەر هەنگاوێك دەینێت دەبێتە سەرچاوەی هێز بۆی. مرۆڤێکی وەها لە ڕێگەی بوون بە سەرمەشقی پاکیزەییدا هەنگاوە دڵنیاکانی دەست پێدەکات. قورئان و سوننەت وەك ئەو دوو نەشتەرەی کە زامە مەعنەوییەکانمان تیمار دەکەن، ویژدانمان هەرگیز دەستبەرداریان نابێت، هەروەها بەرهەمی

ڕابەر و موجەددیدەکان و ڕاستییە نەمرەکانی نێو ئەم بەرهەمانەش، هەریەکەیان وەك دەرمانێکن و گومان لەوە ناکرێت کە لە کەمترین ماوەدا چارەسەری زامە مەعنەوییەکانمان دەکەن. پێویستە هەر یەکەیان وەك مەڵهەمێك هەمیشە لەژێر دەستماندا بن. جا پێویستە ئەم نوسین و بەرهەمانە بە بێ بێزاری و وەڕس بوون هەمیشە بخوێنرێنەوە.

بە مەبەستی بەخشینی زیندەگی و دامەزراویی بە دڵ و بیرمان زۆر گرنگە تابلۆکانی نێو ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان و هاوەڵە بەڕێزەکان و شوێنکەوتووە مەزنەکان و پیاوچاکان بخوێنینەوە و گوێیان لێبگرین و موتالآیان بکەین. زۆریش گرنگە بەمانە ڕەنگ و شەوق بە ژیانمان ببەخشین. مرۆڤێك کە بتوانێت خۆی بەوان بەراورد بکات و، بڵێت: ”ئەوان بەو شێوەیە بوون، ئەی من چۆنم؟“ بەم جۆرە تێبفکرێت و لێپرسینەوە لە خۆی بکات. بەڵێ، کەسێکی لەم جۆرە دەبێت بە خاوەنی هێزێکی وەها کە لە پشتەوە پاڵی پێوە دەنێت و لە پێشەوە ڕای دەکێشێت.

### ٤) دەبێت دونیای خەیاڵیشمان بخەینە ژێر چاودێرییەوە

خەیاڵ ئەو چالاکییە زیهنییەیە کە سنووری لۆژیك و هێز ناناسێت و وابەستەی کات و شوێن نییە. هەندێك جار ئەو لە ژێر کاریگەری پێنج هەستەکانماندا و لە ڕێگەی شکڵ و شێوە بەخشین بە شمەك و ڕووداوەکانەوە شێوازی وەها بەرهەم دەهێنێت کە بە تەواوی پێچەوانەی سروشتی خودی شمەکەکانە.

هەر دیمەنێك كە شەیتان دەیهاوێتە نێو خەیاڵەوە گەر مەودا و قەبارەشی بچووك بێت، لە كامێرای خەیاڵدا وەك فیلمێكی لێدێت. ئەمەش دەكرێت دواجار داوێنپیسی و ناپاكیزەیی بە دوای خۆیدا بهێنێت. جا ئەگەر ئەم دیمەنە دەست نەفسیش بكەوێت، ئەوكات دەكرێت كرداریشی لێ پەیدابببێت. جا مادەم وایە پێویستە لەسەرمان هەر جۆرە بیرۆكەیەكی وەها كە بە خەیاڵماندا بێت بە مار و دووپشكی فیكریی لەقەڵەم بدەین و هەوڵبدەین لە ڕێگەی ئەو چارەسەرانەی كە باسمان لێوە كردن نەكەوینە نێو داویانەوە و، گەر كەوتبێتیشین ڕزگارمان ببێت.

لە نێو چ فەزایەكی كاریگەر و چ گۆڕەپانێكی موگناتیسییدا بین، ئەو شێوە و وێنانەش كە لە نێو خەیاڵەكانماندا دروست دەبن زیاتر لەو جۆرە دەبن. وای دادەنێین لە سینەما یان لە بەردەم تەلەفیزیۆندا دانیشتوون و تەماشای ئەو دیمەنە نەشیاوانە دەكەن كە نەفستان حەزی لێیەتی و بانگهێشتی شەهوەتتان دەكات، ئایا دەتوانن لەو كاتەدا دیمەنی كەعبە و تەوافكەرانی چواردەوری وەربچەرخێننە نێو خەیاڵتان؟! مادام وایە ئەوكەسانەی دەیانەوێت خەیاڵی ئەو واتایانە بكەن كە تایبەتن بە خوا، پێویستە لە شوێنێك بن كە ئەو واتایانەی تێدا هەڵبقوڵێت و لەگەڵ مرۆڤانێكی وەهادا هاودەمی بكەن.

### ٥) پێویستە یادی مردن زۆر بكەین

مردن ئەو ڕاستییەیە كە چێژەكانمان لێ تاڵ دەكات، سەرداری بوونەوەران (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) داوامان لێدەكات زۆر یادی مردن

بکەینەوە.[1] گەر مرۆڤ وەك چۆن بڕوا بە ڕاستی بوونی مردن دەکات ئاواش لە هەست و نەست و ئەقڵیشیدا بینەخشێنێت و، لە نێو دونیای بیر و خەیاڵیدا جێگیری بکات و، خۆی قایل بکات بە ژیانی گۆڕ و بەردەوامی ئەو ژیانە تا قیامەت، ئیدی تێڕوانین و هەڵسوکەوتی ئەو کەسە بۆ دونیا دەگۆڕێت و جیاواز دەبێت.

یادکردنی مردن وەك بەرگرییەك وایە لە بەرامبەر ڕاهاتن و وەسوەسەی نێو دەمارەکانی مرۆڤ و ڤایرۆسی گوناه (کە شەیتان زۆر ڕازاوەی دەکات لە بەرچاومان) و میکرۆبی تری هاوشێوە، هیچ نەبێت ئەم یادە کاریگەری کەم دەکاتەوە و زیانەکانی لادەبات.

کەسێك یادی مردن بکاتەوە، بەخۆی دەڵێت: ''مادەم دەمرم و پاش مردنیش لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکرێت، کەواتە چێژە پڕ ئازارەکانی دونیا و گوناهکردن و بێ حەیایی چ واتایەکیان هەیە؟ تا بازنەی حەڵاڵ هەبێت، بۆچی پەنا بۆ حەرام ببەم؟ بۆچی هەنگاو بۆ ناپاکیزەیی بنێم؟'' لەم دیدگایەوە مردن پاشگەزکەرەوەیەکی گەورەیە و خاوەن کاریگەرییەکی بەهێزە.

یادی مردن، هەم پەشیمانکەرەوەیە و هەم هاندەریشە. بەم دوو لایەنەیەوە دەمانترسێنێت لە لێپرسینەوەی پەروەردگار و هەمیشە لارەملمان دەکات لە خزمەتی خوای گەورەدا و کاریگەرییەکی باش لەسەر دڵ و ڕەفتارەکانمان دادەنێت. بەجۆرێك لە نێو هاوسەنگی ترس و ئومێددا هەنگاوی بەرچاو بە دڵمان دەنێت و زیندەیی و شکۆمان پێ دەبەخشێت.

---

[1]. الترمذي، القيامة، ٢٦.

### ٦) نابێت تەنها بمێنینەوە، پێویستە هاوڕێیەکی باش پەیدا بکەین

مرۆڤێك پێی نەنابێتە سەر زەمینی جەماعەت، وەك گەلاٚ یاخود موویەکی ژێر پێ وەهایە. لەم لاوە فووی لێ بکرێت بۆ ئەولا و لەو لاوە فووی لێبکرێت بۆ ئەملا دەفڕێت. لەبەر ئەمەیە کە تەنانەت لەسەردەمی زێڕینی هاوەڵانیشدا بەکۆمەڵ ژیان بۆ بەهێزترین و خاوەن تواناترین مرۆڤەکانیش بە پێویست دەزانرا، لە کاتێکدا ئەمانە مرۆڤگەلێك بوون کە شان بەشانی فریشتەکان دەگوزەران.

لەبەر ئەمە بۆ ئەوەی نەکەوینە نێو ئەو بۆسە بێشومارانەی کە هێزە تاریکەکان بۆیان ناوینەتەوە و خۆڕاگربین لە بەرامبەر ئەو هێرشە بە کۆمەلاٚنەی دەیکەنە سەرمان و، بۆ خۆپاراستن لە دوژمنە مەعنەوییەکان کە نەفس و شەیتانن و، بۆ ئەوەی نەبینە نێچیری تۆفانەکانی گوناه و نەخنکێین، باشترین پەناگەمان ژیانی بەکۆمەڵە. بانگەوازیش بۆ ئەم بیروبۆچوونە یەکێکە لە گرنگترین بابەتەکانی ژیانی ئەم سەردەمەمان.

خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) مرۆڤی وەك بوونەوەرێکی کۆمەلاٚیەتی وەدی هێناوە. ئەو مرۆڤەی بە تەنها دەژی لەبەرامبەر ئەو هێرشانەی کە گومڕایی لە چوار قوڵەوە دەیکات، بێ هێز و بێ پشتیوانە و لەوانەشە بێبەش بێت لە قازانج و سوودەکانی ژیانی بەکۆمەڵ، وەك گیرابوونی دوعا. سەرەڕای ئەمەش دەکرێت ببێتە ئامانجی تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان.

ئەو مرۆڤەی بە تەنها دەژی، زوویێت یان درەنگ ئەگەری زۆرە

بکەوێتە نێو تەڵەی شەیتانەوە، شەیتان دەرلینگی بگرێت و ببێتە نێچیری پەنجەی سووری ئەو. هەر خەیاڵ و بیرێکی خراپ کە شەیتان هەڵیدەداتە نێو زیهنەکانەوە، وەك تۆوێك وەهایە کە لە خاکی تەنهایی و بێتاقەتیدا باڵا دەکات و گەورە دەبێت. لە مرۆڤی تەنهادا کە تۆوەکانی گوناهـ ئەقڵ و دڵ و ڕۆحیان پڕکردووە، ئەم تۆوانە زوو یان درەنگ لق و پۆپ دەردەکەن و ئیدی میوەی گوناهـ دەگرن.

پێویستە مرۆڤ وەك چۆن لە مار و ئەژدیها هەڵدێت، ئاوەهاش لە تەنیایی هەڵبێت. چونکە تەنهایی ڕێگە بۆ ئەوە دەکاتەوە بیرە ئەژدیها ئاساکان باوەش بە ڕۆحی مرۆڤدا بکەن. ڕەنگە گەر دوو کەسیش بن هەمان ئەم مەترسییانە لە ئارادا بن. چونکە ئەگەری ڕێکەوتنی ئەو دوو کەسە لەسەر خراپەیەك یان گوناهێك گەر کەمیش بێت، هەر هەیە. بەڵام گەر سێ کەس یان زیاترین (بەگوێرەی یاسای ئەگەرەکان)، پێکەوە ڕێککەوتنیان لەسەر خراپە و گوناهەکان گەلێك سەختە.

## ٧) دەبێت هەفتانە بە ڕێکوپێکی ڕۆژێکمان هەبێت بۆ وەرگرتنی خۆراکی مەعنەوی

دەربڕینێك هەیە بە ناوی "کارکردن بەو زانستەی پێتە". بێگومان بیستوتانە، ئەم دەربڕینە بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنین کە زانستەکەیان دەبەنە نێو ژیانەوە و دەبنە نموونە بۆ چواردەورەکەیان. گوێگرتن لە ئامۆژگارییەکانی ئەم جۆرە مرۆڤانە یەکێکە لە چارەسەرە پارێزەر و ژیان بەخشەکان بەرامبەر پەرتبوونی ئولفەتمان و نەرم بوونی دڵمان و

بەرەنگاربوونەوەی وەسوەسەکانی شەیتان و زۆری هێزی گوناهەکان.

مرۆڤ هەر وەك دارای ئەقڵ و مەنتیق و بڕیاردانە، بەجۆشی دڵی و لەرەی ویژدانی و ئەشکی چاویشیەوە چەپکەیەکە لە ڕۆح و دڵ و هەست. بەم پێیە ئەو ئاتاجی ئەوەیە لە نێو دونیای ناوەوەیدا قووڵ ببێتەوە و ژیانی ڕۆحی دەوڵەمەند بکات و تێفکرینیشی فراوان بکات.

مرۆڤ وەك چۆن ئاتاجی توانەوەی ئەو شاخە بەستەڵەکانەیە کە تا دێت لە ناخیدا دروست دەبن، بەهەمان شێوە هەست بە ئارەزوو و ویستێکی بەتین دەکات بۆ ئەو کانیاوانەی شیری مەعنەوییان لێ هەڵدەقوڵێت، تاکو لە برسێتی مەعنەوی ڕزگاری ببێت.

قورئانی پیرۆز زۆرجار بەسەردارمان دەفەرموێت: "باسی بکە." ئەو خۆرەی هەردوو جیهانیش دەفەرموێت: "ئاین ئامۆژگارییە."[١]

کەواتە گوێگرتن لەو کەسانەی کە دڵی دێننە جۆش و، پیسیی و ژەنگی هەستەکانی خاوێن دەکەنەوە و تاسەمەندیی ئەو بەرەو جیهانە ئەبەدییەکان دەورووژێنن و لە بابەتە ئاینی و زانستییەکاندا جیهانی فیکریی فراوان دەکەن، بەڵێ، گوێگرتن لە کەسانی لەم چەشنە وەك نان و هەوا پێویستە.

لەبەر ئەوە نابێت مرۆڤ بڵێت: "من ئەمە دەزانم، ئیدی بۆ دیسان گوێی بۆ ڕابگرمەوە؟" چۆن خواردن و خواردنەوە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە و، نەك بێزاربوون بەڵکو بەردەوام پێویستیشمان پێیانە، بەو

---

١. مسلم، الایمان، ٩٥.

جۆرەش پێویستە لانی کەم هەفتانە جارێك گوێ لە ئامۆژگاری و وتار بگیرێت کە بە خۆراکی دڵ و ڕۆح دەژمێررێن و پارێزگاریمان لە شەڕی شەیتان و گوناهەکان لێدەکەن.

## ٨) نابێت بە بەتاڵی بمێنینەوە، دەبێت ئەرک وەربگرین

ئەو مرۆڤەی سەرقاڵ نییە، ژیانێك دەژی کە کراوەبێت بۆ ناپاکیزەیی و بێ حەیایی و بەم جۆرە دەرفەت بە شەیتان دەدات. بۆیە نابێت بە بەتاڵی بوەستین و پێویستە هەمیشە بەدوای ئەو سەرقاڵیانەوە بین کە هەڵکشان و جۆش و تازەییمان پێ دەبەخشن.

شەیتان زیاتر هێرش دەکاتە سەر مرۆڤە تەمبەڵەکان، هێرش دەکاتە سەر ئەو مرۆڤانەی کە بێهەستانە لە نێو تەمبەڵیدا دانیشتوون. ئەو دەبێت بە تووشی ئەو کەسانەوە کە هیچ کارێك ناکەن و کاتەکانیان بە ڕاوە مێش و سووڕانەوەی دەست بەتاڵی و گفتوگۆی پڕوپوچی چەند کاژێری نێو شوێنە پڕ دووکەڵەکان بەسەر دەبەن.

هەروەها ئەو خەریك دەبێت بەو کەسانەوە کە لەپێناوی ئاین و ئیمان و نەتەوەدا هیچ ناکەن و لە بەرامبەر خزمەتکردنی ئاین و ئیماندا داخراوانە دەژین و لە خشتەیان دەبات. بۆیە هەریەك لەمانە نێچیرێکن شەیتان بەدوایاندا دەگەڕێت.

لەبەرئەوەی شەیتان زیاتر سوود لە بێ هەستی و تەمبەڵی و بەتاڵیمان وەردەگرێت، ئەو کاتەی ئێمە بەتاڵ دەبین بیر و خەیاڵی نەگونجاو

هەڵدەداتە ناخمانەوە، چونکە خەیاڵمان سەرقاڵی شتە پێویستەکان نییە، شەیتان بەو شتانە سەرقاڵی دەکات کە خۆی دەیەوێت. وادەکات بیر لە گوناھ بکەینەوە و زۆرمان لێدەکات بۆ گوناھ کردن. مادام وایە دەبێت ئێمە ھەمیشە بە سەرقاڵی و کردار و ئارەق دەردان و خزمەت کردن ئەو شوێنانە پڕبکەینەوە کە دەکرێت شەیتان پەنجەی تێبکات. تاکو ئەو شتانەی لە ئێمەدا دەستنەکەوێت کە ئومێدیان دەکات.

## ٩) دەبێت دووربین لەو شوێن و کەشانەی کە ھەستە شەھوانییەکان دەوروژێنن

بۆئەوەی نەکەوینە نێو ناپاکیزەییەوە پێویستە دووریکەوینەوە لە کەشە ورووژێنەرەکان و میدیاکانی ھاندەری بەدڕەوشتی و خەیاڵ و ڕوانین و گفتوگۆی نابەجێ.

چەندەھا کەش و شوێنی تری لەم جۆرە ھەن کە دەکرێت بیانژمێرین. خوای گەورە ئیرادەی پێ بەخشیوین، پێویستە لەسەرمان کە ئەم ئیرادەیە لە ڕاستەڕێی خێردا بەکاربھێنین و چەندەھا میل دوور بین لەو کەش و جێگایانەی بانگھێشتی گوناھمان دەکەن.

## ١٠) دەبێت تا دەتوانین نزا بکەین

دوعا بەندایەتییەکە و پوختەی بەندایەتیشە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾ (غافر: ٦٠) "دوعا بکەن، با

قەبوڵی بکەم." بەم وتەیەی هانی دوعاکردنمان دەدات و هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴾ (الفرقان: ٧٧)واتە: "پێیان بڵێ گەر دوعاکانتان نەبێت ئیدی چ گرنگییەکتان هەیە؟!" بەم فەرمایشتەی پێمان ڕادەگەیەنێت کە دوعا چەندە گرنگە بۆمان.

دەتوانین بڵێین لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا هاوسەنگی نێوان زۆری گوناهەکان و ئەو هێزی بەرگرییەی هەمانە بە ئەندازەی نەبوون کز و لاوازە. کاریگەرترین چەکمان بەرامبەر هاوسەنگییەکی وەها، تەنها دوعایە. وەك لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە، گەر ئێمە هەردەم خوامان لەیادبێت خواش ئێمەی لە یاد دەبێت. هەروەها حەزرەتی ئیبراهیم ئاسا لە ساتی کۆتا هاتن و وەستانی سەرجەم هۆکارەکاندا دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ دەکات و تەنانەت ئاگریشمان بۆ دەکاتە ساردی و سەلامەتی.

با بە هۆنراوەی (ئەی گەنج)ی مامۆستا محمد فەتحوڵڵا گولەن بابەتەکەمان کۆتایی پێبێنین.

# ئەی گەنج

ئەی گەنج تێفکره! لە ئەزیەتباریی ئەم دەمە
دەردی بێ دەرمان لە دەوری کۆمەڵ چۆن جەمە!

بڕوانە هەر لایەك مەلوولی عیللەتێکە
مێشك لەرزۆك، دڵ بێ نەوا، بێ دەرمانە چ دەردێکە!!

گشت لایەك لێوانلێوە لە هەراوهۆریای بێ غایە
دەست بڕ و بەدی بەدکار، دەستبڕاو و بێ مایە!

تابلۆیەکە تێهەڵکێشە لە تراژیدی و کۆمیدی
دەڕمن ڕمینی کوێر، ڕۆشنایی ناکەن بەدی

داخۆ دەژی لەم فەزایەدا کۆمەڵ؟ هەیهات!
چاو لێڵ، گوێ کەڕ، هەموو تاریکە و زوڵومات

شاران بەرباد، کۆڵانەکان بوون بە ڕاڕەوی بێداد
گەنجان فریودراوی بێ سنوور، هەمووی لە پای ئازادی

حەیا دڕاو و تکا، عیففەت وا لە ژێر پادا
درۆ ئاڵتونی پوختە، خیانەت لە تەختی شادا

کرمەڕێژە قەدی دار و گەڵاڕێژانە وەرزی سەر
گەل بێ حەواس و شەکەت، ڕۆحی میللەت دەربەدەر

ئەی گەنج؛ تەمرەوێنی ئەم کەشە تاریکە تۆی
ساڵەهایە لە خەیاڵدا کەسی چاوەڕوانکراو تۆی

وەرەوە هۆش، خێرابە، وا هەڵدێ ئاسۆی دەم کەل
ڕابە تا لە تاریك و تەنگ، پرشنگی بۆ بکەیتە ئەجەل

بگرە دەست ئاوپرژێنی ئاگر کوژێن بێ وەستان بە چوارلادا
کاری تۆیە خامۆشیکەی پشکۆ لە ئاگردانەدا

با چی زوڵوماتە خەلاس بێ و وەدیارکەوێ ڕێگەی ڕاست
بۆ ئەم ڕێگە پڕ شەپۆلە وەرە و ببە فریادڕەس!

تۆی قارەمانی چاوەڕوانکراوی چەن سەدە
وەرە! لەمێژە چۆکمان بێ دەوایە پردەردە.

## ٥. هەستیاری لە حەرام و حەڵاڵدا

نوعمانی کوڕی بەشیر (رضي الله عنه) فەرموویەتی: "گوێم لێ بوو پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: "حەڵاڵ دیارە و حەرامیش دیارە، بەڵام لە نێوان ئەم دووانەدا شتانێکی گوماناویی وا هەن کە لە هەردووکیان دەچن و زۆر کەس نایانناسێت و جیایان ناکاتەوە. ئەو مرۆڤەی لەم شتە گوماناوییانە خۆی بە دوور دەگرێت، بەم کارەی ئاین و شەرەفی خۆی دەپارێزێت، ئەو کەسەش کە لە ناوەندە گوماناوییەکاندا دەگەڕێت وەك شوانێك وایە لە قەراخی کێڵگەیەکی پەرژینکراودا ئاژەڵەکانی دەلەوەڕێنێت. وەك چۆن هەموو کات ئەگەری ئەوە هەیە مەڕەکانی شوانەکە بچنە نێو کێڵگە پەرژینکراوەکەوە، ئەویش هەمیشە لە بەردەم ئەگەری ئەوەدایە بکەوێتە نێو حەرامەوە. بزانن کە هەموو پادشایەك کێڵگەیەکی پەرژینکراوی هەیە، پەرژینکراوی خوای گەورەش حەرامەکانە. بزانن کە لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو تەندروست بێت جەستەش تەندروست دەبێت و ئەو تێك بچێت جەستەش بەرەو تێکچوون دەڕوات، ئەویش (دڵ)ە ."[1]

١. البخاري، الأيمان، ٣٩.

## حەڵاڵ و حەرام چییە؟

حەڵاڵ ئاماژەیە بۆ ئەوەی لە ئایندا ڕێگەی پێدراوە و، حەرامیش قەدەغەکراوەکان دەگرێتەوە. بە شێوەیەکی گشتیی ئەو شتانەی کە حوکمێکیان لە بارەوە نەهاتووە حەڵاڵن. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ (البقرة: ٢٩)

واتە: "ئەوە خوای گەورەیە کە هەموو ئەو شتانەی بۆ خولقاندوون کە لەسەر زەویدا هەن."

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ (لقمان: ٢٠)

واتە: "ئایا نابینن کە خوای گەورە ئەوانەی سەر زەوی و ئەوانەی ئاسمانی خستۆتە ژێر فەرمانتانەوە و نیعمەتە ئاشکراو شاراوەکانی پێ بەخشیون؟" لە ئایەتە پیرۆزەکاندا دیارە کە خوای گەورە نیعمەتێکی زۆری بۆ مرۆڤ دروستکردووە. هەموو ئەو شتانەی کە خواردن و خواردنەوە و بەکارهێنانیان بە ئایەت یان فەرموودەکان قەدەغە نەکرابێت حەڵاڵە، هەموو شتێکی قەدەغەکراویش حەرامە.

ئێمە لەم بەشەدا ئەو حەرام و حەڵاڵانە دەخەینە ڕوو کە لە بوارەکانی خواردن و خواردنەوە و پۆشاک و پێداویستیی ماڵ و کار و پیشە و مامەڵە و خێزان و ژیانی کۆمەڵایەتیدا بوونیان هەیە.ئەوانەیان کە زیاتر پەیوەندییان بە لاوانەوە هەیە لە شێوەی چەند خاڵێکدا باس دەکەین و هەڵیان دەسەنگێنین.

### ١) حەرام و حەڵاڵ لە خواردن و خواردنەوەکاندا

جگە لەو بڕە کەمەی کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە، سەرجەم خواردن و خواردنەوەکان بە لەبەرچاوگرتنی چەند مەرجێك حەڵاڵن،[١] لە لایەکی دیکەوە ئاماژە کراوە بۆ ئەوەی کە کەس مافی ئەوەی نییە ئەوە حەڵاڵ بکات کە خوا حەرامی کردووە یان ئەوە حەرام بکات کە خوا حەڵاڵی کردووە.[٢] یەکێك لەو شتانەی کە قورئانی پیرۆز هەڵوێستەی لەسەر کردووە ئەوەیە کە پێویستە خۆراك حەڵاڵ و خاوێن بێت.[٣] هەروەها تەنانەت لە خواردن و خواردنەوە حەڵاڵەکاندا قورئانی پیرۆز ئیسراف و زیادەڕەویی قەدەغە کردووە.[٤]

ئامانجی سەرەکی قەدەغەکراوەکانی بواری خواردن و خواردنەوە، پاراستنی تەندروستیی جەستە و ڕۆحی مرۆڤە. ئەو ماددانەی کە زیانیان بۆ جەستە و ڕۆحی مرۆڤ چەسپاوە، لەڕووی ئاینیشەوە بەحەرام دادەنرێن. ئەو ماددانەش کە تایبەتمەندیی بێهۆش کردنیان هەیە دیسان خواردن و خواردنەوەیان دەچێتە نێو قەدەغەکراوەکانی ئیسلامەوە.

لە ئاینماندا هەموو جۆرەکانی شەراب کە سەرخۆشی ببەخشێت و هاوسەنگی ئەقڵی و ڕۆحی بشێوێنێت و، کۆئەندامی دەمار بێهۆش بکات، حەرام کراوە.[٥] سەرداریشمان دەربارەی ئەم بابەتە فەرموویەتی:

---

١. الأنعام: ١١٩، الأعراف: ٣٢.

٢. المائدة: ٨٧، الأنعام: ١٤٠، التحريم: ١، التوبة: ٣٧.

٣. البقرة: ١٦٨، المائدة: ٨٨، الأنفال:٦٩، النحل: ١١٤.

٤. الأنعام، ١٤١؛ الأعراف،٣١.

٥. البقرة: ٢١٩؛ النساء: ٤٣.

"هەموو شتێکی سەرخۆشکەر"شەرابە"، هەموو شەرابێکیش حەرامە"[1]،
"ئەو شتەی بڕە زۆرەکەی هۆشبەربێت کەمەکەشی هەر حەرامە."[2]

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرموودانەدا سەرجەم مەزهەبەکان هەموو جۆرەکانی ئەو خواردنەوانەی کە تایبەتمەندیی سەرخۆشکردنیان هەیە بە حەرام هەژمار دەکەن، چونکە مادده هۆشبەرەکان بە تێپەڕبوونی کات ئالوودەبوون دروست دەکەن.

پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "لەعنەت کراوە لە بەرهەمهێنەری شەراب و ئەوەی دەیخواتەوە و ئەوەی دەیگوازێتەوە و دابەشی دەکات و ئەوەی دەیفرۆشێت و ئەوەی وەك سەرچاوەی دارایی بەکاری دەهێنێت و ئەوەی دەیکڕێت و ئەوەی پێشکەشی دەکات و ئەوەش کە پارەکەی دەخوات. وەك دەبینین ئەم جۆرە کەسانە بەتوندترین شێوە نەفرەتیان لێ کراوە".[3] زۆربەی زانایانی ئیسلامیش لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا بەپێی ئەو دەستوورەی کە نابێت هاوکاریی ئەو کەسە بکرێت کە گوناهەکە دەکات،[4] فرۆشتنی ترێ بەو کەسەی کە شەراب بەرهەم دەهێنێت و هاوکاری کردنی بەرهەم هێنان و سەرف کردنی مەشروبیان قەدەغە کردووە.

---

١. بخاري، الأدب، ٨٠؛ مسلم، اشربة، ٧٣.
٢. ترمزي، اشربة، ٣؛ ابو داود، اشربة، ٥.
٣. ابو داود، اشربة، ٢؛ ترمزي، بيوع، ٥٨؛ ابن ماجة، اشربة، ٦.
٤ . المائدة: ٢.

## ئایا جگەرەکێشان حەرامە؟

بەربڵاوترینی ئالوودەییەکان و ئەوەش کە زۆرترین قسەی لە بارەوە دەکرێت، ئالودەبوونە بە جگەرە.

ئەمرۆ چیتر ئەستەمە لە ڕوانگەی زانستی پزیشکییەوە بوترێت کە جگەرە بێ زیانە، بێ گومانیش ناکرێ بازنەیت قەدەغەکراوەکان لەئایندا نەیگرێتەوە. زانایان باس لە نیکۆتینی نێو جگەرە و دووکەڵەکەی دەکەن کە هۆ و ڕێخۆشکەرە بۆ زنجیرە زیانێك، هەر لە شێرپەنجەوە تا دەگاتە تێکچوونی کۆئەندامی دەمار. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾ (البقرة: ١٩٥) واتە: "بە دەستی خۆتان، خۆتان فڕێ مەدەنە نێو مەترسییەوە". پێغەمبەریشمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "مرۆڤ نە بۆی هەیە ڕاستەوخۆ زیان بگەیەنێت (بەخۆی یان بەکەسێکی تر)، نە وەڵامی زیانیش بە زیان بداتەوە."[١] لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زیان نەگەیاندن بە خود و کەسانی تر دەستورێکی ئاینییە. لەو ڕووەوە کە جگەرە زیان بە خودی کەسەکە و دەوروبەرەکەشی دەگەیەنێت، دەتوانرێت بوترێت بە جگەرە کێشان کە هەم مافی خوا و هەم مافی بەندە پێشێل دەکرێت.

دەکرێ لە ڕوانگەی ئیسرافیشەوە بۆ بابەتەکە بڕوانین. ئیسراف واتە زیادەڕەوی و بەفیڕۆدانی شتێك بەبێ سوود. لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ (الأعراف: ٣١)

---

١. ابن ماجة، الأحكام ١٧؛ الموطأ، الأقضية ٣١.

واتە: "بخۆن و بخۆنەوە (لە نازو نیعمەتەکان) بەڵام زیادەڕەوی مەکەن"، پێغەمبەری مەزنیشمان (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەمیشە فەرمانی کردووە کە هاوسەنگانە مامەڵە بکرێت و زیادەڕەوی و هەڵەخەرجیی قەدەغەکردووە. لەوانەیە کەسی جگەرەکێش لای وابێت کە مادەم ئالودەبووە و، جگەرە بووەتە پێداویستییەکی جەستەیی بۆی، کەواتە ئەو پارەیەی بۆ جگەرە تەرخان دەکرێت ئیسراف نییە! بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە جگەرە نەك هەر سوودی نییە، بەڵکو چەندین زیانیشی هەیە، دەردەکەوێت کە ئەم بۆچوونە چەند هەڵەیە. دەوڵەمەندیی ئەو کەسەی کە ئەم خەرجییە دەکات ڕێ ناگرێت لە بەردەم ئیسراف بوونیدا.

دەبێ ئەوەش لە یاد نەکەین کە کەسی سەرۆك خێزان دابینکردنی بژێوی و پێداویستی خێزانەکانی و منداڵەکانی و ئەندامانی خێزانەکەی و خزمە دەستکورتەکانی لەسەر شانە. ئەگەر کەسانێك بەهۆی ئەو هەڵەخەرجییەی لە جگەرەدا دەیکەن نەتوانن بەپێی پێویست بژێوی ماڵ و منداڵیان دابین بکەن. ئەم دۆخە لە ڕوانگەی مرۆڤایەتی و ئەخلاقیشەوە لێیان قەبوڵ ناکرێت، وەك چۆن لە ڕوانگە ئاینییەکەشەوە قەبووڵ نەکراوە.

حوکمی فیقهیی جگەرە کێشان دەکرێت لە هەریەك لە ڕوانگەکانی زیان، ئیسراف و دەستکورتیی لە نەفەقەدا، بە جیا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت. لە ژێر ڕووناکیی ئەم زانیارییانەدا زۆربەی زانایان دەفەرموون جگەرە حەرامە. ئالودەییەکانی وەك نێرگەلە و هاوچەشنەکانیشی دەکرێت لەم چوارچێوەیەدا مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. لە لایەکی

تریشەوە ماددە هۆشبەرەکانی وەك ئەسرار و ئەفیون و هێرۆین و کۆکاین و مۆرفین، لەبەر ئەوەی کاریگەری ماددە کحولییەکان لە لەشدا بە زیادەوە دروست دەکەن، حەرامن.

**٢) حەرام و حەڵاڵە پەیوەندیدارەکان بە خۆگۆڕین و خۆ ڕازاندنەوەوە.**

بەشێوەیەکی گشتی خۆداپۆشین تایبەتمەندییەکی مرۆڤانەیە و لە ئاژەڵ جیای دەکاتەوە. ڕووتی لە هەموو سەردەمێکدا بە پێوەری شعور و ویژدانی کۆمەڵگە بە کارێکی بێئابڕویی و بێشەرمی دانراوە.

فەرمانی خۆداپۆشینی ئاینی پیرۆزی ئیسلام مەبەستی هەمەجۆر لەخۆ دەگرێت، وەك پاراستنی سەلامەتیی ڕۆحی تاك و پێکهاتەی سروشتی و پاراستنی کەرامەتی تاك و ئەخلاقی گشتی کۆمەڵگە و دابینکردنی هاوسەنگی لە پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکان و بنیاتنانی ژیانێکی خێزانی و جەستەیی وەها کە شایانی مرۆڤ بێت، جیاوازیی نێوان فەرمانی خۆداپۆشین بۆ پیاوان و ژنان، لە جیاوازیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەو شوێن و ئەندامانەی جەستە کە لە ڕووی ئاینەوە حەرامە بکرێنەوە و نیشان بدرێن و تەماشا بکرێن، لە زمانی ئاینیدا پێی دەوترێت "عەورەت". هەروەك چۆن داپۆشینی عەورەت ئەرکێکی ئاینییە و مەرجێکە بۆ قەبوڵبوونی نوێژ، داپۆشینی لە دەرەوەی نوێژیشدا بەهەمان شێوە ئەرکێکی ئاینییە. بەڵام سنووری داپۆشین بەگوێرەی ڕەگەزەکان و بوون و نەبوونی مەحرەمییەت لە نێوانیاندا

جیاوازی هەڵدەگرێت. لەبەر ئەمە لە فیقهدا، داپۆشین، سێ جۆری هەیە: "خۆداپۆشین لە نوێژدا، خۆداپۆشین لە بەرامبەر نزیکەکان و، خۆداپۆشین بەرامبەر بێگانەکان".

ئەو شوێنەی کە عەورەتە و پێویستە پیاو لە کاتی نوێژدا دایپۆشێت و، لە دەرەوەی نوێژیشدا جگە لە ژنەکەی خۆی بەرامبەر بە ژنان و پیاوانی تر دایپۆشێت، شوێنی نێوان ناوك و ئەژنۆیە. بە گشتی تێڕوانینی زۆرینەی زانایانی ئیسلام لە بارەی سنووری عەورەتەوە ئەمەیە و هەندێك جیاوازیش لە بۆچوونەکانیاندا هەیە.

بە پێی مەزهەبی حەنەفی و شافیعی، شوێنی عەورەتی ئافرەتان لە بەرامبەر ئافرەتانی دی و مەحرەمەکانیان، وەك شوێنی عەورەتی پیاوە بەرامبەر بە پیاو. بە گوێرەی مەزهەبی مالیکی و حەنبەلیش ژنان لای پیاوی مەحرەمیان، بێجگە لە دەست و دەموچاو و سەر و مل و قۆڵ و قاچ و پوز، سەرجەم شوێنەکانی تر عەورەتە و پێویستە داپۆشرێت. ئافرەت لە بەرامبەر پیاوی بێگانەدا شوێنی عەورەتی بێجگە لە دەموچاو و دەست هەموو شوێنێکی تریەتی.

## ئایا پۆشینی جلوبەرگی ئاوریشمین و بەکارهێنانی ئاڵتون بۆ پیاوان حەرامە؟

لە ئاینماندا حەرامە پیاو ئاڵتون بەکار بهێنێت و جلی ئاوریشم لەبەر بکات. پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی کە ئاڵتون و

ئاوریشم بۆ پیاوان حەرامن و بۆ ژنان حەڵاڵن،[1] وە فەرمووشیەتی کە ئەوانەی لە دونیادا ئاوریشم لەبەر دەکەن، لە ئاخیرەتدا لەبەری ناکەن.[2]

پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە فەرموودەیەکدا نەهی لەوە کردووە ئیمانداران لە قاپی ئاڵتوندا بخۆن و بخۆنەوە و ئەو جلانە لەبەر بکەن کە لە ئاوریشم دروست کراون.[3] لە فەرموودەیەکی تریشدا هەواڵی پێداوین کە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەرگێکی ئاگرین دەکاتە بەری ئەو کەسەی کە لە دنیادا ئاوریشمی لەبەرکردووە.[4]

وەك زانایانی فیقهـ ئاماژەی پێدەدەن، (حیکمەت)ی قەدەغە کردنی ئاوریشم و زێڕ بۆ پیاوان ئەوەیە کە دەبنە هۆی ئیسراف و خۆ بەگەورەزانین و ڕێخۆشکەرە بۆ وروژاندنی دەماری حەسوودیی لە هەژاراندا و گۆڕینی سروشتی پیاو و شوبهاندنیەتی بە ژنان.

## ئایا گوێگرتن لە مۆسیقا ڕێگە پێدراوە؟

مۆسیقا یەکێکە لەو بابەتانەی کە لە لایەن زانایانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە و زۆر شتی لە بارەوە وتراوە. کاتێك بەشێوەیەکی گشتگیر لەو وتانە دەڕوانین کە لە سوودی یاخود لە دژی مۆسیقا خراونەتە ڕوو، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مۆسیقا بە شێوازێکی ڕەها قەدەغە نەکراوە. بەڵام ئەگەر گۆرانییەك ڕێخۆشکەر

١. ابن ماجة، اللباس ١٩؛ ابو داود، اللباس، ١؛ الترمذي، اللباس، ١.
٢. البخاري، اللباس، ٢٥؛ مسلم، اللباس، ٦، ٧، ٢١؛ ابو داود، اللباس، ٧.
٣. البخاري، الأطعمة، ٢٨؛ مسلم، اللباس، ٥.
٤. الهيثمي، مجمع الزواهد و منبع الفوائد، ١٤١/٥.

بێت بۆ شتانێك كه به گوێرەی ئاینەكەمان پەسەند نەكراوە وەك كوفر و ناشكوری و جوێن و وروژاندنی سێكسی، گوێ لێگرتنی هەرگیز دروست نییە.

## ئایا قومارکردن حەرامە؟

قومار ڕێگەیەكی ناحەقی قازانجە كه مرۆڤەكان هاندەدات بۆ تەمبەڵی و تۆوی ڕق و دوژمنایەتی دەچێنێت لە نێوان مرۆڤەكاندا و كاسپیی حەلاڵ لەناو دەبات و، مرۆڤەكانیش لە بەندایەتی سارد دەكاتەوە. ئاینەكەمان پێمان دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ (البقرة: ١٨٨) واتە: "ئەی خەڵكینە لەناو خۆتاندا ماڵ و دارایی خۆتان بە نارەوا و حەرام مەخۆن."

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (المائدة: ٩٠)

واتە: "ئەی خاوەن ئیمانەكان شەراب و قوماركردن و سەربڕینی ئاژەڵ لەسەر بەردەكانی دەوری كەعبە، یا لای بتەكان، هەروەها پەیڕەوكردنی ئەزلام و بەكارهێنانی، كۆمەڵەكارێكی قێزەونن و كرداری شەیتانی نەفرین لێكراون، كاری مرۆڤی ژیر و لە خوداترس نین، خۆتان لەمانە بپارێزن و لێیان دووركەونەوە بەڵكو سەركەون و بەختەوەر بن."

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆمان دەردەكەوێت كە قومار و هاوچەشنەكانی حەرام كراون.

وەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەی پێکراوە، قومار بریتییە لە بردنی ماڵ و دارایی خەڵك بە ناهەق. لە لایەکی دیکەوە قومار نەخۆشییەکی سارییە و سەردەکێشێت بۆ گوناهەکانی وەك درۆ و مەی خواردنەوە و ڕق و تۆڵە و کوشتن. لەبەر ئەوە سەردارمان (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکدا فەرمانمان پێ دەکات کە تەنانەت ئەگەر کەسێك تەنها ناویشی هێنا، ئەو مرۆڤە چاو بە خۆیدا بخشێنێتەوە و خۆی چاك بکات، لەو بارەیەوە دەفەرموێت: "هەرکەسێك بە هاوڕێکەی وت وەرە با بچین قومار بکەین، با سەدەقەیەك ببەخشێت."[1]

## ئایا یارییەکانی شەترەنج و تاوڵە حەرامن؟

بۆ ئەوەی شەترەنج لە بازنەی ڕێپێدراوەکاندا جێی ببێتەوە، چوار مەرج دانراوە:

١) ئەوانەی یاری شەترەنج دەکەن نابێت بەهۆی سەرقاڵبوون بە یارییەکەوە بهێڵن نوێژیان بچێت.

٢) نابێت یارییەکە لە بەرامبەر پارە و دەسکەوتدا بکرێت تا ڕێ خۆش نەکات بۆ قومار، واتە براوە و دۆڕاو لە کۆتاییدا هیچ دەسکەوتێکیان نەبێت.

٣) پێویستە یاریزانەکان لەکاتی یاریدا زمانیان لە درۆ و غەیبەت و جنێو بپارێزن.

٤) نابێت ئەوانەی لەسەر یاری شەترەنج ڕاهاتوون هێندە ئالوودەی ببن کە هەرگیز نەتوانن دەستبەرداری ببن.

١. مسلم، الإمان، ٥.

لەم بارەدا، بەمەرجێك هاوسەنگی ڕابگیرێ و یارییەکە نەبێتە ڕێگر لە بەردەم بەندایەتیدا و نەبێت بە هۆکاری گوناهـ، ئەوا یاریی شەترەنج موباح دەبێت.

زانایانی فیقهـ بە پێی ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان شەترەنج و تاوڵەدا هەیە، هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر بە تاوڵە نییە و زیاتر توندن بەرامبەری. جیاوازی نێوان ئەم دوو یارییەش لەوەدایە کە:

"لە تاوڵەدا یارییەکە پشت بە زارەکان دەبەستێت، بەڵام لە شەترەنجدا پشت بە بیر و توانای مێشك دەبەسترێت. لەم ڕوانگەیەوە دەکرێت لە بابەتی تاکتیکی جەنگیشدا سوودی لێ ببینرێت."

لە ئەنجامدا پاش تێگەیشتن لە دەستوور و ڕێسای بابەتەکە، دەتوانرێت حوکمەکەی لەسەر بینا بونیاد بنرێت، دەستوورەکەش ئەمەیە: "ئەگەر یارییەك پشت بە بیرکردنەوە و چالاکی هزریی ببەستێت لە بازنەی ڕێپێدراوەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە. شەترەنج وەك ئەمە وایە. ئەگەریش پشت بە زار و بەخت ببەستێت، ئەوا دەچێتە بازنەی قەدەغەکراوەکانەوە. تاوڵەش نموونەیەکی ئەمەیە."

### ٣) حەڵاڵ و حەرامەکانی پەیوەست بە ژیانی سێکسییەوە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەك چۆن پێویستییە ڕۆحی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ دابین دەکات، دابینکردنی پێویستیی و خواستە جەستەیی و سروشتییەکانیش بەشێوازێکی گونجاو و هاوسەنگ لەخۆدەگرێت.

ئاینی ئیسلام وەك بارێکی ئاسایی لە پەیوەندیی سێکسی دەڕوانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم بابەتەدا بە دانانی سنووری بەرچاو و هاوسەنگیی گونجاو ژیانی سێکسی دەپارێزێت و بەردەوامیی پێ دەدات و ڕێگە لەو ڕەفتارانە دەگرێت کە پێچەوانەی کەرامەت و بەهای مرۆڤن و، لە هەمان کاتدا ڕێگە لە زیادەڕەویی و لەڕێ لادانیش دەگرێت.

لەبەرئەوەی پاراستنی عیففەت لە ڕێگەی هاوسەرگیری و، تێرکردنی ئارەزووە سێکسییەکان لە چوارچێوەی ڕێگەپێدراوی خۆیدا، و ژیانێکی سێکسیی تەندروست و ڕێك و پێك، بابەتێکە ئاین فەرمانی پێ دەکات و هانمان دەدات بۆی، بۆیە بابەتەکە دەچێتە نێو چوارچێوەی واتای فراوانی "بەندایەتی"یەوە. لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾

(الروم: ٢١)

واتە: "یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون تا ئارام بگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوە و تێدەفکرن."

هەروەها ستایشی ئەو ئیماندارانە دەکرێت کە داوێنیان دەپارێزن و

بە ژیانی سێکسی ڕێپێدراوی نێو هاوسەرگیری قایل و ئاسوودەن.[1]
بە هەمان ئاڕاستەی ئەم ئامانجە پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)
موسوڵمانان هاندەدات بۆ هاوسەرگیری و ئامۆژگاریمان دەکات تا
دەکرێت شیرازەی ژیانی هاوسەرگیری بپارێزین و، لەم ڕووەوە کۆمەڵێك
ئەرکی خستووەتە سەر شانی دایك و باوکان و دەوڵەت. هەروەها نەهی
ڕەبەنێتی دەکات و ڕەخنەی توند لەوانە دەگرێت کە ڕەبەنێتی دەکەن بە
عادەت. چونکە فەرمانە ئاینییەکانی تریش لە نێو ژیانێکی خێزانی
هاوسەنگی بەختیاردا باشتر بەجێ دەهێنرێن.

هەروەك چۆن ئاینی ئیسلام بە مەبەستی پارێزگاریکردنی
عیففەت چەند دەستوورێکی بڕیار داوە، بەهەمان شێوە و بۆ هەمان
مەبەست زینا و هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی قەدەغە کردووە کە دەبنە
مایەی لەکەداربوونی عیففەت. چونکە پارێزگاریکردن لە بەهایەك
بە ڕێگریکردنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبێت لە هەموو ئەو
دەستدرێژییانەی کە دەکرێنە سەر ئەم بەهایە.

## هەموو جۆرێکی زینا حەرامە

زینا کە بریتییە لە پەیوەندی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەرگیری،
کردەوەیەکە ئەقڵ و ڕەوشت و یاساکانی مرۆڤ و ئاینە ئاسمانییەکانی
تر بە هەڵە و عەیب و خراپ هەژماری دەکەن. بۆیە لە ئاینی پیرۆزی
ئیسلامیشدا بە دڵنیاییەوە قەدەغەکراوە، ئەنجامدانیشی لە نێو گوناهە

[1]. المؤمنون، ٥-٦.

گەورەکاندا هەژمار کراوە و بۆ ڕێگرتنیش لێی کۆمەڵێك ڕێ و شوێن دەستنیشان کراوە.

پاراستنی ئەندامانی کۆمەڵ و ژیانی خێزان و دەستەبەرکردنی ژیانێکی سێکسیی تەندروست تەنها بە قەدەغەکردنی زینا نایەتە دی. بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە ڕووبەڕووی هەموو جۆرە بێ ڕەوشتیی و داوێنپیسی و وروژاندنێك ببینەوە کە ئەقڵ و ئاین و سروشتی مرۆڤ بە خراپ و ناشیرینی دەزانێت. هەروەها دەبێت ئەو زەمینەیەی ڕێگە بۆ ئەم جۆرە کارانە خۆش دەکات بگۆڕدرێت و چاك بکرێت. لەبەر ئەوە ئاینی ئیسلام تەنها بە قەدەغەکردنی زیناوە نەوەستاوە، بەڵکو گرنگی داوە بە داخستنی ئەو ڕێگایانەی کە بەرەو زینا دەڕۆن، وەك ڕووتی و تیکەڵاوی پیاوان و ژنانی نامەحرەم و ئازادی ڕەها. لەگەڵ ئەمەشدا گرنگی داوە بە پاراستن و باشکردنی ژیانی خێزانی لە ڕێگەی بەخشینی کەماڵی ڕەوشت و پێدانی بەرپرسیارێتی بە تاك و بڕیاردانی چەند ماف و ئەرکێك تایبەت بە ژیانی سێکسیی خێزان.

هەروەك چۆن لە قورئانی پیرۆزدا زینا و داوێنپیسی لە ڕیزی گوناهە گەورەکاندا دەژمێردرێن و ئاماژە بە سزاکەی کراوە لە دونیا و قیامەتدا،[1] بەهەمان جۆر فەرمان بە پیاوان و ژنانیش کراوە کە چاویان لە حەرام بپارێزن و عەورەتیان داپۆشن. ئاماژە کراوە بەوەی کە بەم چەشنە ڕێگاکانی زینا دادەخرێن،[2] لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) باسی زینای ئەندامانی جەستە دەکات وەك زمان

---

١. آل عمران: ١٣٥؛ النساء، ١٥-١٦؛ الاسراء: ٣٢.
٢. النور: ٣٠-٣١.

و دەم و دەست و پێ و چاو[1] و، دەری دەخات کە هەموو ئەو تێکەڵی و پێکەوەبوون و پەیوەندییە ناشەرعییانەی نێوان ژنان و پیاوان کە ڕێ بۆ زینا خۆش دەکەن چەند هەڵسوکەوتێکی نائەخلاقین و فەرمانمان پێدەکات دوورەپەرێزییان لێبکەین. چونکە پاراستنی عیففەت و نامووس تەنها بە دوورەپەرێزیکردن لە سەرجەم ئەو خراپە و هەڵانە دەبێت کە لەکەداری دەکەن.

ژن و پیاو هەریەك بۆ ئەوی دی بزوێنەرێکی سێکسییە. لەبەر ئەمە ئەو ژن و پیاوانەی کە بێگانەن بە یەکدی پێویستە مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر هاوسەنگ و مەودادار بێت، دیسان لەبەر ئەو ئاکامە نەخوازراوانەی کە دەکرێت لێی پەیدا ببێت. بەتەنیا مانەوەی ژن و پیاوێکی بێگانە قەدەغە کراوە. پێکەوە مانەوەی ژن و پیاوێکی بێگانە لە شوێنێکدا، لە فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێت "خەڵوەت". لە فەرموودەکانیشدا ئاماژە بەوە کراوە کە مانەوەی پیاو و ژنی بێگانە لە شوێنێکی داخراودا شتێکی ڕێپێنەدراوە. لە فەرموودەیەکدا سەروەرمان (صَلَّیَ اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەوەی بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەمدا بەتەنها نەمێنێتەوە، چونکە لە دۆخێکی وەهادا سێهەمیان شەیتانە."[2] ئەم دۆخە بزوێنەری ڕەگەزی بەرامبەرە، ڕێخۆشکەرە بۆ زینا و قسە و قسەڵۆکی خەڵکی و ڕوشاندنی عیففەتی لایەنەکان.

پاراستنی دەستوورە ڕەوشتییەکان لە پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکاندا

١. مسلم، القدر، ٥.
٢. مسلم، الحج، ٧٤؛ حاكم، المستدرك، ١١٤/١؛ الترمذي، الرضاع، ١٦.

بەرپرسیارێتییەکی هاوبەشی پیاوان و ژنانە. لەبەر ئەوەی خانمان زیاتر سەرنجڕاکێش و بزوێنەرن، داوایان لێکراوە کە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیاندا زیاتر ئاگاداربن. لەپێناو ئەم ئامانجەدا بڕیاری چەند فەرمانێك دراوە، وەك:

"کاتێك ئافرەتان لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا قسەدەکەن، پێویستە بەشێوازێکی جددی و شکۆدار بدوێن بە جۆرێك کە گومان لە دڵدا دروست نەکات و کەسی بەرامبەر دووچاری تێگەیشتنی هەڵە نەکات"[1]، نیشان نەدانی جوانیی و ئەندامەکانی بە کەسی بێگانە[2] و خۆداپۆشین لە چوونە دەرەوەدا.[3] پێغەمبەرمان (صَلَّیَ اللّٰهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) بەگونجاوی نەزانیوە خانمان لە دەرەوەی ماڵی خۆیان بۆن بدەن لەخۆیان بەجۆرێکی وەها کە کەسانی تر هەستی پێ بکەن.[4]

## ئایا تەماشاکردنی فیلم و دیمەنە ورووژێنەر و نەشیاوەکان حەرامە؟

بەشێوەیەکی گشتی تێکچوونی ڕەوشت بە تەماشاکردنی دیمەنە ورووژێنەرەکان دەست پێدەکات و سووربوونی لەسەر ئەو ڕوانینە بەرەو پێش دەچێت و دواتریش دەبێتە گوناهی فیعلی. جگە لەوەش چاوەکان وێنەی ئەو شتانە دەگرن کە دەیانبینن و دەیانخەنە ئەرشیفی خەیاڵەوە. بۆ کوێ بڕوات و لە کوێ بێت، ئیدی ئەو وێنانە لە دونیای خەیاڵیدا

---

١. الأحزاب: ٣٢.
٢. النور: ٣١.
٣. النور: ٣١؛ الأحزاب: ٥٩.
٤. الترمذي، الأدب، ٣٥؛ المسند، ٤/٤١٤، ٤١٨.

لەبەر چاویدایە. گەر قوتابی بێت خوێندنی وانەکەی پێناکرێت، ئەگەر کارمەند بێت ناتوانێت بەتەواوی بیری لای کارەکەی بێت. بەم جۆرە دواکەوتن و شکست لە هەموو بوارەکاندا ڕوودەدات. بۆ ئەوەی دووچاری ئەم بارە نەبین ئاین لە بەرامبەر دیمەنە ورووژێنەرەکاندا چەند قەدەغەیەك دادەنێت و پەیڕەوانی خۆی لەم کەوتنەخوارەوەیە دەپارێزێت.

بە گوێرەی ئیسلام، گرتنی ئەو فیلم و وێنانەی کە دەچنە نێو سنوورەکانی ڕووتییەوە، بە مەبەستی هەژاندنی شەهوەت بێت یان نا، حەرامە. تەماشا کردن و مامەڵەکردنیش بەم وێنە و فیلمانەوە، حەرامە، چونکە ڕووتیی ڕاستەوخۆ و ڕووتی لە ڕێگەی فیلم و وێنەوە لە بنەڕەتدا ڕوویان لە هەمان ئامانجی ناشەرعییە. جیاوازییەکە تەنها لە ڕوانگەی کاریگەرییەوەیە، ڕووتی ڕاستەوخۆ کاریگەری خراپتری هەیە وەك لە ڕووتی ناڕاستەوخۆ. بەڵام لە ڕووتی ناڕاستەوخۆشدا بەربڵاوی و بەردەوامی هەیە.

شایەنی باسە، نابێت وێنەی ڕووت بە تەنها لە وێنەی ئافرەتدا سنووردار بکەین. واتە ناکرێ بڵێین گەر وێنە ڕووتەکە وێنەی ئافرەت بوو گوناهە و گەر وێنەی پیاویش بوو ئاساییە. کرانەوە و تەماشاکردنی شوێنی عەورەت هی هەرکەسێك بێت حەرامە و گوناهە. لەگەڵ ئەوەشدا حەرامی و گوناهـ تا لە شوێنە زۆر مەحرەمەکان نزیك ببێتەوە، قورستر دەبێت و زیاد دەکات. ئاشکرایە کە ڕوانین بۆ وێنەگەلێکی لەم جۆرە، گوناهەکەی وەك ڕوانینی ڕاستەوخۆ نییە. لێرەدا نامانەوێت بڵێین ئەمیان لەویان سوکترە ،بەڵکو مەبەستمان لە جیاوازی نێوانیانە.

بەشی خوێندنەوە

## کوڕە گەنجەکە بۆچی پەنجەی لەسەر ئاگرەکە ڕادەگرت؟

شەقامی حەریقزادەکان... ناوی "حەریقزادەکان"ە، واتە ڕزگاربووان لە ئاگر.

شەوێکیان ئاگر، لەو گەڕەکانەی کە ماڵەکانیان لە تەختە دروستکرابوو کەوتەوە. لە نیوەی شەوی زستاندا ئاگر لە ماڵێکی دووقاتی دارینەوە دەستی پێکرد. لە ماوەیەکی کەمدا تاوی سەند، کوڕ ئەو کوڕە بوو گیانی خۆی ڕزگار بکات. یەکێك لەوانەی کە هەر چۆنێك بوو خۆی گەیاندە دەرەوە کچێکی لاو بوو. نەیدەزانی چی بکات و بۆ کوێ بڕوات. لەو کاتەدا ڕووناکییەك لە پەنجەرەی یەکێك لە مەدرەسەکانی مزگەوتی شێخ زادە، ئومێدێکی پێبەخشی. نەیدەتوانی چیتر بەرگەی ئەو سەرمایە بگرێت کە لەرزەی خستبووە ددانەکانی. دەرگای ئەو مەدرەسەیەی کردەوە.

قوتابییەك لەسەر ڕەحلەیەکی دروستکراو لە داری گوێز بە دیار تەفسیری قورئانەوە خەیاڵ بردبوویەوە. کاتێك قوتابییەکە سەری هەڵبڕی، سەرەتا وایزانی کە تارمایی دێوی دیوە، وتی:

- تۆ کێی؟ مرۆڤی یان جنۆکە؟ بەم شەوە درەنگە لێرە کارت چییە؟

- من جنۆکە نیم، خوشکی ئاینیتم. ئاگرێك لە گەڕەکەکەمان کەوتەوە، منیش بە زەحمەت خۆم ڕزگار کرد و بە هەڵەداوان پەنام بۆ ئێرە هێنا.

- نابێت! من لە ئێستادا قوتابییەکم موتاڵای تەفسیر دەکەم، دەبێت لە هەڵسوکەوتی نارێك بەدووربم. گەر تۆ لێرە ببینن ناتوانین ڕێ لە قسە و قسەڵۆکی خەڵك بگرین، پێویستە هەر ئێستا ئێرە بەجێ بهێڵیت.

- بەم شەوە درەنگە بۆ کوێ بچم؟ بۆ هەر شوێنێك بڕۆم ڕەق دەبمەوە!

قوتابییەکە بەدەم خۆیەوە وتی: "خێر بێت ئیشەڵا، وا دیارە تاقیکردنەوەیەکمان لە پێشە."

ساتێك بێ دەنگی...

- مادەم وایە بڕۆ ئەو لێفەیەی بن دیوارەکە بدە بە خۆتدا و پشوو بدە.

قوتابییەکە دووبارە چاوەکانی خستەوە سەر کتێبەکەی و بەردەوام بوو لە موتاڵاکردنی تەفسیری (البیضاوي). بە تێپەڕبوونی کات ڕوویەڕووبوونەوە لەگەڵ شەیتان دەستی پێکرد.

لەپڕ بە دەنگی بەرز هاواری کرد: "نەخێر!" ئنجا پەنجەی خستە سەر ئاگری بڵێسەداری چراکە و سووربوو لەسەر ئەوەی تا پێستەکەی نەسووتێت لای نەبات.

ئەم ڕوویەڕووبوونەوەیە تا بەرەبەیان بەردەوام بوو، ئەو پەنجەیەی چەند جارێك لەسەر ئاگرەکە دانا، تا وای لێهات بە تەواوەتی سووتا و برینێکیش

لە نوکەکەی هات. خەریکە خۆر هەڵدێت. قوتابییەکە لەگەڵ بانگی بەیانیدا مەدرەسەکەی بەجێ هێشت و چوو بۆ نوێژ. کاتێك گەڕایەوە بینی لە ژوورەکەیدا کەس نەماوە، هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا.

کچە بەستەزمانەکە بەرەبەیانێکی زوو دەگەڕێتەوە بۆ لای ماڵەوە و دەبینێ دایك و باوکی لە نێو پەژارەدا بە دوای ئەودا دەگەڕێن. پێیان دەڵێت:

- بابە گیان، دایە گیان، من لێرەم نیگەرانی من مەبن.

- کچم لە کوێ مایتەوە ئەمشەو؟

- لە یەکێك لە ژوورەکانی ئەو قوتابخانەیە، لە لای قوتابییەك.

کچەکە ڕووداوەکانی دوێنێ شەوی گێڕایەوە. باوکەکە کە یەکێك بوو لە دەسەڵاتداران، دەستی کچەکەی دەگرێت و دەچێت بۆ مزگەوتی شێخ زادە و داوا لە مامۆستای مزگەوتەکە دەکات قوتابییەکانی کۆ بکاتەوە. مامۆستاکە خەمبارە و قوتابییەکان سەرسامن. لەوە دەترسن خوانەخواستە قوتابییەك ڕەفتارێکی پێچەوانەی عیففەتی نواندبێت و عیففەتی ئەو کچە بەستەزمانەی لەکەدار کردبێت.

کچەکە چاو بە سەرجەم قوتابییەکاندا دەخشێنێ و ئاماژە بۆ یەکێکیان دەکات، دەڵێت:

- ئەوەتا بابە گیان، ئەوەیان کە نووکی پەنجەی بەستراوە!

مامۆستا بە سەرسامییەوە پرسی:

- سەڵاحەددین! هەرگیز چاوەڕێی شتێکی لەم جۆرەم لە تۆ نەدەکرد.

سەڵاحەددین سەری نەوی دەکات و لە شەرمی مامۆستاکەی یەك وشەشی پێ ناوترێ. لەم کاتەدا باوکەکە دێتە قسە و دەڵێت:

- مامۆستای بەڕێز، قوتابییە بەنرخەکەتان مەشکێنن، ئێمە بۆ سکاڵاکردن نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بۆ سوپاس و پیرۆزبایی. تکایە لێی بپرسن کە بۆچی پەنجەی بەستووە؟

قوتابییەکە بە شەرمەزارییەوە لەسەر پێداگریی باوکی کچەکە هاتە قسە و، وتی:

- کاتێك شەیتان وەسوەسەی دەخستە دڵمەوە، منیش پەنجەم دەخستە سەر ئاگری چراکە. بە خۆمم دەگوت: "دەتوانیت بەرگەی ئاگر بگریت؟" ئیدی پەنجەم سووتا و ناچار بووم بیبەستم!

باوکە دەسەڵاتدارەکە، بڕیاری خۆی خستە ڕوو:

- مامۆستا، تا ئەم قوتابییە خوێندن تەواودەکات، سەرجەم خەرجییەکانی دەگرمە ئەستۆ، هەروەها داوای ئەو شەرەفە دەکەم کچەکەمی بدەمێ و بیکەمە زاوای خۆم!

## ٤) ئەو حەرام و حەڵاڵانەی پەیوەندییان بە ژیانی ڕۆژانەوە هەیە

لێرەدا ئاماژە بە چەند بابەتێك دەکەین کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە بەردەوامی ڕووبەڕوویان دەبینەوە.

## وازهێنان لە نوێژ ڕێگەپێدراو (جائز) نییە

نوێژ گرنگترین فەرزی ئەستۆی بەندایەتی ئیماندارانە. کاتێك تەماشای قورئانی پیرۆز دەکەین، دەبینین خوای گەورە لەبەر گرنگییە مەزنەکەی حەفتا جار فەرمانی بە نوێژکردن کردووە. هیچ بەندایەتییەکی تر نییە هێندەی نوێژ هەڵوێستە و پێداگریی لەسەر کرابێت.

نوێژ ئەو بەندایەتییەیە کە بەهۆیەوە بەڵێنی بەختەوەری هەردوو جیهانمان پێدراوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا پێمان ڕادەگەیەنێت کە یەکێك لە سیفەتەکانی دانیشتوانی دۆزەخ نەکردنی نوێژە.[1]

سەرداریشمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی: "لە نێوان مرۆڤ و شیرك و کوفردا وازهێنان لە نوێژ هەیە"[2] و، بەم شێوەیە وەك نیشانەیەکی ئیماندار باسی نوێژی کردووە.

بەڵێ، نوێژ نیشانەی ئیمان و، نووری دڵە و، میعراجی ئیماندارانە. واتە ئیماندار لە سایەی نوێژدا بەرز دەبێتەوە و، بەرەو بازنەی ڕەزامەندی خوای گەورە سەردەکەوێت. نوێژنەکردن یاخیبوونە بەرامبەر خوای گەورە و گوناهێکی گەورەیە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەم جۆرە باسی لە سەرەنجامی نوێژ نەکەران کردووە:

﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴾

(مريم: ٥٩)

---

١. المدثر: ٤٢-٤٣.

٢. مسلم، الايمان، ١٣٤؛ احمد بن حنبل، المسند، ٣٨٩/٣.

واتە: " کەچی پاشماوەی گەلێکیان لێکەوتەوە نوێژیان نەدەکرد و کەوتبوونە شوێن ئارەزووبازی. ئەمانە سەرەنجام بە سزای گومڕایی خۆیان ئەگەن."

هەروەها پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەو کەسەی ئەمانەت نەپارێزێت ئیمانی نییە. ئەو کەسەش کە ڕەچاوی پاکوخاوێنی ناکات و نوێژ ناکات ئاینی نییە. شوێنی نوێژیش لە ئایندا وەك شوێنی سەر وایە لە جەستەدا."[١] لە فەرموودەیەکی تریشدا ئاماژە بەوە دەکات یەکەمین شت کە لێپرسینەوەی لە بارەوە دەکرێت نوێژە، ئەوەی نوێژی تەواو بێت تاقیکردنەوەکانی تریشی بۆ ئاسان دەبێت.

پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە فەرموودە پیرۆزەکانیدا پێمان ڕادەگەیەنێت، کە پێویستە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمانی نوێژ بە منداڵان بدەین و لە دە ساڵیشدا پێیان بکەین.[٢] لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودانەدا، زانایان وازهێنانی منداڵێکی عاقڵی باڵغ لە نوێژ، لەنێو هەمان گرۆدا هەڵدەسەنگێنن.

چەند فەرموودەیەکی پیرۆزیش ئەوەیان بۆ ڕوونکردووینەتەوە کە گەورەترین دز ئەو کەسەیە کە لە نوێژەکەی دەدزێ.[٣] بە واتای ئەوەی گرنگی پێویست و شایستە بە سوجدە و ڕکوع نادات لە نوێژەکانیدا و، لەو بارەیەوە ئاگادارکراوینەتەوە. لە هەندێك لەو کتێبانەدا کە تەرخان کراون بۆ گوناهە گەورەکان، نەکردنی نوێژی جەماعەت بە بێ هیچ

---

١. الهیثمی، مجمع الزوائد، ٢٩٢/١.

٢. أبو داود، الصلاة، ٢٦؛ الترمذی، الصلاة، ٢٩٩.

٣. احمد بن حنبل، المسند، ٣١٠/٥؛ الذهبی، الکبائر، ٥٠.

هۆیەك بە یەكێك لە گوناهە گەورەكان هەژمار دەكرێت و، لەو بارەوە ئاگادار كراوینەتەوە.[1]

هەروەها تەرك كردنی نوێژ بە یەكێك لە گوناهە گەورەكان هەژماركراوە.[2] ئەنجامنەدانی نوێژ لە كاتی دیاریكراوی خۆیدا مەكروهە. لەبەر ئەو ئاگاداركردنەوە گرنگانەی كە سەروەرمان سەبارەت بە ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت داونی، هەندێك لە زانایان ئەنجامنەدانی نوێژ بە جەماعەت بەبێ هیچ پاساوێك، بە هەمان حوكمی تەرك كردنی نوێژ مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن.

لە لایەكی تریشەوە فەرز بوونی نوێژی هەینی، لە قورئانی پیرۆزدا چەسپاوە. پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هۆشداریمان دەداتێ لەوەی ئەگەر كەسێك سێ جار لەسەر یەك و بێ هۆ بەشداری نوێژی هەینی نەكات، ئەوا دڵی مۆر دەكرێت. لە فەرموودەیەكی تریشدا دەفەرموێت: ”كۆمەڵێك مرۆڤ هەن، دەبێت یان واز لە بەئەنجام نەگەیاندنی نوێژی هەینی بێنن، یان خوا دڵیان مۆر دەكات و ئیدی لە بێئاگایان دەبن.“[3]

## درۆكردن و سوێندی درۆ لە گوناهە گەورەكانە

درۆ، تێكچوونێكی ئەخلاقییە. گوناهێكی گەورەی وایە كە كۆمەڵگەكان دەخاتە سەنگەرەوە لە دژی یەك و پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان

---

١. الذهبي، الكبائر، ٥٣.
٢. ابن ماجة، الصلاة، ٩٣.
٣. مسلم، الجمعة، ١٢.

دەشێوێنێت. پێویستە مرۆڤی ئیماندار ئەگەر لە زیانی خۆیشی بێت واز لە ڕاستی نەهێنێت و وتەی درۆ بە دەمیدا نەیەت. دەبێت منداڵان هەر لە تەمەنێکی بچووکەوە دوور لە درۆ پەروەردە بکرێن. دەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە ئەو قسانەی لە کۆمەڵگەکەماندا ئەمڕۆ بە بەربڵاوی بەکاردێن و ناوی "درۆی سپی" یان لێ نراوە، هیچ نین جگە لە درۆ. درۆ، سپی و ڕەشی نییە. درۆ هەر درۆیە و گوناهێکە مرۆڤ بەرەو کەندەڵانەکان پەلکێش دەکات.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بە تیاچوونی درۆزنان کردووە. لەعنەتی لەوانەش کردووە کە خوویان بە درۆ کردنەوە گرتووە.[1]

پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرموێت: "درۆ مرۆڤ بەرەو گوناه دەبات. گوناهیش بەرەو جەهەننەم. مرۆڤ بە درۆکردنی بەردەوام وای لێ دێت لای خوای گەورە لە ڕیزی درۆزنان ناوی تۆمار بکرێت."[2]
هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەشدا، پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) درۆکردنی زۆری بە یەکێ لە نیشانەکانی دووڕوویی هەژمار کردووە.[3]

ئەوەی بۆ موسوڵمان جوانە پارێزگاریکردنە لە زمانی، بەڵام دەبێت لە شوێنی خۆیدا قسەی بەسوودی خۆی بکات. لە بێدەنگیدا سەلامەتی هەیە. سەردارمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەوەی باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە یان با بێدەنگ بێت، یان قسەی خێر بکات."

---

١. الذاريات: ١٠-١١؛ آل عمران: ٦١.
٢. البخاري، الأدب، ٦٩؛ مسلم، البر، ١٠٤.
٣. البخاري، الايمان، ٢٥؛ مسلم، الايمان، ٢٥.

ئەو کەسەی سوێند بە درۆ دەخوات، خەڵکی دەخەڵەتێنێت بەوەی کە خوا دەکات بە شایەت لەسەر سوێندەکەی، لە بنەڕەتدا ئەمە خراپ بەکارهێنانی ناوی پیرۆزی خوایە و بوختانێکە بۆ ئەو دەکرێت. بوختانێکیش بۆ خوا بکرێت بە دڵنیاییەوە حەرامە و یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، ئەمە بابەتێکی زۆر جددییە.

پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) لە زۆرێك لە فەرموودەکانیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە درۆ و سوێندی درۆ گوناهی زۆر گەورەن.[1] لە فەرموودەیەکیشدا فەرموویەتی کە لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت بۆ سێ کۆمەڵ لە مرۆڤەکان ناڕوانێت و بەم شێوەیە ڕیزی کردوون:

١) ئەوەی منەت بە بەخشینەکەیەوە دەکات.

٢) ئەوەی بە سوێندی درۆ کاڵاکەی دەفرۆشێت.

٣) ئەو کەسەی لەبەر گەورەیی و خۆ بەزلزانی بەرگەکەی لە زەوی دەخشێنێ.[2]

پێغەمبەرمان (عَلَيْهِأَفْضَلُصَلَاةٍوَسَلَام) دەفەرموێت:

"کاتێك کەسێك سوێند بە خوای گەورە دەخوات، گەر هێندەی باڵی مێشوولەیەك درۆ بخاتە نێو سوێندەکەیەوە، ئەوا ئەو سوێندە هەتا قیامەت وەك خاڵێکی ڕەش لە دڵی ئەو کەسەدا دەمێنێتەوە."[3] هەروەها

١. البخاري، الأيمان، ١٥؛ مسلم، الإيمان، ٢٢٠.
٢. مسلم، الإيمان، ١٧١.
٣. حاكم، المستدرك، ٣٢٧/٤.

لە کاتی حەجیماڵئاواییدا فەرموویەتی: "ئەگەر کەسێك بۆ بەدەست هێنانی کاڵاو شمەکی برا ئاینییەکەی سوێندی درۆ بخوات، ئەوا با خۆی بۆ شوێنەکەی لە دۆزەخدا ئامادە بکات. با ئەوانەتان کە لێرەن، ئەمە بگەیەنن بەوانەتان کە لێرە نین."[1]

زانایان فەرموویانە سوێندی درۆ لە شایەتیدا و، سوێند خواردنی زۆر گەر بە ڕاستیش بێت هەمان حوکمی هەیە.

١. الطبراني، معجم الكبير، ٢٧٥/١؛ حاكم، المستدرك، ٣٢٧/٤.

بەشی خوێندنەوە

## خۆزگە چاوەکانیشی بپاراستایە!

مامۆستایەك دەگێڕێتەوە: "قوتابییەکی خۆشەویستم هەبوو خاوەن زیرەکییەکی دەراسای وەها بوو کە بە نسیبی هەموو کەس نابێت، زۆرێك لە شەوەکانی بە عیبادەت بەسەر دەبرد. جوانییەکەی ناخی لە ڕوخساریشیدا ڕەنگی دابووەوە و ڕوخساری دەدرەوشایەوە. ئەوەی دەیبینی شەیدای دەبوو.

زوو زوو هاوپۆلەکانی دەهێنا تا بەشداری کۆڕی ئامۆژگارییەکان بکەن. دەیویست هەمووان تامی ئەم جوانییانە بکەن. هەموو کەسێك و لەپێش هەموانیشەوە خۆم، چاوەڕێی داهاتوویەکی پرشنگدارمان بۆی دەکرد. بەڵام پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) فەرموویەتی: "خوایە، بۆ ساتێکیش لەگەڵ نەفسماندا بە تەنها جێمان مەهێڵە!" کاتێکیش لە جەنگی ئوحود گەڕانەوە بە هاوەڵانی فەرموو: "گەورەترین جەنگ ئەو جەنگەیە کە لەگەڵ نەفسدا دەکرێت، گەورەترین پاڵەوانیش ئەو کەسەیە کە بە سەر نەفسیدا سەردەکەوێت." ئەم وتانە حیکمەتی زۆر قوڵیان تێدایە و بە خۆڕایی نەوتراون.

ئەو قوتابی پۆلی شەشی ئامادەیی بوو. خۆی بۆ تاقیکردنەوەکانی

زانکۆ ئامادە دەکرد. ئامانجی ئەوە بوو زانکۆیەکی باش بەدەست بهێنێت و خزمەتی نەتەوەکەی بکات. هەموانیش شتی زۆریان لێ چاوەڕێ دەکرد.

ڕۆژێکیان لە کۆڵانێکدا ئەوم بینی کە لەگەڵ هاوڕێ کچەکەیدا دەگەڕا، ئەم دیمەنە بێزاری کردم. چونکە ترسام ئەو پێی لە شتی بچوك هەڵبکەوێ و خاوبیێتەوە و لە نیوەی ڕێدا بوەستێت. خوویەکی وام نەبوو دەست وەربدەمە نێو ژیانی تایبەتی هیچ کەسێکەوە، بەڵام ئەگەر هیچم نەکردایە، دونیای ڕۆحی ئەو ڕەش دەبوو و گرۆتینی نەدەما و لە ئاکامیشدا نەیدەتوانی بگات بە ئامانجەکانی. بیرم لەوە کردەوە لە کاتێکی گونجاودا بێ ئەوەی دڵی بشکێنم، ئاگاداری بکەمەوە.

کاتێك پێم وت کە پێویستە هاوسەنگی ڕابگرێ و ئاگای لە هەڵسوکەوتەکانی بێت، وەڵامەکەی زۆر ساویلکانە بوو. پێی وتم کە تەبلیغی هاوڕێکەی دەکات و ئینشاءالله هاوڕێکەی بەو نزیکانە دەست بە نوێژ دەکات. منیش وا خۆم نیشاندا کە باوەڕم کردووە و پاشان لێك جیابووینەوە.

ئەوەی لێی ترسام ڕوویدا، تەبلیغەکە بە پێچەوانەوە ڕوویدا، دونیای پرشنگداری ئەو ژێرە و ژوور بوو. شەوەکانی تاریك بوون، ڕۆژانیشی پەرێشان. ئاه برا ئازیزەکەم، خۆزگە چاوەکانت بپاراستایە!

## ٥) ئەو تاوانە سەرەکییانەی کە بەرامبەر کەس و سامان دەکرێن

ئاینی ئیسلام پاراستنی مرۆڤ بەو سیفەتەی بەنرخترین و بەرزترین بەدیهێنراوە، پاراستنی ژیانی ئادەمیزادی وەك یەکێك لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئاین هەژمار کردووە. لە قورئانی پیرۆزدا بەرچاو ڕوونی لەمەڕ ئەوە دراوە کە ئەگەر کەسێك بە ناهەق دەستی بچێتە گیانی مرۆڤێك، ئەوا تاوانێکی هێندە گەورەی ئەنجام داوە، وەك ئەوەی هەموو مرۆڤەکانی کوشتبێت. هەروەها ڕزگارکردنی گیانی کەسێکیش وەك بەخشینی ژیان بە سەرجەمی مرۆڤەکان وێنا کراوە.[1] هەر لەبەر ئەمە لە ئیسلامدا کوشتن بە یەکێك لە گوناهە گەورەکان دەژمێررێت. ئەوەی بە ناهەق و بە ئەنقەست کەسێکی ئیماندار بکوژێت لەسەر داخوازی کەسە نزیکەکانی کوژراوەکە دەکوژرێتەوە.[2] لە ڕۆژی دواییدا بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە و، دووچاری تووڕەیی و لەعنەتی خوای گەورەش دەبێت.[3]

لە حەجیماڵئاواییدا سەردارمان موحەممەد (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْه) ڕووی دەمی لە سەرجەمی موسوڵمانان کرد و، فەرمووی: "هەروەك چۆن ئەم ڕۆژە و ئەم مانگە و ئەم شوێنە پیرۆز و پارێزراوە، گیان و ماڵ و شەرەفیشتان ئاوەها پارێزراوە (لە ژێر بەرپرسیارێتی کۆمەڵگا و دڵنیایی یاسادایە)"[4] دەریخستووە کە مافی ژیان دەست لێ نەدراوە.

---

١. المائدة: ٣٢.

٢. البقرة: ١٧٨، الأسراء: ٣٣.

٣. النساء: ٩٣.

٤. البخاري، العلم، ٣٧، الحج، ١٣٢؛ مسلم، الحج، ١٤٧.

لە فەرموودەیەکی دیکەشدا دەفەرمووێت: "خۆتان لە حەوت شت بپارێزن کە لە ناوتان دەبات، یەکێك لەوانە کوشتنی مرۆڤە بە ناهەق کە خوای گەورە حەرامی کردووە."[1]

ئەگەر سەرەڕای ئەو ڕێ وشوێنانەی کە ئیسلام لە زەمینەی ئاین و ئەخلاقدا و هەروەها لە سەر ئاستی ڕێکارە یاساییەکان گرتوونیەتە بەر، تاوانی کوشتن لەسەر کەسێك چەسپا، ئەوا سزایەکی دادپەروەرانەی وەها پەیڕەو دەکرێت کە هەم تاوانبار سزای خۆی وەردەگرێت، هەم کەسی ستەملێکراو مافەکانی دەپارێزرێت، وە هەم ویژدانی کۆمەڵگە ئاسوودە دەکرێ و ڕێ لە دووبارەبوونەوەی ئەو تاوانە دەگیرێت.

وەك درێژەی ئەم تێڕوانینە، لە کوشتنە ئەنقەستەکاندا بە مەرجێ کەسە نزیکەکانی کوژراوەکە بیانەوێت، کوشتنەوەی بکوژەکە یەکێکە لە یاسا چەسپاوەکان.[2] ئەگەر کەسوکاری کوژراوەکە داوای کوشتنەوەی نەکەن یان نەتوانرێت بڕیارەکە جێبەجێ بکرێت، ئەوا پارەی خوێنی کوژراوەکە دەدرێت.[3]

لە کوشتنی بەهەڵەدا پێویستە پارەی خوێنەکەی بدرێت بە میراتگرانی کوژراوەکە. ئەو کەفارەتەی کە لە کوشتنی هەڵەدا دەدرێت لە سەرێکەوە سوودی کۆمەڵگا و لە سەرێکی تریشەوە پەروەردەی نەفسی تێدا ڕەچاو دەکرێت. ئەو کەسەش کە کەسێکی نزیکی خۆی دەکوژێت وەك سزایەکی زیادە، بێبەش دەکرێت لە میراتی کوژراوەکە،

---

١. البخاري، الوصايا، ٢٣، الطب، ٤٨، الحدود،٤٤؛ مسلم، الإيمان، ١٤٤؛ ابو داود، الوصايا، ١٠.

٢. البقرة: ١٧٨-١٧٩، المائدة: ٤٥.

٣. النساء: ٩٢.

بەم جۆرە هەر لە سەرتاوە ڕێ لەو کوشتنە دەگیرێت کە لەوانەیە لەپێناو میراتدا ئەنجام بدرێت.

ئەو کەسەی بە ئەنقەست کەسێك دەکوژێت، لە ڕوانگەی ئاینەوە بە یاخی و فاسق دەژمێررێت. زانایانی ئیسلام ئەوە ڕادەگەیەنن کە دەکرێت تەوبەی پیاوکوژ، گەر ویستی خوای گەورەی لە سەر بێت، گیرا ببێت، لەگەڵ گەورەیی تاوانەکەشدا بەرچاوڕوونی ئەوەش دەدەن کە ئەگەر پیاوکوژ نەکوژرایەوە، ئەوا دەرفەتی ئەوەی دەدرێتێ کە خۆی چاك بکات و لەو ساتەوە ببێتە مرۆڤێکی باش. سەرەنجام پێگەی پیاوکوژیش لای خوا بە پێی ئاماژەی گشتی ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان بە بەخشینی گوناهەکانەوە هەیە،[1] تێدەگەین کە بابەتێکە بە تەواوی دەکەوێتە سەر ویست و لێخۆش بوونی خوای گەورە.

## دزی حەرامە

دزی واتە بردنی نهێنی سامانی تایبەت بە کەسێکی تر بەبێ ئاگاداری خۆی لەو شوێنەی لێی پارێزراوە. یەکێکە لەو تاوانە سەرەکییانەی کە بەرامبەر ماڵ و سامان ئەنجام دەدرێت. پارێزگاری کردن لەو سەروەت و ماڵەی کە بە ئارەقی ناوچەوان و قازانجی حەڵاڵ بە دەست هاتووە، لە نێو بنەما سەرەکییەکانی ئیسلامدایە. ئیسلام کارکردن و خاوەندارێتی بە پیرۆز هەژمار دەکات، سزای ئەو کەسەشی داوە کە بە ناهەق دەست بۆ خاوەندارێتی کەسانی دی درێژ دەکات. لەم

١. النساء: ٤٨، ١١٦، الزمر: ٥٣.

ڕوانگەیەوە هەروەك لە سەرجەم ئاینە ئاسمانییەکان و یاسا مرۆییەکاندا تاوانە، بە هەمان شێوە لە ئیسلامیشدا دزی هەم لە ڕووی یاساوە تاوانە، هەم لە ڕوانگەی ئاین و ئەخلاقیشەوە بە عەیب و گوناهێکی گەورە دادەنرێت. لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (المائدة: ٣٨)

واتە: "ئەو پیاوەی دزی دەکات و ئەو ژنەی دزی دەکات، دەستیان ببڕن لە مووچا تا ببێتە تۆڵەی ئەو گوناهە نالەبارەی کە کردوویانە، ئەمەش سزایەکە لەلایەن خواوە. خوا بە توانا و بە دەسەڵاتە و کارەکانی پڕ حیکمەتن."

جێبەجێکردنەکانی پێغەمبەرشمان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەر بەم ئاراستەیەدا بوون. سزای ئەم کارە لە قورئاندا بە ڕوونی باسکراوە و حەزرەتی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم جۆرە پەیڕەوی کردووە، لەبەرئەوەی لە یاسای سزای ئیسلامدا دزی لە نێو تاوانەکانی "حەد"دایە، ئەو سزایەش کە جێبەجێ دەکرێت، لە نێو سزاکانی "حەد"دا دەبێت.

یاساناسە موسوڵمانەکان بە دوورودرێژی ئەم بابەتەیان تاوتوێ کردووە و وتوویانە کە دەبێت هەم تاوانەکە و هەم سزاکە یاسا یەکلایی بکاتەوە و بە ئامانجی بەدیهێنانی دادپەروەری و هەق، پێویستە ئەوە یەکلایی بکرێتەوە کە داخۆ تاوانەکە لە چ هەلومەرجێکدا ئەنجام دراوە

و ئەو مەرجانە چین بۆ جێبەجێ کردنی سزاکە و، بابەتەکانی وەك دووبارە بوونەوە، زۆر لێکردن و لێخۆشبوون تا چ ڕادەیەك کار لە سزاکە دەکەن. بەم جۆرە یاساناسان سیستەمێکی یاسایی دەوڵەمەندیان بنیات ناوە.

بە کورتی، چەند مەرجێك دانراون بۆ تاوانی دزی تا سزای ناوبراو بیگرێتەوە، وەك: "نەبوونی هیچ بەهانەیەکی وەك برسێتی و پێویستی و زۆرلێکردن کە ببێت بەهۆی جێبەجێ نەبوونی سزاکە. کردنی تاوانەکە بە شێوەیەکی خۆویستانە و ئازادانە. تاوانبار ئەو مەرجانەی تێدا بێت کە پێویستن بۆ ئەوەی سزای لەسەر جێبەجێ بکرێت. ماڵە دزراوەکە پێویستە لە ڕووی یاساییەوە لە ژێر پارێزراویدا بوویێت و پێویستە لە بڕێکی دیاریکراو زیاتر بێت."

# ٦. ئیخلاس

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ ﴾ (الزمر: ٢-٣)

"بێگومان ئێمه به حهق و ڕاستی قورئانمان بۆ تۆ هێناوهته خوارهوه کهواته خوا بپهرسته و به تهنها ههر بۆ ئهو ملکهچ به. پهرستنی تهواو خاوێن و دوور له ههموو جۆره هاوهڵدانانێك تهنها شیاوی خوایه"

ئهگهر کردار جهسته بێت ئیخلاس ڕۆحیهتی، گهر کردار باڵێك بێت ئیخلاس باڵهکهی تریهتی. نه جهسته بێ ڕۆح دهبێت، نه به یهك باڵ دهتوانین بفڕین و بگهینه شوێنێك.

## ئیخلاس چییه؟

له فهرههنگدا به مانای: "خاوێنکردنهوه و پوختهکردنی ناخی شتێکه له پهرتهوازه بوون و ههموو ئهو شتانهی تر که له بههای کهم دهکهنهوه" دێت، وشهی ئیخلاس له ڕووی زاراوهوه بهم مانایه دێت:

"پاراستنی پەرستش و چاکەیە لە ڕیا و، کردنیانە تەنها لە پێناو خوادا."

لە پێناسەیەکی فراوانتردا ئیخلاس، پاککردنەوەی دڵەکانە لە شیرك و ڕیا و بیروباوەڕی پڕوپوچ و هەستە خراپەکان، وە بە مانایەکی گشتی پاککردنەوەی دڵەکانە لە هەموو خواست و ئارەزووەکانی دەرکەوتن، کردنە ئامانجی هەموو جۆرە چالاکییەکی باش و ڕەچاو کردنیانە تەنها لەپێناو ڕەزامەندی خوادا.[1]

ئەو باوەڕدارەی دەیەوێت ئیخلاس بە دەستبهێنێت، هەموو سامان و کەسێتی خۆی لە ڕیا و دەرکەوتن بە دوور دەگرێت و تەنها و تەنها بەندایەتی بۆ خوا دەکات، هەموو کردەوەکانی لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا ئەنجام دەدات.

﴿ وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ﴾ (البقرة: ١٣٩)

واتە: "ئێمە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە و ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە، ئێمە تەنها خوا ئەپەرستین و عیبادەت بۆ ئەو ئەکەین."

ئەم بەندە دڵسۆزانەی خوا، بە پەرستشەکانیان کە لەپێناو خوادا دەیکەن، نیشانی دەدەن: هەر چەندە نەفسیشیان ئارەزووی نەکات بەم شێوەیە بەردەوام دەبن و لە سوپاسگوزاریکردنی خوا دواناکەون.[2]

پێچەوانەی ئیخلاس بریتییە لە ڕیا، واتە ئەو کردارانەی کە پێویستە لەپێناو خوادا بکرێن، بۆ خۆدەرخستن دەکرێن لە ناو خەڵکدا. پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێت: "بێگومان خوا، هیچ کردەوەیەك قەبوڵ

١. الغزالي، الإحياء، ٤/٣٧٩-٣٨٠.
٢. الاعراف: ٢٩، يونس: ٢٢، لقمان: ٣٢، النساء: ١٤٦، الزمر: ٢، غافر: ١٤.

ناکات کە لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەودا نەبێت."[1]

ئەو باوەڕدارەی بە ئیخلاسەوە ڕوو لە خوا دەکات و پەرستشەکانی بەو مەبەستەوە دەکات، کە فەرمانی خوای گەورەن. وەکو ئەوەی کە پێویستە لە سەری بەندایەتی و پەرستشەکانی خۆی بە پاکی ئەنجامدەدات. بەندەی دڵسۆز، ئەرکەکانی سەر شانی خۆی جێبەجێ ئەکات و تێکەڵاوی ئیشی خوا ناکات. ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (الأعراف: ٢٩) واتە: "بەدڵسۆزییەوە عیبادەتەکانتان لە پێناو ڕەزامەندی ئەودا ئەنجام بدەن و بەندایەتی خوا بکەن."

## ئیخلاس وەک دژە ژەهرێک بۆ ڕیا

کەمێك پێش ئێستا پێناسەیەکی کورتی "ڕیا" مان کرد. دەمانەوێت لێرەدا بە شێوەیەکی تێروتەسەل باسی لێوە بکەین. "ڕیا" بریتیە لە دووڕوویی و ئەنجامدانی پەرستشەکان و کردنی خێر و چاکە لەپێناو خۆدەرخستن. ڕیا، هەڵسوکەوتێکی زۆر مەترسی دارە چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەموو عیبادەت و کردەوە چاکەکان بدرێتەوە بە سەروچاوی کەسەکەدا و بەمانای هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا دێت، کە ئەمەش خوویەکە مرۆڤ بەرەو گەورەترین سزا دەبات.

بە شێوەیەکی گشتی کەم تا زۆر، هەموو مرۆڤێك مەیلی ئەوەی هەیە کە جێی خۆی لە دڵی مرۆڤەکانی تردا بکاتەوە، ناوبانگ بەدەست بهێنێت، خاوەنی پلەیەکی بەرز بێت و سەرنجی کۆمەڵگا بۆلای خۆی ڕابکێشێت.

١. النسائي، الجهاد، ٢٤.

ڕیا سەرچاوەی بەشێکی زۆری ڕەوشتە خراپەکانە و، لاوازترین دەماری مرۆڤەکانە. ئامانجی ڕیاکار کردنەوەی جێی خۆیەتی لە دڵی مرۆڤەکاندا و خۆدەرخستنیەتی بە باشترین شێوە بۆ بەدەستهێنانی ڕێز و پێزانینیان. مرۆڤە ڕیاکارەکان لای خوا کەسانی دزێو و سەرزەنشت کراون. سەبارەت بەم کەسانە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ﴾ (الماعون: ٤ - ٦)

واتە: "وەی لە حاڵی ئەوانەی کەوا نوێژ دەکەن و لە نوێژەکەیان بێ ئاگان (نرخی ئەو نوێژە نازانن کە ئەیکەن. گرنگی پێویست بە نوێژەکە نادەن) عیبادەتەکانیان تەنها بۆ خۆدەرخستن ئەنجام دەدەن."

ڕیاکاری هیچ کاتێك هەڵسوکەوتی باوەڕدار نییە. خوا ڕیاکاریی بە ڕەوشتی "مونافیقەکان" دادەنێت و، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (النساء: ١٤٢)

واتە: "مونافیقەکان، گوایە هەوڵی خەڵەتاندنی خوا دەدەن. کەچی، ئەو، هەڵخەڵەتاندنەکانی ئەوان بۆخۆیان دەگێڕێتەوە. لە کاتی نوێژدا بە تەمبەڵی نوێژ دەکەن، خۆدەرخەرن، زۆر بەکەمی یادی خوا دەکەن."

پێویستە لەسەر موسوڵمانان هیچ کاتێك و بەهیچ شێوەیەك

ڕیاکاری نەکەن. چونکە هەروەك چۆن باران دەبێتە هۆی لەناوبردنی خۆڵ و خاکی سەر تاشەبەردەکان بە هەمان شێوە ڕیاکاری دەبێتە هۆی لە ناوبردنی عیبادەت و خێر و چاکەکان. هۆی ئەمەش ئەوەیە ئەو چاکە و عیبادەتانەی کە دەکرێن، لە جیاتی ئەوەی لە پێناو بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوادا بکرێن، لە پێناو دەرکەوتن لە ناو مرۆڤەکاندا دەکرێن. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە باسی ئەم جۆرە کردارانە دەکات:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ ﴾

(البقرة: ٢٦٤)

واتە: "ئەی ئیمانداران! ئەو کەسانەی کە یارمەتییان دەدەن با بە نیەتی منەتکردن و ئازاردانیان نەبێت و خێرەکانتان بە زایە مەدەن! لە دوا ڕۆژدا، خۆتان مەخەنە ئاستی ئەو کەسانەی کە تەنها لە پێناو دەرکەوتنندا ماڵ و سامانیان دەبەخشن. ئەوانەشی کە بەم جۆرەن، لە خاك و خۆڵی سەر تاشەبەردێکی ساف دەچن کە بە بارینی بارانێك ئەو خاك و خۆڵە ئەخزێت و لەناو دەچێت. ئەوانە هیچ پاداشت و بەخشێشێك وەرناگرن لە پێناو ئەو ئیشانەی کە دەیکەن."

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕیای بە هاوبەشی پەیداکردن چواندووە دەفەرموێت: "خوای گەورە فەرموویەتی هەر کەسێك لە کردار و عیبادەتەکانیدا هاوبەشم بۆ پەیدا بکات (ڕیاکاری بکات)، ئەوا

لەگەڵ ئەوکەسەدا بەجێ دەهێڵرێت کە کردوویەتی بە هاوبەشم. (بێ بەش دەبێت لە پاداشتی کردەوەکانی"[1]

دژە ژەهری ڕیا ئیخلاسە. باوەڕدار هەتا دڵسۆز بێت خۆی دوور دەگرێت لە هەڵدێری ڕیاکاری. یەکێك لە خۆشەویستانی خوا (ئەبول لەیسی سەمەرقەندی) دەڵێت: "حاڵی ئەوانەی کە بێجگە لە ڕەزامەندی خوا، لەبەر مەبەستی تر پەرستش دەکەن، وەکو حاڵی ئەو پیاوە وایە کە کیسەکەی پڕ لە بەردی چەوە و لە بازاڕدایە، وە ئەوانەی کە لە دوورەوە دەیبینن دەڵێن: "چەند پیاوێکی دەوڵەمەندە!" ئەمەش زیاتر لەو قسەیە هیچ سودێکی تری پێ ناگەیەنێت. ئەگەر لە بازاڕ بیەوێت شتێك بکڕێت، کەس بە بەردی ناو کیسەکەی هیچی پێ نافرۆشێت."

ئەوانەی لە ئیخلاس بێ بەشن، ئەوانەن کە بارێکی قورسی بێ سوودیان هەیە، لە ڕوانگەی خەڵکەوە ڕیا کارێکی ناپەسەند و بێ کاریگەرە و لە ڕۆژی دوایشدا ئازار و ئەشکەنجە چاوەڕێیان دەکات.

لەسەر ئەم بابەتە بەسەرهاتێك دەگێڕرێتەوە:

"دەشتەکییەك بەپەلە بەرەو مزگەوت دەڕوات و نوێژێکی بەپەلە دەکات، حەزرەتی عومەر دەیبینێت و، پێی دەڵێت:

- ئەی بەندەی خوا، ئەوە چ جۆرە نوێژکردنێکە؟ ئەڵێی مریشکیت و بە دەنوك دان دەخۆیت، وا باشترە نوێژەکەت دووبارە بکەیتەوە!

پیاوەکە بە هێواشیی نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە.

---

١. مسلم، الزهد، ٤٦.

خەلیفە عومەر سەیری دەکات و دوای نوێژەکە لێی دەپرسێت:

- ئێستا پێم بڵێ، کام نوێژەت بەلاوە جوانتربوو؟

پیاوەکە وەڵامی دەداتەوە:

- نوێژی یەکەم جارم جوانتر بوو.

- بۆچی؟

- چونکە نوێژی یەکەمم بۆ خوا کرد، نوێژی دووەمم لەبەر تۆ کرد."

مرۆڤ دەبێ ئەو کردارانەی ئەنجامی دەدات تەنها لە پێناوی خوادا بیکات، نەك بۆ دەرکەوتن و سەرنج ڕاکێشانی خەڵك، دەبێت سەرنج بداتە فەرز و واجب و سوننەتەکان.

بەڵام ڕیا لە فەرزەکاندا نییە. لە هەر شوێنێك نوێژەکانتان بکەن، ترسی ڕیا لە مێشکتاندا دەربکەن. لەم سەردەمەدا کە هەتا بڵێیت مرۆڤەکان نوقمی بێ ئاگایی بوون پێویستە لە هەر شوێنێك بێت بەبێ شەرم عیبادەتەکان ئەدا بکەن و هۆیەك بن بۆ بەئاگاهێنانەوەی ویژدانی ئەوانەی کە دەیبینن. باوەڕدار لەم حاڵەتەدا بیر لە ڕەزامەندیی خوا دەکاتەوە و ئەوانی تریش گوێ لە دەنگی ویژدانیان دەگرن.

## ئیخلاس ڕۆح و گیانی کردارەکانمانە

چاکەکاری مرۆڤ بەستراوە بە زیندوویی ئەو چاکەکارییەوە. ئیخلاس (دڵسۆزی) ڕۆح و گیانی کردارە. ئیخلاس بەو مانایە دێت

کە هەڵسوکەوتمان بەرامبەر بە خوا وەك بەخشین بێت نەك وەك کڕیار. ئەوەی دەکرێت تەنها لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوادا بێت، بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ شتێکی تر بکرێت.

ئیخلاس تەنها هەوڵدان نییە لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، بەڵکو لە هەمان کاتدا داخستنی هەموو دەرگاکانی دڵە بەسەر هەموو ئەو شتانەی نەفس چاوەڕێیان دەکات.

نموونەیەك لەسەر لەکەداربوونی کردار: "با بڵێین لەگەڵ هاوڕێکانماندا گوێمان لە وتارێك ڕاگرت، بەو بابەتانەی کە باس دەکرێن و بەو نموونانەی کە دەدرێن، دڵمان نەرم بوو و فرمێسك بە چاوماندا هاتە خوارەوە. ئەگەر توانای ئەوەمان هەبێت ئەو فرمێسکانە بشارینەوە، بەڵام ئەم کارە نەکەین تەنها لەبەر ئەوەی هاوڕێکانمان بەم شێوەیە بمانبینن، ئەوا بەم کردەوەیەمان ئەو کردارە جوانە لەکەدار دەکەین."

ئیخلاس بەسەر چەند پلیکانەیەکدا دابەش دەبێت؛ هەر کەس بە پێی پلەی بەندایەتییەکەی ئاسۆیەکی گەشی ئیخلاسی دەست دەکەوێت، پیاوچاکان ئەمەیان بەسەر سێ پلەدا دابەش کردووە.

لە پلەی یەکەمدا، پێغەمبەرانی خوا و هاوەڵانیان دێن، ئەو هاوەڵانەی کە هەرگیز چاوەڕێی پاداشتی ئەم دنیا و ئەو دنیا ناکەن لە بەرامبەر ئیخلاس و دڵسۆزییەکەیان، چاویان تەنها لەسەر بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە و نوێنەرانی ئەو ئاسۆ بڵندەن کە پێگەیشتنی نزیکە لە مەحاڵ

لە پلەی دووەمدا، دۆستانی تری خوا دێن. ئەوانیش لە دونیادا چاوەڕێی هیچ پاداشتێك ناکەن لە هەمبەر دڵسۆزییەکانیان، تەنها ئاواتیان لە قیامەتدا گەیشتن بە بەهەشتی بەرین و دووربوونە لە ئاگری دۆزەخ. ئارەزوویان گەیشتنە بە شادمانی هەتاهەتایی.

بە پلەی سێیەم، ئەوانە دێن کە دڵسۆزیی ئەوانیش هەر لە پێناو خوادایە بەڵام لە دونیاشدا لە هەمبەر ئەو دڵسۆزییەدا چاوەڕێی بڕێك پاداشتن لە خوا بە گوێرەی قەبارەی دڵسۆزییەکەیان. ئەوانەش بێگومان دڵسۆزییان بۆ خۆدەرخستن و ڕیاکاری نییە.

لەو ڕووەوە کە پەیوەستە بە دونیاوە، دەڵێت با بگەم بە چێژی پەرستشەکان، با تامی ئەو چێژە بکەم کە لە هەوڵدان لە ڕێگەی خوادا هەیە، با لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەدا بم کە ڕێنیشاندەرن بۆ ڕێگەی حەق... لەو ڕووەشەوە کە پەیوەستە بە ئاخیرەتەوە، با مردنم ئاسان بێت، گۆڕەکەم وەك باخچەی بەهەشتی لێ بێت، پارێزراوبم لە سزای ڕۆژی مەحشەر... ئەگەر هێشتا لەم بیرکردنەوانەدایت مانای ئەوەیە هێشتا بە جیهانی ڕۆحانی شاد نەبوویت.

بەشی خوێندنەوە

## لە شەڕی نێوان شەیتان و دارفرۆش، کێ سەرکەوت؟

پیاوێك هەبوو ژیانی بە دارفرۆشتن بەڕێدەکرد. بەندایەتی بۆ خوا دەکرد و دەستی لە ئیشی کەس وەرنەدەدا. لە نزیك گوندەکەیان گوندێکی تر هەبوو. خەڵکی ئەم گوندە دارێکیان دەپەرست کە بەلایانەوە پیرۆز بوو و چاوەڕێی یارمەتی بوون لێی. ڕۆژێکیان دارفرۆشەکە وتی: "با بچم ئەو دارە ببڕمەوە کە ئەو خەڵکە لە جیاتی خوا دەیپەرستن. لە بازاڕ دەیفرۆشم و پارەکەی وەردەگرم، وە ئەو خەڵکەش لە یاخیبوون لە خوا ڕزگار دەکەم." بۆ ئەم مەبەستە بەرەو شاخەکە کەوتە ڕێ.

لە ڕێگا چاوی کەوت بە پیاوێکی ناشرین و قێزەون، کابرا لێی پرسی: "بۆ کوێ دەچیت؟"

- دەچم ئەو دارە دەبڕمەوە کە خەڵکی لە بری خوا دەیپەرستن.

پیاوەکە بە دار فرۆشەکەی وت:

- من شەیتانم، ڕێگەت پێنادەم ئەو دارە ببڕیتەوە.

دار فرۆشەکە کە ئەمەی بیست زۆر تووڕەبوو، هێرشی کردە سەر شەیتان و ویستی بە تەورەکەی دەستی بیکوژێت، شەیتان پێی وت:

- تۆ ناتوانیت من بکوژیت، خوا بەڵێنی پێداوم هەتا ڕۆژی دوایی بمهێڵێتەوە. وەرە با ڕێکەوتنێك بکەین، من هەموو ڕۆژێك ئاڵتونێکت دەدەمێ، تۆش واز لە بڕینی ئەو دارە بهێنە. بە تۆ چی خەڵك چی دەپەرستێت و چ گوناهێك دەکات؟! ئاڵتوونی خۆت وەربگرە و، ئیشی خۆت بکە.

دارفرۆشەکە کاتێك ئەمەی بیست وازی لە شەیتان هێنا. شەیتان بە دارفرۆشەکەی وت:

- هەموو بەیانییەك لە خەو هەستایت سەیری ژێر سەرینەکەت بکە ئاڵتونێك دەبینیت.

دارفرۆشەکە وازی لە بڕینی دارەکە هێنا و گەڕایەوە بۆ گوندەکەی. بەیانی کە لە خەو هەستا سەیری ژێر سەرینەکەی کرد و ئاڵتونەکەی بینی، زۆر خۆشحاڵ بوو. بۆ ڕۆژی دواتر بەهەمان شێوە لە خەو هەستا و سەیری کرد هیچ ئاڵتونێك لەژێر سەرینەکەیدا نییە. دارفرۆشەکە کە ئەمەی بینی زۆر توڕەبوو، تەورەکەی هەڵگرت و بەرەو شاخەکە کەوتە ڕێ بۆ بڕینی دارەکە. لە ڕێگا شەیتانی بینیەوە و زۆر بە توڕەییەوە وتی:

- ساختەچی، فێڵت لێکردم!

هێرشی کردە سەر شەیتان، بەڵام ئەمجارە نەیتوانی بە سەریدا سەربکەوێت و دۆڕا. شەیتان پێی وت:

- بەلاتەوە سەیربوو ئەم جارە نەتتوانی وەکو جاری یەکەم سەربکەویت

بە سەرمدا و دۆڕایت؟! با من هۆکارەکەیت پێبڵێم، تۆ دوێنێ لەبەر ڕەزامەندی خوا دەچوویت بۆ بڕینی دارەکە. نەك تەنها من، گەر هەموو شەیتانەکانی دونیا بهاتنایە نەمان دەتوانی بەسەرتدا سەربکەوین. بەڵام ئێستا لەبەر ڕەزامەندی خوا ناچیت دارەکە ببڕیت، بەڵکو لەبەر وەرنەگرتنی ئاڵتونەکەیە. لەبەر ئەمەیە کە ئێستا شکستت هێنا و، منیش بە هیچ شێوەیەك ڕێگەت نادەم ئەو دارە ببڕیت.

بەشی خوێندنەوە

## شەیتان بۆ ئەوەی پەرستشی گەنجێک لە ئیخلاس خاڵی بکاتەوە چی دەکات؟

شەیتان گەورەترین دوژمنی مرۆڤە. هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە کە تووشی دڵەڕاوکێ و دوودڵی بکات لەو کردارانەی ئەنجامی دەدات. یەکێك لەو دڵەڕاوکێیانەی کە تووشی دەکات بریتییە لە "ترس لەوەی کە ئایا ئەو کردارانەی دەیکات ڕیایە یاخود بە دڵسۆزییەوە دەیانکات." وازهێنان لە پەرستشەکان بە هۆی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەوە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و مانای وایە ئەوەی شەیتان ویستی ئەنجاممان داوە.

شەیتان بە یەك جار واز لە مرۆڤ ناهێنێت. بەڵکو ئەو شتانە دەکاتە ئامانج کە پەرستشەکانیان کز بکات و پاداشتیان کەم بکاتەوە. بۆ نموونە، با سەیری شەڕی نێوان شەیتان و گەنجێك بکەین کە دەیەوێت نوێژ بکات:

لە سەرەتادا شەیتان هەوڵی دوورخستنەوەی گەنجەکە دەدات لە پەرستشەکانی. ئەگەر گەنجەکە بەردەوام بێت لە پەرستش کردن، ئەوا شەیتان لە بارەی تەمەنیەوە پێی دەڵێت: "هێشتا گەنجیت، بگەڕێ و بە دڵی خۆت بژی، دوایی پەرستش هەر دەکرێت!"

ئەگەر گەنجەکە هەر بەردەوام بێت لە نوێژکردن، ئەم جارە شەیتان دەڵێت: "جارێ پێویست ناکات دەست نوێژ بگریت، تازە بانگی داوە." کە گەنجەکە دەستنوێژی گرت پێی دەڵێت: "جارێ کاتت زۆر ماوە بۆ نوێژکردن، خەریکی کاری خۆت بە." نیەتی شەیتانەکە ئەوەیە نوێژەکەی درەنگ بکەوێت و فریای نوێژی سوننەت نەکەوێت. بەمەش گەنجەکە لە پاداشتی سوننەتەکانی بێبەش دەبێت، ئەمەش لە قازانجی شەیتانە.

کاتێك گەنجەکە دەستی بە نوێژ کرد، شەیتان هەوڵدەدات بە شتی پڕوپوچ سەرقاڵی بکات، وای لێدەکات ئاگای لە نوێژەکە نەمێنێت یان وا دەکات نوێژەکەی زۆر بەپەلە بکات.

لەگەڵ هەموو ئەمانە، گەنجەکە نوێژەکەی زۆر بە دڵسۆزییەوە دەکات. شەیتان کۆتا هەوڵی خۆی دەدات، وا لە گەنجەکە دەکات کە سەیری چواردەوری بکات، هەوڵدەدات کە گەنجەکە بیر بکاتەوە و بڵێت: "بڵێی کەس هەبێ وەك من بەم جوانییە نوێژ بکات؟!" ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی گەنجەکە بەرەو ڕیاکاریی بەرێت. بەم شێوەیە دووبارە کردارەکە بەتاڵ دەبێتەوە، پاداشتەکەی ون دەکات و شەیتان براوە دەبێت.

هەر هێزێك سەرچاوەکەی لە خواوە بێت هیچ کاتێك توشی نائومێدی نابێت. بەڵام ئەگەر نیەتمان بەرژەوەندی و ڕیاکاری بێت، ئەوا بەپێی نیەتەکانمان بەرامبەرەکەی وەردەگرین. نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە شەیتان فێڵ و تەڵەکەی بۆ هەموو کەسێك هەیە، جا ئەو کەسە لە هەر

ئاستێکدا بێت. ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە بیزانین ئەوەیە ئاگاداری فێڵەکانی شەیتان بین و خۆمانی لێ بپارێزین و پێیان نەخەڵەتێین.

## بەدیعوززەمان چۆن باسی ئیخلاس دەکات؟

مامۆستا سەعیدی نوورسی دەربارەی ئەم بابەتە دەفەرموێت: "ئەی خەڵکینە دەتانەوێ ئەم ژیانە کاتییە، کورتە، بێ سوودە، بگۆڕن بۆ ژیانێکی درێژ و بەسوود و میوەدار؟ با لە ڕێگەی ڕاستییەکی هەمیشەییدا بەکاری بهێنین، نەك لە ڕێگەی ڕاستییەکی کاتی. هەموو مرۆڤێك زۆر بە پەرۆشییەوە تەمەنێکی درێژی دەوێت، عاشقی مانەوەیە، وە مادەم چارەیەك هەیە بۆ گۆڕینەوەی ئەم تەمەنە فانییە بۆ تەمەنی هەمیشە زیندوو (باقی)، کەواتە ژیان بەسەربردن لە تەمەنێکی درێژدا دەتوانرێت بەرجەستە بکرێت. هەڵبەتە مرۆڤێك کە مرۆڤایەتی خۆی لەدەست نەدابێت بەدوای ئەو چارەیەدا دەگەڕێت و هەوڵدەدات ئەو هەلە بە کردار بەرجەستە بکات و بۆ سەرکەوتن دەکەوێتە جووڵە. بێ گومان ئەو چارەیە ئەمەیە: "لە پێناو خوادا ببیستین، لە پێناو خوادا ببینین، لە پێناو خوادا هەوڵبدەین. لە ژێر دروشمی (لله، لوجه الله، لأجل لله) هەموو جووڵەیەکمان لەم بازنەیەدا بێت". ئەو کاتە هەر خولەکێك لە تەمەنی ئێوەدا وەك ساڵێك لە تەمەن فەرمانڕەوایی دەکات."

بۆ ئەوەی باوەڕدارێك بتوانێت هەم لە ژیانی ئاینداری و هەم لە خزمەتکردنیدا ئیخلاس بە دەست بهێنێت پێویستە ئەو دەستەواژە و یاسا

و ڕێگایانەی کە مامۆستای گەورە بەدیعوززەمان لە پەیامی ئیخلاسدا ئاماژەی پێداون پەیڕەو بکات.

باوەڕدار دەبێت ئامانج و کرداری ڕەزامەندی پەروەردگار بێت، بێجگە لەمە نابێت هیچ مەبەستێکی تری هەبێت. پێویستە ئەو برا و خوشکانەی کە لەسەر یەك ڕێگادان و بەیەکەوە هەنگاو دەنێن، ڕەخنە لە یەکتری نەگرن و کەس خۆی لەوی دی بە گەورەتر نەزانێت، هەمیشە نهێنیی برایەتی (أخوة) بکەن بە سەرمەشق و شان بە شانی یەکتر بڕۆن، بەچەشنی ئەوەی گەر سێ ژمارە "یەك" لە تەنیشت یەکەوە بنوسرێت ئەوا دەکاتە سەد و یازدە (١١١)، واتە گەر سێ کەس لە تەنیشت یەکەوە لە پێناوی پەروەردگار بۆ هەمان بانگەواز هەوڵبدەن هێندەی (١١١) کەس توانا و هێزیان دەبێت. هێز و توانا لە ئیخلاسدایە، شکاندنی سوپایەکی (٩٠) هەزار کەسیی دوژمن لەلایەن تەنها (٣) هەزار موسوڵمانەوە لە (غەزای مؤتة)دا و، ڕزگارکردنی "ئەندەلوس" لەلایەن سوپایەکی (٥) هەزار کەسیی موسوڵمانەوە بە سەرکردایەتی تاریقی کوڕی زیاد (خوا لێی ڕازی بێت) کە توانیان (٩٥) هەزار کەس بشکێنن، تەنها نهێنی ئەم سەرکەوتنانە ئیخلاس بوو. لە مێژوودا گەلێك ڕووداوی جۆراوجۆر هەن، کە باس لەوە دەکەن ئەو کۆمەڵە کەسانەی کە بیر و باوەڕیان وەك یەك بووە، گەرچی ژمارەیان کەم بووە بەڵام توانیویانە ئەو حەشاماتە زۆرانەی کە بیر و باوەڕیان هاویەش نییە و لە یەك ناچێت ببەزێنن و بیانشکێنن. هەروەك چۆن لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە:

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةَۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٤٩)

واتە: "وتیان: ئەمڕۆ لەبەر زۆری ئەوانە و کەمی ئێمە، لە وزە و تواناماندا نیە بەرامبەر بە جالووت و لەشکرەکەی بوەستین و بجەنگێین ئەوانەیان یەقینیان بوو بە دیداری خوا دەگەن، گوتیان: گەلێ جار بەفەرمانی خوا کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون، واتە: زاڵبوون وسەرکەوتن بەژمارەی زۆر و کەم نیە، بەڵکو هەر بەئیرادە و فەرمانی خوایە خوا هەمیشە لەگەڵ دەستەی بە ئارام و خۆڕاگرانە، هەردەم پشتگیریانە"

بەدیعوززەمان ئەم حاڵەتە بەم شێوەیە ڕاڤە دەکات: "ئەو دە کەسەی کە بەڕاستی یەکیانگرتووە، هەر یەکەیان دەتوانێت بە چاو و گوێی براکانی تری ببینێت و ببیستێت. واتە هەر یەکەیان ئەوەندە هێزی مەعنەویی و نرخی دەستگیر دەبێت، وەك ئەوەی کە بە بیست چاو سەیر بکات و بە دە ئەقڵ بیر بکاتەوە و بە بیست گوێ ببیستێت و بە بیست دەستیش کار بکات."

**پێویستە خزمەت کردنی ئیسلام بە ئیخلاس و دڵسۆزییەوە بکرێت. پێویستە وەك هاوەڵانی پێغەمبەر لە خزمەتدا لە پێشی پێشەوە و لە پاداشتدا لە دواوی دواوە بین. هەر سەرکەوتنێکمان بەدەست هێنا بە لوتفی خوای بزانین و خۆمان هاوبەش نەکەین لەو سەرکەوتنانەدا. چونکە هەوڵدان بۆ خۆبردنە پێشەوە و خۆدەرخستن لە پێش چاوی خەڵکیدا لە کاتی خزمەت کردندا، مرۆڤ دەخاتە ناو شیرکی پەنهانەوە.**

## ئەو دەستوور و بنەمایانەی لە پەیامی ئیخلاسدا هاتوون چین؟

بەدیعوززەمان لە بارەی پەیامی ئیخلاسەوە دەڵێت: "پێویستە بە لایەنی کەمەوە ١٥ ڕۆژ جارێك بخوێنرێتەوە." بەدیعوززەمان لە سەرەتای بریسکەی (٢١) دا بە مەبەستی چاندنی تۆوی ئیخلاس لە ناخماندا (٤) بناغەی خستووەتە ڕوو. ئێمەش لێرەدا یەك بە یەك لێیان دەکۆڵینەوە:

یەکەم، ڕەخنە نەگرتن لەو کەسانەی خزمەت دەکەن لەبەر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا:

بە پشت بەستن بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کە دەفەرموێت: "باوەڕداران وەك یەك جەستە وان" ئەو کەسانەی خزمەتی ئیمان و قورئانی پیرۆز دەکەن وەك یەك جەستە وان و بە کارگەیەك دەیانچوێنێت. هەر وەك چۆن ئەندامەکانی مرۆڤێك ململانێ لەگەڵ یەکتریدا ناکەن و ئامێرەکانی کارگەیەك یەکتر تەواو دەکەن، سەبارەت بەوانەش کە لەبەر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا خزمەت دەکەن، ململانێ کردنیان لەگەڵ یەکتریدا کارێکی ڕاست نییە و ناڕەوایە. چونکە لە دەرەنجامی ئەم هەڵوێستە جەستەی مرۆڤەکان تێکدەچێت و کارگەکەش بێسوود و زەرەرمەند دەمێنێتەوە. هەروەها بێبەش دەبن لەو هێزە مەعنەوییەی کە لە ئیخلاسدا هەیە. بە پێی بیروڕای بەدیعوززەمان (دڵسۆزی ڕاستەقینە ئەوەیە کە هەستی برایەتی و خۆشەویستی بڕوێنێت لەگەڵ ئەو کەسەی کە بە ڕکابەر دادەنرێت و بە سیفەت و کردارە جوانەکانی ئەوەوە شانازی بکات). لەم ڕووەوە دەفەرموێت:

”ئاگاداربن هیچ کاتێك لەناو خۆتاندا دەرگای ڕەخنەگرتن لە یەكتری مەكەنەوە چونكە زۆر شتی تر هەیە لە دەرەوەی بازنەی برایەتییەكەی ئێوەدا كە پێویستە ڕەخنەی لێ بگیرێت.“

دووەم، ڕەچاو كردنی دۆستایەتی و برایەتی و هاوڕێیەتی كردن لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا:

بەدیعوززەمان ئاماژەی بەوە داوە پێویستە مرۆڤی خزمەتكاری قورئان شانازی بكات بە چاكەكاری و تایبەتمەندیی براكانییەوە و سەربەرز بێت بە سەربەرزییان. بنچینەی خۆشەویستی ئەهلی تەصەوف بۆ پێغەمبەر و بۆ شێخەكانیان لە ژێر دروشمی (الفناء في الرسول) و (الفناء في الشیخ) بەیەكەوە بەستراون. لە بەرامبەردا بەدیعوززەمان وا بیردەكاتەوە خزمەتكارانی قورئانی پیرۆز دەبێت بنچینەی خۆشەویستییان لەسەر بنەمای (الفناء في الإخوان) بێت. واتە: "لە بیرچوونەوەی هەموو هەستێكی نەفسانی خود و ژیان تەنها لەپێناو سیفەتەكانی براكانماندا".

سێیەم، ڕەچاوكردنی ڕەزامەندیی پەروەردگار لە كردارەكاندا:

مامۆستا بەدیعوززەمان كاتێك ئەم خاڵەی ڕوون دەكردەوە بە هاوڕێكانی خزمەتی فەرموو: ”دەبێت لە كردارەكانتاندا تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورە بوونی هەبێت، ئەگەر مرۆڤێك بە هۆی كردەوەیەكەوە خوا لێی ڕازی ببێت، هەموو دونیاش دەنگی لێ دابڕێت هیچ گرنگییەكی نییە، ئەگەر خوا كردەوەیەكی قەبوڵ كرد، هەموو خەڵك بەرپەرچی بدەنەوە هیچ كاریگەرییەكی لەسەر نابێت. ئەگەر خوای گەورە ڕازی بوو لە شتێك و، پاشان لەگەڵ دانایی ڕەهای

خۆیدا گونجا، واش لە خەڵکی دەکات قەبوڵی بکەن و ڕازی بن لێی. لەبەر ئەوە ئەم خزمەتە تەنها و تەنها دەبێت لەبەر ڕەزامەندیی خوا بێت و بەو نیەتەوە بکرێت. چونکە بنەمای وەرگیرانی هەموو کردەوەیەکی چاك و پەرستشێك تەنها دڵسۆزییە''

بەدیعوززەمان لەم بابەتەدا ئەو شتەی کە زۆر لێی ترساوە ئەوەیە لە کاتی خزمەتکردنی ئیماندا گەر بە ڕێژەیەکی کەمیش بێت هەوڵی ڕەزامەندیی مرۆڤەکان بدرێت لە بری ڕەزامەندیی پەروەردگار. هەر بۆیە لە زۆربەی پەیامەکانیدا جەخت لەسەر ئەم بابەتە دەکاتەوە و قوتابییەکانی ئاگادار دەکاتەوە. تەنانەت زۆرێك لەو نامانەی کە لەلایەن کەسانی ترەوە هاتوون و پیاهەڵدان و ستایشی تێدایە سەبارەت بە شەخسی مامۆستا خۆی، بەدیعوززەمان لە ترسی زامدارکردنی ڕەزامەندیی خوای گەورە، قەبوڵی نەکردوون، یاخود ئەو ستایشانەی ڕووکردووەتە پەیامەکان و بە ناوی ئەوانەوە وەریگرتوون. یاخود هەندێ تێبینی لەسەر نووسیوە و ڕاستیان دەکاتەوە. لە نامەیەکدا یەکێك لە قوتابییەکانی بۆی نوسیوە و دەڵێت: ''مامۆستای ئازیز، خزمەتەکانت بگاتە ئاسمانەکان و ناویشت لە داستانەکاندا بنووسرێت.'' بەدیعوززەمان لەبەرامبەر ئەم پێزانین و پیاهەڵدانەدا دەفەرموێت: ''من هاوبەشی ئەم هەستانەی ئەم برایەم ناکەم، ڕەزامەندی پەروەردگارم بەسە. ئەگەر ئەو یار و یاوەر بێت هەموو شتێك یار و یاوەرە، ئەگەر ئەو یار و یاوەر نەبێت هەموو دونیا چەپڵەت بۆ لێبدات فلسێکی قەڵب ناهێنێت. ئەگەر ستایش و نرخشناسیی خەڵك لە کاروبارەکانی سەر بە دوارۆژدا ببێت

بە هۆکاری خزمەتەکە، ئەوا وەرناگیرێت و پووچەڵ دەبێتەوە. ئەگەر پێمان خۆش بێت و بەلامانەوە چاك بێت، ئیخلاس لەناودەبات. ئەگەر پاڵپێوەنەر و بەخشەری چێژ و خۆشیش بێت، ئەوا ڕوونی ئیخلاس لێڵ دەکات"

چوارەم، هەست کردن بە هێزی مەعنەوی ئیخلاس:

مامۆستا بەدیعوززەمان دەفەرموێت: "دەبێت هەموو هێز و توانایەکتان لە ئیخلاس و حەقەوە سەرچاوە بگرێت." بە گوێرەی ئەو، ئیخلاس و لەسەرحەق بوون لە هەر بابەتێکدا بێت خۆی لە خۆیدا هێزە. ئیخلاس هێز دەبەخشێت بە مرۆڤ و کۆمەڵگەکان. تەنانەت خراپکاران لە ڕێگای خراپەکاریدا بەهۆی ئەو ئیخلاس و دڵسۆزییەوە کە دەینوێنن، هێزێکی زۆر گەورە بەدەست دەهێنن، چونکە بۆ ئەوەی بگەیت بە سەرکەوتن هەم سیفەتەکان و هەم هۆکارەکانیش گرنگن. بۆ نموونە، گەر لە کافرێکدا سیفەتی موسوڵمانانە هەبوو و لە موسوڵمانێکیشدا سیفەتێکی کافرانە هەبوو، ئەوا لە دەرئەنجامدا کافرەکە بە هۆی سیفەتە باشەکەیەوە بەسەر موسوڵمانەکەدا سەردەکەوێت.

مامۆستا بەدیعوززەمان بەمەبەستی دەرخستنی ئەو هێزەی کە لە ئیخلاسدایە، خزمەتەکەی خۆی بە نموونە دەهێنێتەوە. ئەو خزمەتەی بە درێژایی بیست ساڵ کە لە شاری وان و ئیستانبوڵ و بەیارمەتی هەزاران قوتابی و یاریدەدەر بە ئەنجامی گەیاندووە، لە حەوت هەشت ساڵی تەنیایی و ڕەهەندەییدا لە گوندی بارلا و بە تاقی تەنیا توانیویەتی سەد قاتی ئەوەی پێشوو خزمەتی ئیمان و قورئان بکات. لەم بارەیەوە

دەفەرموێت: "من لێرە لە بارلا تەنیا و ئاوارە و نیمچە نەخوێندەوارم و لە ژێر چاودێری و فشاری کارمەندانی دەوڵەتدام. کەچی دەبینم ئەم خزمەتەی کە لە ماوەیەکی کورتی حەوت هەشت ساڵیدا لێرە جێبەجێمان کرد، سەدان جار سەرکەوتووتر بووە لە خزمەتەکانی پێشووم. هیچ گومانێکم نەما کە هۆکاری ئەم سەرکەوتنە ئەو هێزە مەعنەوییەیە کە لە ئیخلاسی ئێوەوە سەرچاوەی گرتووە."

بە گوێرەی مامۆستا، ئەو کەسانەی کە خاوەنی دڵسۆزین بایەخێکی تایبەتیان پێ دەدرێت لە لایەن پەروەردگارەوە. هێزی ئیخلاس و دڵسۆزی هەمیشە دەبنە هۆکاری ڕاکێشانی بەزەیی خوای گەورە. هەر لەبەر ئەمە لە زۆر شوێندا سەبارەت بە خۆی و قوتابییانی نوور دەفەرموێت: "لەم خزمەتەدا خراوینەتەکار". ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوانەی خاوەنی دڵسۆزی و ڕاستگۆیین لە لایەن خوای گەورەوە کار و ئەرکی خزمەتی ئیمان و قورئان دەخرێتە سەر شانیان. بەدیعوززەمان سەرنجمان بۆ لای قوتابییەکی نوور بە ناوی "سولەیمان" ڕادەکێشێت کە لە بەرامبەر هەموو خزمەت و هەوڵێکدا هیچ شتێکی ماددی وەرنەگرتووە و قەبوڵی نەکردووە. ئەمەش سەرنجی بەدیعوززەمانی ڕاکێشاوە و دەفەرموێت: "چونکە خزمەتی ئەم قوتابییە پاك و بێگەرد و ڕوونە و تەنها لەپێناو ڕەزامەندی خوا کردوویەتی، ئەوا لەلایەن خوای گەورەوە خراوەتەکار".

بەشی خوێندنەوە

## بەڵێ، ئەمەش ئیخلاسی ئەو شوانەیە!

خوای پەروەردگار (عَزَّوَجَلَّ)، ئادەمیزاد لە بەڵا و ناخۆشییەکان دەپارێزێت لەسەر بنەمای ئیخلاس و دڵسۆزییەکەی. یەکێك لە قوتابییەکانی مامۆستا بەدیعوززەمان ناوی "سولەیمان"بوو، کاتێك چای بەسەر ئامادەبوواندا دابەش دەکرد، مامۆستا لێی پرسی: "سولەیمان تۆ هیچ چوویتە زیندانەوە؟" سولەیمانی ڕاستگۆش دەڵێت: "ئێمە تا ئێستا بەشداری ئەو خێرە نەبووین مامۆستام." بەدیعوززەمان وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "بەهۆی ئیخلاسی تۆ و خولوصیەوە ئەرکەکەمان لەسەر لابرا".

مامۆستا بەدیعوززەمان دەفەرموێت: "پێویستە بزانن کە هەموو هێز و تواناتان لە ئیخلاستاندایە، خوای گەورە ئەو دوعایانە گیرا دەکات کە بە ئیخلاسەوە دەکرێن. ئەو کەسانەی کارەکەیان بە دڵسۆزییەوە ئەنجام دەدەن سەرکەوتوو دەبن".

ڕووداوێك ئەم ڕاستیە بە شێوەیەکی زۆر جوان ڕوون دەکاتەوە:

"لە شارێك مەیخۆرێك دەمرێت، ئیمامی ئەو ناوچەیە بە خەڵکەکە ڕادەگەیەنێت کە نوێژی جەنازە نەکەن لەسەری. خانمەکەی ئەو

مەیخۆرەش مێردەکەی دەدات بە شانیدا و ڕوودەکاتە شاخەکان. لە ڕێگادا تووشی شوانێك دەبێت. داوای یارمەتی لە شوانەکە دەکات و بەیەکەوە تەرمەکە بە خاك دەسپێرن. خانمەکە لە شوانەکە دەپرسێت گەر بتوانێت دوعاشی بۆ بکات. شوانەکەش دەڵێت من دوعا نازانم بەڵام دەست بەرز دەکاتەوە و لەژێر لێوەوە یەك دوو ڕستە دەڵێت و کۆتایی بە دوعاکەی دەهێنێت.

خانمەکە دەگەڕێتەوە ماڵەوە. پاش ماوەیەك ئیمامی گوند و چەند کەسێکی تریش لە خەونیاندا مردووەکە لە بەهەشتدا دەبینن، خەڵك بە لایانەوە سەیر دەبێت. ئەم باسە دەبێتە دەنگۆیەکی گەورە لە ناوچەکەدا و هەموو کەس باسی دەکات. هەمووان بەدوای هۆکارەکەیدا دەگەڕان. لە ئەنجامدا ڕۆشتنە لای ژنەکە و لێیان پرسی: "مێردەکەت چۆن ناشت، لە کوێ ناشتتان؟" ژنەکەش زۆر بە سادەییەوە هەرچی هەبووە و نەبووە باسی دەکات و، دەڵێت: "من هیچ شتێکم نەکردووە، هەرچی هەیە هەمووی دوعای ئەو شوانەیە".

"خەڵکەکەش دەڕۆن بۆلای شوانەکە و دەپرسن: "دوای ناشتنی پیاوەکە نزایەکت کردووە، ئەو نزایە چی بوو؟" شوانەکەش دەڵێت: "وتم خوایە گیان هەرکەسێك بە ئێرەدا تێپەڕیبێت بە میوانی خوام داناوە و لە بوخچەکەم تێرم کردووە و لە شیریش تینوێتیم شکاندووە. ئێستاش میوانێك بۆ لای تۆ دەنێرم. دەسا خوایە گیان بە شکۆمەندی خۆت میوانداری لێ بکە."

بەڵێ، ئەمەیە دڵسۆزی شوانەکە لە نزاکەیدا! دڵسۆزی، شتە دوورەکان

نزیك دەکاتەوە و کەمەکان زۆر دەکات و شتە بێ بایەخەکان بایەخدار دەکات. بۆنموونە، ئەو کاتەی سوڵتان سولەیمان بڕیاری دروست کردنی مزگەوتی "سولەیمانیە"ی دا یارمەتی وەرگرتنی لە خەڵکی بێگانە قەدەغە کرد. ئافرەتێکی پیر پەرداخێك ماستاوی دا بە کرێکارێکی مزگەوتەکە لە کاتی ئیشکردندا، لە خەودا بینراوە ئەو پەرداخە ماستاوە لە تای تەرازوودا لە تەواوی مزگەوتەکەی سوڵتان سولەیمان قورستربووە. حیکمەتی ئەمەش تەنها و تەنها ئیخلاسە.

## ڕێگاکانی دەستەبەرکردن و پاراستنی ئیخلاس چییە؟

بەدیعوززەمان لە پەیامی ئیخلاسدا دوو هۆکاری سەرەکی باس دەکات کە دەبێتە هۆی بەدەست هێنان و پارێزگاری کردنی ئیخلاس. یەکەم هۆکار بریتییە لە (بیرکردنەوە لە مردن). دووەم هۆکار بریتییە لە (ژیان لە حزووری پەروەردگاردا). لە ڕاستیدا گەر ئەم دووخاڵە بزانرێت و لە ژیانی ڕۆژانەدا کاری پێ بکرێت، دەتوانرێت وا لە مرۆڤەکان بکات ئیخلاس بە دەست بهێنن لەلای پەروەردگار، وە پەروەردگار ئەم نهێنییەی نێوان خۆی و بەندەکانی لە دڵیاندا دەڕوێنێت.

کورتکراوەی باسەکەمان بە گوێرەی مامۆستا بەدیعوززەمان: "مرۆڤ بە ئیمانی تەحقیقی و بەو بریسکانەوانەی کە لە بیرکردنەوەی ئیمانیی دەربارەی بەدیهاتووانەوە هاتوون ئامادەیی و هێمنیی دڵ بە دەست دەهێنێت."

ئەم تێڕامانەش وا لە خاوەنەکەی دەکات کە بەدیهێنەری بناسێت،

ئیتر ئارامی و هێمنی دەڕژێتە دڵیەوە. وا لە مرۆڤ دەکات هەمیشە بیر لە حزووری بەدیهێنەری بەسۆز و بینینی ئەو بکاتەوە. واتە خوای گەورە هەمیشە ئامادەیە و چاویشی لێیەتی. ئیتر ئەو کاتە ئاوڕ لە غەیری ئەو ناداتەوە و هێز و کۆمەکیش لەو نەبێت لە کەسی تر وەرناگرێت. چونکە سەیرکردن و ئاوڕدانەوە بۆلای غەیری خوا ئەدەبی حزوور و هێمنیی دڵ کەم دەکاتەوە. بەمەش مرۆڤ لە ڕیا ڕزگاری دەبێت و خۆی لێ دادەماڵێت، ئیتر پشت بەخوا ئیخلاسی دەستگیر دەبێت.

بەگوێرەی ئەم ئاماژەیەی سەرەوە بۆ ئەوەی هەستی چاودێری لەلایەن پەروەردگارەوە لە مرۆڤێکدا دروست ببێت، پێویستە پێشتر برەو بە هەستی بیرکردنەوە بدات. بەڵێ، هەموو کەسێك ناتوانێت درك بەوە بکات کە خوای مەزن بە زانین و توانینی خۆی دەتوانێت لە هەموو شوێنێك ئامادەبێت و هەموو شتێك ببینێت. هەر لەبەر ئەمەیە ناتوانێت بە تەواوەتی تێبگات لەوەی کە خوای گەورە زانایە بە سەر کردار و گوفتار و ئەو شتە نهێنییانەشدا کە بە دڵدا تێدەپەڕن.

هەستکردن بە چاودێریی پێویستە وا لە مرۆڤ بکات، دڵنیابێت کە یەکێك هەمیشە و بەردەوام چاودێری دەکات. ئەوانەی ئیخلاسیان بەدەست هێناوە و ئەو باوەڕدارانەی دەیانەوێت بیپارێزن، پێویستە بزانن خوای گەورە هەمیشە دەیانبینێت و بە هەستی چاودێریکردنەوە ژیان بەرنە سەر. چونکە ئەم تێگەیشتنە وا لە مرۆڤ دەکات کە کاریگەری لە سەر کردار و گوفتار دروستبکات. ئەوانەی خاوەنی ئەم بیرکردنەوەیەن

ژیانیان بەم ئاڕاستەیە دەبەنە سەر: "مادەم خوای گەورە هەموو کاتێك ئێمە دەبینێت و مادەم ئێمە هەمووکات لە بەردەم ئەوداین و ئەو لەگەڵ ئێمەدایە. کەواتە دەبێت بیرکردنەوەکانمان، هەڵسوکەوتەکانمان و هەموو وشەکانمان لەگەڵ ڕەزامەندی ئەودا یەك بگرنەوە و بگونجێن. واتە مادەم خوای گەورە هەموو کات ئاگادار و بینەرە بەسەر ئێمەوە کەواتە نابێت هیچ قسەیەك و کردەوەیەك بکەین کە جێی ڕەزامەندیی ئەو نەبێت. چونکە کاتێك خوای گەورە لێمان ڕازی بوو، ئیتر ڕازی بوون یان نەبوونی خەڵکی دیکە هیچ بایەخ و گرنگییەکی نیە."

کەسێك دوای ئەوەی خوا لێی ڕازی بوو هەموو خەڵك بەرپەرچی بدەنەوە هیچ کاریگەرییەکی نییە. کاتێك پەروەردگاری مەزن ڕەزامەندی لەسەر بوو، گەر ویستی لەسەر بێت و بە گوێرەی دانایی خۆی، ئەوا بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ داوای بکەیت، ئەو وا لە کەسانی تر دەکات قەبوڵی بکەن و بەدڵیان بێت. چونکە نابێت ڕاستەوخۆ مرۆڤ داوای بە دڵبوونی کەسانی تر بکات و شوێن ڕازی کردنی دڵی خەڵکی بکەوێت.

کاتێك مرۆڤ بەو هەستەوە دەژی کە یەکێك چاودێریی دەکات ئەوا بە هۆی ئەم هەستەوە گەورە دەبێت، دڵی پاك دەبێتەوە، دڵی بێجگە لە خوای گەورە دادەخرێت بەڕووی هەموو شتێکی دیکەدا، کەسێك کە خاوەنی دڵێکی ئاوەهایە، هەموو هەنگاوەکانی بە وریاییەوە دەنێت و تەنانەت ترسی لە خواردنی پاروویەکی حەرامیشە لە ژیانیدا. بیر و ئەندێشەی ڕۆژی دوایی ناهێڵێت خەمسارد بێت. هەستی بەرپرسیارێتی و جددییەت دەبێتە پارچەیەکی جیا نەبووەوە لە ژیانیدا

و بەردەوام بەرهەڵستی ئەو بیر و ئەندێشە نامۆ و چەپەڵانە دەکات کە دێنە ناو دڵ. بێگومان پەروەردگار ئەم هەوڵ و تێکۆشانە بێ بەرامبەر جێناهێڵێت و دڵیان پڕدەکات لە ئیخلاس.

کاتێك مرۆڤ بە تەواوەتی لە واتای چاودێری پەروەردگار دەگات، دەتوانێت ژیانی لە هەموو جۆرە شتێکی ناڕەوا و پیس و ناحەز بەدوور بگرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە دڵەکان لە هەموو هەست و بیرێکی ناشرین پاك بکرێنەوە، ئینجا دەتوانێت دڵی پڕبکات لە ئیخلاس. باوەڕدار لە هەر ئاست و پلەیەکدا بێت پێویستە هەموو کاتێك پارێزگاری لە دڵسۆزی خۆی بکات. وە نابێت گرنگی بدات بەو بەربەستانەی دێنە بەردەمی. دەبێت بزانێت کە شەیتان هەموو کاتێك دەیەوێت لەم ئەرکە پیرۆزە دووری بخاتەوە.

بۆ پاراستنی ئیخلاس پێویستە هەردەم ئەوەمان لەیاد بێت کە هەمیشە خوای گەورە چاودێرە بەسەرمانەوە و، پشت بە شتانی کاتی نەبەستین و، بزانین کە کۆتایی ڕێگەکەمان مردنە و، هەردەم لە خەمی زیادکردنی چاکەکانماندا بین.

## ئایا پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا لەسەر ئەو پەرداخە شیرەی کە لە دەستشۆرەکەدا ڕشتم لێم دەپرسێتەوە؟

کاتێك دەوترێت لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەم بیر دەکەوێتەوە، ئەوەی ئەم ڕووداوەی بەسەر هاتووە مامۆستایەکی هاوڕێمانە، بۆمان دەگێڕێتەوە:

"سەرەتای سالانی مامۆستایەتیم بوو لە یەکێك لە خوێندنگە ئامادەییەکاندا، مانگی پیرۆزی ڕەمەزان هات زۆربەی زۆری خوێندکارانی خوێندنگاکەمان بەڕۆژوو بوون. ئەوانەی لە حانوتی خوێندنگاکەماندا کاریان دەکرد سەریان سوڕمابوو. چونکە ئەم ڕێژەیە بەلای ئەوانیشەوە زۆر بوو، ئەو خواردنانەی بۆ خوێندکارەکانیان هێنابوو بیفرۆشن لە بۆرەك و لەفە و ساردی و ماستاو...هتد هەموو وەك خۆی مابوویەوە. ئەو خوێندکارانەی بەڕۆژوو نەدەبوون گەرچی ڕێژەیان کەمیش بوو بەڵام لە بەردەم خوێندکارە بەڕۆژووەکاندا هیچیان نەدەخوارد و نەدەخواردەوە.

بەیانییەك لە ڕێگابووم بچم بۆ ناو پۆلەکەم لە ڕاڕەوەکەدا خوێندکارێکی کچم دی، لێم نزیك بوویەوە و، پرسی: "مامۆستا

دەتوانم پرسیارێك بکەم؟" منیش وەڵامم دایەوە و، وتم:

- فەرمووو کچی خۆم چی دەپرسی؟

کچەکەش بە چاوی پڕ ئەسرین و خەمبارییەوە سەیری کردم و، پرسی:

- مامۆستا من بە دزی دایکم و باوکمەوە بەڕۆژوو دەبم، بەڵام دایکم هەستی پێکردووم، بۆیە ئەم بەیانییە پەرداخێك شیری پێدام و وتی بیخۆرەوە و برۆ بۆ خوێندنگا. منیش هەر کە دایکم سەرقاڵ بوو هەلێکم بۆ ڕەخسا، ڕۆیشتم پەرداخە شیرەکەم ڕشتە ناو دەست شۆرەکە و، بە دایکمم وت خواردوومەتەوە. ئێستا مامۆستا تۆ بڵێی خوای گەورە حسابی ئەو پەرداخە شیرەم لێ بپرسێتەوە لە ڕۆژی دواییدا؟

لە پەشۆکاویدا نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە، لەوە دەچوو منیش هەمان ئەو پرسیارە لەخۆم بکەم. دەکرا من پرسیارەکەم بکردایە. تۆ بڵێی لە ئاست ڕووداوێکی ئاوادا بەدیهێنەری خاوەن ڕەحمەتی ڕەها حسابی ئەو پەرداخە شیرەم لێ بپرسێ؟"

## ٧. ئازار، ژان، ئارامگرتن، بەردەوامی و پاشگەزبوونەوە

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾

(البقرة: ٢١٤)

واتە: "ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانە و ناخۆشی)؟! مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی شەڕ و نا خۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بەڕادیەك، هەتا پیغەمبەرەکەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا، دەیانوت: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟! ئیتر کەی خوا یارمەتی دەنێرێت؟! ئاگاداربن و دڵنیابن بەڕاستی یارمەتی خوایی زۆر نزیکە."

## ئازار و ژان چییە؟

ئازار و ژان، تاکە ڕێگای گەیشتنن بە ئامانجی گەورە و تاکە هۆکاری بە دەستهێنانی ئەنجامی مەزنن. بە چیلەکێشیی، گوناهەکان دەشۆررێنەوە و مرۆڤ پاك دەبێتەوە. ئەو شوێنەی ڕەنجی لێ نەبێت ناتوانرێت باسی کامڵ بوونی مرۆڤ و کرانەوەی ڕۆحیی لێ بکرێت.

هەموو پەیامە گەورەکان و ئامانجە بەرزەکان، دووچاری ناڕەحەتی و ئازار و بەشێك لە مەحروومبوون هاتوون. هیچ کام لە ڕاستی و ئامانجە گەورەکان، تا شوێنکەوتووانی ناڕەحەتی نەکێشن و تووشی هەندێك بێبەش بوون نەبن، بە دەست نایەن.

## پەیام، ئازار و ژانی دەوێت

خزمەتکردن بە ئیسلام و سەرکەوتن لەم ڕێگایەدا، هەمیشە بە هەمان شێواز بووە و لە پێناویدا هەزاران ناڕەحەتی و ڕەنج کێشراوە. پێغەمبەرانی پێشین و گەلەکانیان باشترین بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە هەمیشە ڕێگای خوا ناڕەحەتی و ئازار و ژانی تێدایە.

بۆ نموونە، لە قورئانیشدا وەکو ئەوەی باسکراوە، ئەگەر ئەو وتانەی کە گەلەکەی بە حەزرەتی نوحیان (عَلَيْهِ السَّلَام) دەوت بە هەر یەکێك لە ئێمە بوترێت لەسەر شەقامەکان، و بەو شێوەیە ڕووبەڕووی سووکایەتی ببینەوە، لە خەفەتا پارچە پارچە دەبین. حەزرەتی نوح کە یەکێك بووە لە پێنج پێغەمبەرە گەورەکە، هەموو ڕۆژێك دەرگا بە دەرگا گەڕاوە و

لە دەرگایانی داوە و فەرموویەتی: "بڵێن (لا إله إلا الله) با ڕزگارتان ببێت" کەچی گەلەکەی هەندێك جار کەوتوونەتە سەری و لێیانداوە، بەرد و خۆڵیان پێداکردووە، هەندێك جاریش بێ ویژدانانە سوکایەتییان پێکردووە.

ئەگەر سەیری ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) بکەین، لە ژیانی ئەویشدا دەتوانرێت ببینرێت تووشی چەندەها نارەحەتی گەورە بووە. کەوتنە ناو ئاگر و، بردنی هاوسەرەکەی و بەجێهێشتنی لە شوێنێکی چۆڵ و پەنابردنە بەر قوربانیکردنی کوڕەکەی.

ئوممەتەکەی حەزرەتی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام) کە دوازدە کەس بوون، یەکێکیان خیانەتی لێدەکات. تەنانەت قەومەکەی چواردەوری ماڵیان داوە و لەگەڵ یەکتری پێشبڕکێیان کردووە بۆ ئەوەی پێغەمبەرەکەیان لە سێدارە بدەن.

دواجار پێغەمبەرەکان (عَلَيْهِمُ السَّلَام) هەر ڕەنجیان کێشاوە. بۆیە یونس ئەمرە دەڵێت:

ڕێگا درێژ و قۆناغ زۆر دوورە
گوزەری نییە و ئاوی زۆر قووڵە

ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری بکەین، ئەو کەسەی لە ڕێگای ڕاستدا دەڕوات، دەبێت ئامادەی هەموو نارەحەتی و ناخۆشییەك ببێت. ئەو باوەڕدارەی ئامانجی گەیاندنی ڕاستی بێت بۆ ئەو دڵانەی کە پێویستییان پێیەتی، لە سەرەتاوە دەبێت ڕازیی بێت بەو نارەحەتییانەی

بەسەری دێن لەو ڕێگەیەدا، باش بزانێت کە دەبێت ئارام بگرێت و دان بەخۆدا بگرێت و ڕازیی بێت.

## ئارامگرتن چییە؟

ئارامگرتن، دان بەخۆدا گرتنی مرۆڤە بەرامبەر هەموو ناڕەحەتی و قورسییەك، بەرگەگرتنە بەرامبەر ئەو بابەتانەی کە دڵمان پێیان خۆش نییە. هاوار نەکردن و چاوەڕوانکردن و دان بەخۆداگرتنی ئەو کەسەیە کە دەرد و بەڵا ڕووی تێدەکات.

مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە نێرراوەتە ئەم دونیایە. لە سایەی ئەم تاقیکردنەوەیەدا تواناکانی گەشە دەکەن، بەم جۆرە دەبێت بە شایەنی ئەوەی کە بنێررێت بۆ بەهەشت و ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنێت و جوانیی پیرۆزی خوای گەورە ببینێت. تێپەڕاندنی ئەم ناخۆشی و ناڕەحەتییانەی کە لە ڕێگەی تاقیکردنەوەکەدا تووشی هاتوون، تەنها بە ئارامگرتن دەبێت.

ئارامگرتن ئیماندار دەگەیەنێت بە ئاسۆی نزیکیی لە خوا و یەکێکە لەو سیفەتە ئەخلاقییانەی کە بەختەوەرمان دەکات و دەمانگەیەنێت بە مزگێنی پەروەردگار. پێوەری ڕاستگۆیی موسوڵمان لەگەڵ خوای خۆیدا ئارامگرتنە، لە جێیەك ئارامگرتن نەبێت ڕاستگۆییشی لێ نییە.

خوای گەورە پەیمانی داوە کە بێگومان بۆ جیاکردنەوەی ئارامگران لەوانی دی، مرۆڤەکان تاقیدەکاتەوە و، مژدەی داوە بە ئارامگران

و، هەواڵی پێداوین کە ڕەزامەندیی ئەو بۆ ئەوانەیە ئارام دەگرن و، بێشومار پاداشتی ئارامگران دەداتەوە.

ئارامگرتن، لە ناخی دڵەوە ڕازی بوون بەو موڵکانەی خوایە کە لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئێمەی داناوە. ئارام نەگرتنیش ناڕەزایی و سەرپێچییە. لە بناغەی هەر جۆرە سەرکەوتنێکی ماددی و مەعنەویدا ئارامگرتن هەیە، لەبەر ئەوە کلیلی هەموو جۆرە ڕزگاربوونێك ئارامگرتنە.

## چەند جۆر ئارامگرتن هەیە؟

بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نورسی ئارامگرتن دەکات بە سێ بەشەوە:

١) ئارامگرتن بەرامبەر بە گوناهەکان: موسوڵمان ئارامگرتن نیشان دەدات بەرامبەر هەموو گوناهە بزوێنەرەکان و هەوڵ دەدات توشی گوناه نەبێت.

٢) ئارامگرتن بەرامبەر بە پێشهاتە ناخۆشەکان: ئەم جۆرە ئارامگرتنە، ئارامگرتنە بەرامبەر هەموو ئەو بەڵا و موسیبەتە ماددی و مەعنەوییانەی کە بەسەر ژیانماندا دێن.

٣) ئارامگرتن بەرامبەر خواپەرستی: پەرستشەکان بە ڕووکەش قورس و گرانن. وەکو هەموو ڕۆژێك پێنج فەرزە نوێژ کردن، لە ڕۆژە ساردەکانی زستاندا دەست نوێژ گرتن بە ئاوی سارد، ڕۆژووگرتن لە ڕۆژە درێژەکانی هاویندا. موسوڵمان دەبێت بەرامبەر پەرستشەکان دان بە خۆیدا بگرێت بۆ ئەوەی بەهەشت بەدەست بهێنێت.

جۆرێکی تری ئارامگرتن، ئارامگرتنە بەرامبەر جوانییە سەرنج ڕاکێشەکانی دونیا. ئەم ئارامگرتنە بۆ موسوڵمانەکانی ئەم سەردەمەمان دارای تایبەتمەندییەکی گرنگە. بەداخەوە زۆربوونی پێداویستییەکانی ژیان بەو ڕادەیەی ئێستا وەك (ئۆتۆمبێل، ماڵ، خانووی هاوینە، خانووی زستانە و هتد..)مرۆڤەکان دوور دەخاتەوە لە بیرکردنەوە لە ڕۆژی دوایی. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴾ (آل عمران: ١٤)

واتە: "ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زێڕ و زیوی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و (هۆکاری هاتووچۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری کشتوکاڵ بۆ خەڵکیی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی ناز و نیعمەتی ژیانی دونیان، خوای گەورەش (جَلَّ وَعَلَا) (بۆ چاکەکاران) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادە کردووە (کە بەهەشتە)"

لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئەم ڕاستییە ئاماژەی پێدراوە و وتەی "ڕازێنراوەتەوە" دووپاتی دەکاتەوە کە مەحاڵە مرۆڤەکان بەرامبەر جوانییەکانی دونیا چاویان بەر شەوارە نەکەوێت و هەڵنەخەڵەتێن. تێپەڕاندنی ئەمانە پێویستی بە ئیمانێکی بەهێز و ئارامگرتنێکە کە هەموو کات ئەم ئیمانە بە زیندوویی بهێڵێتەوە.

ئارامگرتن له سەر ئەوەی خەڵکی بێباکن بەرامبەر پایە مەعنەوییەکان. لەکاتی خزمەتکردن لە ڕێگەی خوای گەورەدا، تەنانەت ئەگەر دەرگاکانی بەهەشت لەسەر پشتیش بن، دەبێت دان بەخۆدا بگرین و لەم دونیا پڕ لە چەرمەسەرییەدا بمێنینەوە، ئەمەش جۆرێکی ترە لە جۆرەکانی ئارامگرتن.

بەشی خوێندنەوە

## ئارامگرتن و چەند پێوەرێکی زێڕین

١) ئارامگرتن وەکو گیایەکی تاڵ وایە ئازارەکان دادەمرکێنێتەوە. هەم گیانت ئازار دەدات و هەم شیفات پێدەدات.

٢) هەموو ناڕەحەتییەك بە ئاسانکارییەك سکپڕە، بەڵام دەبێت لە ماوەی سکپڕیدا ئارام بگرین.

٣) ئارامگرتن و سەرکەوتن ئەگەرچی لە ڕووکاردا جیاوازن، بەڵام دووانەن.

٤) دەریاکان لە دڵۆپە ئاوەکانەوە دروست دەبن، بەڵام تێکدانی زەمەنی بەدەریابوونی دڵۆپەکان لە توانای هیچ کەسێکدا نییە.

٥) زۆرترین شتێك کە لە خەرمانی پەلەکردندا بوونی هەبێت، هەڵەیە.

٦) ئەگەر شتێك هەبێت سەرەتاکەی ژەهر و، کۆتاییەکەشی شەکر و شەربەت بێ، ئەوە ئارامگرتنە.

٧) ئارامگرتن، هەڵوێستی ئەرێنییە بەرامبەر ڕووداوەکان.

## سەرکەوتن ئارامگرتنی پێویستە

پێویستە مرۆڤی پەیامدار واز نەهێنێت لە بەرامبەر ئەو ناڕەحەتییانەی دێنە ڕێی، پێویستە ئەم ناڕەحەتییانە وەك پێویستییەکی کارەکەی ببینێ، بەربەستەکان بە چەند هەلێك بزانێت بۆ پەرەپێدان بە توانا و لێهاتنەکانی. ئەوەی دەیەوێ بە سەرکەوتن بگات پێویستە خۆی بۆ کارەکەی تەرخان بکات، ئامانج و پەیامەکەی خۆشبوێت، تەنانەت عاشقی ببێت. با ئەوە لە بیرنەکەین، شەقکردنی بەرد بەهۆی هێزی دڵۆپە ئاوەکانەوە نییە، بەڵکو لە بەردەوامییەکەیانەوەیە. هەروەها پێویستیی بە پێداگیریی و سوور بوون و خۆشەویستیی هەیە.

بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ بەربەستەکاندا پێویستە چاو لە هەندێك لە ناڕەحەتییەکان بپۆشرێت، چونکە ئەوەی تووشی ئێش و ئازار نەبێ سەرکەوتوو نابێت. ئەوەی دەیەوێت سەرکەوتوبێت دەبێت پەند و عیبرەت لە نموونە جوانەکان وەربگرێت.

کاتێ کە "ئیبن سینا" قوتابی بوو، لە بیرکاریدا باش نەبوو، لەبەر ئەوە واز لە خوێندنگە دەهێنێت و بەرەو وڵاتەکەی خۆی ڕێ دەگرێتە بەر. ڕێیەکی زۆر دەبڕێت و تینوی دەبێت، دەچێتە سەر بیرێك و سەتڵەکە شۆڕ دەکاتەوە بۆ ناو بیرەکە.

کاتێك سەتڵەکەی ڕاکێشا بینی پەتەکە مەڕمەڕەکەی داخوراندووە، بەخۆی دەڵێت: "یەك پەت دەتوانێ مەڕمەڕێ دابخورێنێ، کەچی من ناتوانم بیرکاری فێرببم؟" دواتر بڕیار دەدات بگەڕێتەوە خوێندنگە، زۆر هەوڵدەدات و بەرامبەر ناڕەحەتییەکان ئارام دەگرێت، لە ئەنجامدا دەبێتە

زانایەکی ناسراو لە دونیادا لە بواری زانست و فیکردا.

یەکێك لە دۆستانی خوا "ئەبول حەجاجی ئەقصەری" دەڵێت: "پشیلەیەك ڕێبەریی کردم" وە سەبارەت بەمە ڕوونکردنەوەیەك دەدات بۆ ئەو کەسانەی گاڵتەیان پێ دەهات. دەڵێت:

"لە یەکێ لە شەوەکانی زستاندا، هێشتا خەوم لێنەکەوتبوو، لە دەرەوە دەسوڕامەوە. بینیم پشیلەیەك هەوڵیدەدا بەسەر ستوونێکدا سەربکەوێت کە چرایەکی پێوە ڕاگیرکرابوو، ستوونەکە خلیسك بوو، هەڵدەخلیسکاو نەیدەتوانی سەربکەوێت و دەکەوت، دەیان جار هەوڵی دا. کاتێك لە مزگەوت گەڕامەوە بینیم پشیلەکە سەرکەوتووە و لە تەنیشت چراکەوە دانیشتووە. خۆڕاگری و سووربوون لەوەوە فێربووم".

نارەحەتییەکان وا لە مرۆڤ دەکەن بگەڕێت بە دوای چارەسەردا و بە ئاگای دێننەوە و دەیخەنە جووڵە. بەربەست و لەمپەڕەکان کاتێك کە تێدەپەڕێنرێن، چێژ و خۆشی بە مرۆڤ دەبەخشن و هانی دەدەن بۆ ئامانجی نوێ.

بەشی خوێندنەوە

## ئێش و ئازارێک کەوتە ناو گوێچکەماسییەکەوە

گوێچکەماسییەك ژیانێکی سادە بەڵام خۆشبەختی هەبوو. لەسەر بەردێك لە قوڵایی دەریادا خۆی جێگیرکردبوو و ژیانی بەڕێدەکرد. لە ئاوی سوێری دەریادا خواردنی خۆی دەدۆزییەوە و، بەرگە ڕەقەکەشی لە دوژمنەکانی دەپاراست. بەشێکی زۆری کاتەکانی بە سەیرکردنی ماسییەکانی دەوروبەرییەوە بەسەردەبرد.

ڕۆژێك تووشی ئێش و ئازارێك دەبێت لە ناوەوەیدا، ئەو ئازارەی ناو لەشی ژیانی ئارام و هێمنی ئەوی برد و لە جێگەیدا ڕۆژانێکی ناڕەحەت و ئازاراوی بۆ هێنا. زۆری نەبرد گوێچکەماسییەکە هۆکاری ئازارەکەی بۆ دەرکەوت: "دەنکە لم"ێکی بچووك بە هەر شێوەیەك بووبێت چووەتە ناو لەشیەوە و بە ئازارەوە دەیتلێنێتەوە.

ڕۆژێك گوێچکەماسییەکە دەستی بە بیرکردنەوە کرد کە چی لەو دەنکە لمە بکات. دەیزانی پرسیارەکانی چەشنی: "ئەم ناڕەحەتییانە بۆ بەسەر مندا هات؟، چۆن وام لێهات؟" بێ سوودن، بەڵکو باشترین شت ئەوەیە کە هەوڵبدات لەگەڵ میوانە نەخوازراوەکەیدا بژی.

ئەم بڕیارە ئازارەکانی گوێچکەماسی بە تەواوەتی لەناو نەبرد، بەڵام

کەمی کردەوە. چونکە ئەگەر سکاڵای بکردایە، ئەو ناڕەحەتییانەی چەندین ئەوەندە زیادیان دەکرد. ڕۆژان و مانگان و ساڵان هات و ڕۆیشت، ئێش و ئازارەکانی گوێچکەماسییەکە بەرەو نەمان دەچوو، لە ئەنجامدا بوو بە گوێچکەماسییەك کە هەمووان چێژیان لە سەردانکردنی دەبینی.

چونکە ماوەیەکی دوورودرێژ بە ئازاری ئەو دانە لمەوە ژیانی بەسەر برد و بە ئارامگرتن دەنکە لمەکەی گۆڕی بە مرواریییەك. زیندەوەرەکانی دەوروبەری جار جار دەهاتن بۆ سەردانی، کاتێك بەرگەکەی دەکردەوە بەو پەڕی سەرسامییەوە تەماشای دەنکە مرواریییەکەی ناویان دەکرد.

بەڵام ئەوان لە شتێك تێنەگەیشتن: "ئایا مرواریییە جوانەکە گوێچکە ماسییەکەی جوان کردبوو، یان گوێچکە ماسییەکە کە بووبوو بە نموونەی بەرجەستەی ئارامگرتن و مرواریییەکەی جوان کردبوو"، ئێوە دەڵێن چی؟

## ئەزیەت نەما نەیکێشم، ئازار نەما نەیچێژم

کەسی خاوەن پەیام بەرامبەر ڕووداوەکان بێ چەمینەوە و کۆڵدان بەردەوامی بە ژیانی دەدات. ئەمەش ڕێز و وەفا و ڕاستگۆیی ئەو نیشاندەدات بەرامبەر پەیامەکەی. پێش ئەوەی زانای گەورە "سەید قوطب" لە سێدارە بدرێت داوایان لێکرد کە لە سەرۆکی ئەو کاتە "جەمال عەبدولناصر" داوای لێبوردن بکات بەرامبەر لێخۆشبوونی لە فەرمانی لەسێدارەدان. بەڵام سەید قوطب ڕازی نابێت و بەرامبەر ئەم داوایەیان دەڵێت:

"ئەگەر ئەم لە سێدارەدانە حەق بێت، من بەم حەق و بڕیارە ڕازیم، وە ئەگەر ئەم بڕیارە ناحەق بێت، من نزم نابمەوە بۆ داوای لێبوردن کردن لەناحەق".

پێشەوا و زانایان لە ژێر بەڵا و موسیبەتدا خزمەتیان بە پەیامەکەیان کرد. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، بە هۆی بیر و بۆچوونەکانیەوە، بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ زیندانی کرا، وتی: "داواکارم خوای گەورە هیدایەتی ئەو کەسانە بدات کە قامچییان لێ دەدام" کاتێك لە زینداندابوو، بەرهەمێکی نایابی بە ناوی "المسند" نووسی.

ئیمامی "سەرخەسی" کە یەکێکە لە ئیمامە گەورەکانی مەزهەبی حەنەفی، لە ناو بیرێکدا بەند دەکرێ، بۆیە قوتابییەکانی دەهاتن بۆ لێواری بیرەکە و لەوێ وانەی پێدەوتنەوە، وە لە ناو بیرەکەدا بەرهەمێکی سی بەرگیی بە ناوی "المبسوط" نووسی.

تەماشاکەن مامۆستا بەدیعوززەمان ئەو ئازار و ناڕەحەتییانەی چەشتوویەتی چۆن باس دەکات: "ئەزیەت نەما نەیکێشم، هیچ ئازارێك نەما نەیچێژم، دەمبینی لە مەیدانی جەنگدا وەك کەسێکی تاوانبار مامەڵەم لەگەڵ دەکرێت، وڵات بە وڵات وەك سەرسەرییەك بە پیادەیی دووردەخرامەوە، لە زیندانی وڵاتەکەمدا بە چەندین مانگ چاوپێکەوتنیان لێ قەدەغە دەکردم، چەندین جار ژەهراوی کراوم، ڕووبەڕووی چەندین سوکایەتی دەبوومەوە، زیاتر لە هەزاران جار داوای مەرگم کردووە لە ژیانمدا. ئەگەر ئاینەکەم منی لە خۆکوشتن قەدەغە نەکردبا، لەوانەبوو ئەمڕۆ سەعید لە ژێر خاکدا ڕزیبایە و ڕۆشتبایە.

سروشتم بەرگەی زیللەت و سوکایەتی پێکردن ناگرێت، نەفسبەرزی و چاونەترسی ئیسلامیم منی بە توندی لەم حاڵە قەدەغە کردووە.

ئەگەر لەم بارودۆخە بیربکەینەوە کێ لە بەرامبەرمدایە با بێت، حەزئەکەی با ستەمکارترین دەسەڵاتدار بێت، تەنانەت ئەگەر خوێنڕێژترین دوژمن فەرماندەم بێت تەنازول ناکەم. ستەم و خوێن ڕێژییەکەی دەدەمەوە بە ڕوویدا، ئیتر یان دەمخاتە زیندانەوە یان دەمخاتە سەر مێزی سێدارە، هیچ گرنگ نییە بۆم. لە ڕاستیشدا هەروابوو ئەمانە هەموویم بینی. دڵ و ویژدانی ئەو فەرماندە خوێنڕێژە کەمێکی تر بەرگەی ستەمکردنی بگرتایە، سەعید ئەمرۆ هەڵواسرابوو.

بەم شێوەیە ژیانم هەمووی لە ناو زەحمەت و موسیبەت و تەنگ و چەڵەمەدا بەسەر برد. لەپێناو ئاسوودەیی و سەلامەتی باوەڕی کۆمەڵگەکەم، نەفس و دونیای خۆم فیداکرد. گەردنیان ئازاد بێت، دوعای خراپیان لێناکەم، چونکە بوونە هۆی ئەوەی پەیامەکانی نوور بتوانن باوەڕی هەزاران و ملیۆنان کەس ڕزگار بکەن. بە مردن تەنها خۆم ڕزگار دەکرد، بەڵام بە مانەوەم لە ژیاندا و بەرگەگرتنی زەحمەت و ناخۆشییەکان توانیم بە ڕزگارکردنی باوەڕی چەندین کەس خزمەتێك بکەم. هەزاران جار سوپاس بۆ خوا".

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "باوەڕدار وەك بەرهەمێکی سەوز وایە کە ڕەشەبا بە بەردەوامی دەیجوڵێنێتەوە، بەڵام لە جێی خۆی وەستاوە. (بەڵا و موسیبەتەکان باوەڕداران دەجوڵێننەوە، بەڵام دەوەستن لە بەرامبەریان).

حاڵی موناﻓیقەکانیش وەك دارێکی ڕەقی ئەستوور وایە کە ناجووڵێتەوە تا بە تەواوی دەیبڕنەوە."[1]

باوەڕ و ئارامگریی بەڵا و موسیبەتەکان سووك دەکەن. ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێنا و تەسلیمی بوون، بەڵا و موسیبەتەکان بە پێویستییەکی ڕێگەکەیان دەبینن.

لە بنکەیەکی پۆلیسدا ئەوەندە لە یەکێك لە قوتابییانی نوور دەدەن هەتا دەبورێتەوە، کاتێك بە هۆش خۆی دێتەوە، نزا دەکات و دەڵێت: "خوایەگیان، لێیان خۆشبە، ئەوان نازانن." ڕێك وەك پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کە بەرامبەر ئەو ناڕەحەتی و ئازارانەی قەومەکەی لە "تەوحود" دا بەرامبەری کردیان، دەفەرموێت: "خوایە هیدایەتیان بدە، ئەوان نازانن!"

ئەوانەی لە دونیا ئازار و ناڕەحەتی بەسەریاندا دێت، میوەکانی بەهەشتیان دەدرێتێ لە بەرامبەردا، کاتێك ئەمە دەبینن دەڵێن: "خۆزگە خەم و ناخۆشی زیاترمان بەسەردا هاتبایە"

---

١. مسلم، صفة المنافقين.

## هۆکاری سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکاندا
## ئارامگری و خۆڕاگرییە

باوەڕداران بە درێژایی ژیان لە ناو تاقیکردنەوەدان، هۆکاری سەرکەوتنیش لە تاقیکردنەوەکان ئارامگری و خۆڕاگرییە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ٢٠٠)

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە خوا، خۆ ڕاگربن لە ئاست هەموو ناخۆشی و سەختییەکاندا، لە خوا بترسن تاوەکو سەرکەوتوو بن"

ئەگەر بیروباوەڕێك ناڕەحەتی و ژانی لەپێناودا نەکێشرابێت، نابێت بە پەیام و بانگەواز. ئەوەی بیروباوەڕ دەکات بە پەیام، ئازار و ناڕەحەتییەکانە. سەرکەوتنی پەیامێك بەبێ چەشتنی ئێش و ئازار نابێ، باوەڕداران بە ئارامگرییەوە ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمە ناوەختەکان دەبنەوە و ناشڵەژێن. ئەوان پیاوی ڕۆژە قورسەکانن، ئەوان هەڵشێلران لەگەڵ ئازارەکان بە چارەنوسیان دەزانن، وەکو یونس ئەمرە دەڵێت، مەنزڵ بە مەنزڵ ڕێگا دەبڕن.

ڕێگا درێژ و قۆناغ زۆر دوورە
گوزەری نییە و ئاوی زۆر قووڵە

کەسی پەیامدار، بە پلەی عاشقبوون بە پەیامەکەیەوە بەستراوەتەوە،

به ڕازیبوونی هەموو ئەو ناخۆشییانەی لە لایەن خۆشەویستەکەیەوە دێن، ڕاستگۆیی خۆی نیشان دەدات و، دەڵێت:

بێت لە جەلالت جەفا
یاخود لە جەماڵت وەفا
هەردووکیان بۆ گیانم صەفا
هەم قەهرت خۆش، هەم لوتفت خۆش

پێغەمبەر (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "لە بەهەشتدا کۆمەڵە کۆشکێك هەن کە لە بەشی سەرەوە بە هیچ شتێکەوە نەبەستراونەتەوە لە خوارەوەشیدا لەسەر هیچ پایەیەك ڕاگیر نەکراون." لێیان پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا خاوەنەکانیان چۆن دەچنە ناویەوە؟" پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) فەرمووی: "ئەوان وەك باڵندەکان دەچنە ناویەوە و لێی دێنەدەر."

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم کۆشکانە بۆ کێن؟

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) فەرمووی: "بۆ ئەوانەیە کە لە کاتی تووشبوونیان بە نەخۆشی و ناڕەحەتی و ئازار و بەڵاکان ئارام دەگرن."

داوا لە ئیمامی ئەبو حەنیفە دەکرێ کە ببێتە قازی، بەڵام ئەو بەم داوایە ڕازی نابێت و ئەوانیش لە بەرامبەردا ئەشکەنجەی دەدەن. دایکی ئیمام دەڵێت: "ئاخ کوڕم، زانستەکەت لە ئازار و ناخۆشی زیاتر هیچی تری بۆ نەهێنایت."

ئیمامیش دەڵێت: "خەفەت مەخۆ دایەگیان، ئەوان دەیانەوێت دونیام بدەنێ، منیش دوارِۆژم دەوێت. بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سزای دوارِۆژ نەبمەوە، ئەشکەنجەکانی ژیانی دونیا قەبوڵ دەکەم."

## سەرکەوتن دوو مەرجی هەیە، دامەزراوی و یادی خوا

پەروەردگارمان لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الأنفال: ٤٥)

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك لەگەڵ کۆمەڵێك لە بێباوەڕاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە، زۆر بەچاکی خۆتان ڕابگرن و ناوی خواتان لەبیربێت و پشت بەو ببەستن، بەڵکو سەرکەوتووبن."

دامەزراوی بە مانای ئارامگرتن نایەت. هەرچەندە ئێمە وەك دوو وشەی هاومانا بەکاریان دێنین، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دوو واتای جیاوازیان لەخۆ گرتووە. ئارامگرتن بە مانای بەردەوامبوون دێت لە کارێکدا تا کۆتاییەکەی بە بێ وەستان و بچڕان. بۆ نموونە خۆڕاگرتنی بەکار هاتووە بەرامبەر عیبادەت و گوناهـ و موسیبەتەکان، بەڵام وشەی دامەزراوی، بە ماناکانی سووربوون، خاوەن قسەی خۆ بوون و بیرکردنەوە و بڕیاردان لەسەر شتێك و پاشگەزنەبوونەوە لێی، دێت. دامەزراوی بنەمایەکی ڕەوشتییە و یەکێکە لە سەرچاوەکانی ڕەوشت بەرزیی. دامەزراویی وا لە مرۆڤ دەکات، کە لە سەرەتادا

زۆر بە جوانیی بیربکاتەوە لەو کارەی کە دەیکات، لە شوێنی خۆیدا شتی گونجاو هەڵدەبژێرێت و هەرگیز جارێکی تر پاشگەز نابێتەوە لەو بڕیارەی کە داویەتی. دامەزراویی نیشانەیەکی گرنگی ئیرادەیە و خەسڵەتێکی زۆر بەنرخی مرۆڤانەیە. ئەم جۆرە کەسانە خۆشی و ناخۆشی و بەرژەوەندی و تەنانەت ئەندێشەی خزمەتکردنیش، لە کارەکەیان پاشگەزیان ناکاتەوە.

لە بەردەوامی ئایەتەکەدا ئەم مانایە هاتووە: "گەر مرۆڤ لە دۆخە هەرە قورس و لە حاڵەتە هەرە نالەبارەکاندا دڵی پڕبێت لە ئیمان، خوا زوو یان درەنگ سەریدەخات، بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ لەم حاڵەتە هەستیارانەدا یادی خوای بیربکەوێتەوە، پێویستی بەو زیکر و یادانە هەیە کە لە کاتە ئاساییەکاندا کردوویەتی". خۆی لە خۆیدا سروشتی مرۆڤ وا دروست بووە لە کاتە ناڕەحەتەکاندا دەڵێت (الله). لەبەر ئەوە لە ڕاستیدا تەنیا وتنی (الله) لە کاتە ناڕەحەتەکاندا گرنگ نییە. بەڵکو دەبێ زیکری خوا بکەین بە بەشێك لە سروشتمان و هەمیشە لە ناو کەش و هەوای بیرکردنەوەدا بین.

ئایەتە پیرۆزەکە بە (لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) کۆتایی دێت، کەواتە هۆکارەکانی سەرکەوتن بریتین لە دامەزراویی و یادکردنی خوا.

بەشی خوێندنەوە

## خۆڕاگریی، نەک پاشگەزبوونەوە

• دۆزینەوەی حەقیقەت و دڵ پێدانی چەندە گرنگە، بەوەفابوون و دامەزراوی لەو ڕێگەیەدا لە دوای دۆزینەوەشی ئەوەندە گرنگە و پێویستە هەستیارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لە ڕاستیدا ئەوەی لە ڕۆحیدا گەیشتبێت بە ڕووناکی حەقیقەت، بە ئاسانی ئاراستە و ڕێگەی خۆی ناگۆڕێت. ئەوانەی شەو و ڕۆژ میحرابی خۆیان دەگۆڕن یان کۆمەڵێك چارەڕەشن، کە ڕاستییان نەدیوەتەوە یان بێ هەستن و درك بە نرخی حەقیقەت ناکەن.

• ئەو بەختەوەرانەی دڵیان کردووە بە کەنار بۆ دەریای حەقیقەت و بە شەوق و ئارەزوویەك کە هەرگیز تێر نابێت، ئەو شەپۆلانەی لەو دەریایەوە دێن، لە سینەیاندا دەتوێننەوە و دەڵێن: "ئایا زیاتر هەیە؟!" ئەوان گەڕانیان تەواو کردووە و میحرابیان دۆزیوەتەوە و ڕۆحیان ئارامی گرتووە. بەڵام ئەوانەی بەردەوام شەپۆلەکان دەیانهێنێت و دەیانبات، یان شێوازی گەڕان نازانن یان گەڕان و دۆزینەوەیان تێکەڵ بە یەك کردووە. تەنها ئەوانەی دەگەڕێن دەیدۆزنەوە، تەنها ئەوانەش دۆزیویانەتەوە کە لە جێی

خۆیان دەمێننەوە. ئەو سەرگەردانانەی گومان دەکەن کە دۆزیویانەتەوە لە ڕاستیدا بە درێژایی ژیان لە شوێنی خۆیاندا دەسووڕێنەوە.

• هەرجۆرە هەڵاتنێك، سەرەتا مرۆڤ بەرامبەر بە ویژدانی خۆی، دواتر بەرامبەر بە مێژوو و نەوەکانی داهاتوو، مەحکوم دەکات. بەم شێوەیە بە پێچەوانەی ئامانجەکەی خۆیەوە زللەی لێ دەدرێت. لە هەموو پەیامێکی مەزندا مانەوە لە سەنگەردا نیشانەی پاڵەوانێتییە. ئەگەر لە کوێوە با هات لەوێوە شەن بکەن و بەندەی نەفسبن، لەمە تێناگەن و نایانەوێت تێبگەن، مرۆڤێك بە ڕاستی مرۆڤ بێت، دوای ئەوەی بۆ یەك جار لە حەقیقەت گەیشت، ئیدی نە "بەرژەوەندییەکان" دەتوانن زنجیری بکەن و، نە "ترس" ڕێگەی پێدەگرێت و، نە "شەهوەت" دێتە سەر ڕێی. ئەو بەسەر هەموو ئەمانەدا تێدەپەڕێت، وەك ئەوەی باڵی گرتبێت.

• لە خزمەتێکدا، ئەوانەی هەمیشە بیرکردنەوە و شوێنیان دەگۆڕن، هەم بڕوا و متمانەیان بە خۆیان نامێنێت هەم دەبنە مایەی بێهیوابوونی هاوەڵانیان. وەك چۆن ئەگەر کەسێك لە کۆمەڵێك دەربچێت کە بە چوست و چالاکی و خۆشەویستییەوە کارەکانیان ڕادەپەڕێنن دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕیزیان و شێواندنی برایەتییان، بەهەمان شێوە دەرچوونی کەسانێك لەکۆمەڵێك کە لە دەوری پەیامێك کۆبوونەتەوە، دۆستان نوقمی خەم دەکات و دوژمنانیش غەرقی خۆشی.

• ئەوانەی زوو زوو بەڵێن و پەیمان دەشکێنن متمانەیان بە خۆیان

نامێنێت، ڕۆژێك دێت وردە وردە دەچنە ژێر کاریگەریی کەسانی دیکەوە. بە تێپەڕبوونی کات ئەم کەسانە هەموو کەسایەتییان لە دەست دەدەن. ئیدی دەبنە ماکێکی زیانبەخش بۆ خۆیان و کۆمەڵگەکەیان.[1]

## دەبێت لاوانی ئەم ڕۆژگارە بەرامبەر بە چی زیاتر ئارام بگرن؟

ئەو باوەڕدارەی شەرەفی خزمەتکردنی ئیسلامی پێ بڕابێت و شانی دابێتە ژێر ئەم خزمەتە پیرۆزە، ئەگەر موسوڵمانانە بژی و ببێت بە نموونەیەکی جوان بۆ دەوروبەری وەك مرۆڤێك وایە لە چەرخی بەختەوەریدا.

فەرموودەیەکی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکات کە ئیماندارێکی لەم جۆرە هەر چاکەیەکی بە دە چاکە بۆ هەژمار دەکرێت. گەر گەنجانی ئەمڕۆ لە بەرامبەر ئەم هەموو هۆکارانەی، کە ئارەزووە ئاژەڵییەکان دەوروژێنن خۆی ڕابگرێت و نەلەرزێت و، بە ئەندازەی یەك لە دەی ئەوەی هاوەڵە بەڕێزەکان کردیان بە موسوڵمانیی بژی، ئومێدەوارین لە خوای گەورە کە خێر و پاداشتێکی زۆری دەست بکەوێت.

ئەرکەکانی لاوانی موسوڵمانی ئەم سەردەمە گەلێك زۆرن. پێویستە لە بیرمان نەچێت کە یەکێك لە سێ جۆرەکەی ئارامگری، ئەوەیە کە مرۆڤ بەرامبەر بە گوناهـ و تاوانەکان خۆی بە دوور بگرێت. لەم ڕۆژگارەماندا ئەم جۆرەی ئارامگری زۆر گرنگە. پێویستە لە

١. موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن، پێوانە یاخود ڕووناکییەکانی سەرڕێ.

بەرامبەر شاڵاو و شەپۆلی گوناهەوە دان بە خۆماندا بگرین و دامەزراو بین.

لە ئێستادا زۆر هۆکار هەیە کە گەنجان بەرەو زینا و دزی و مادده هۆشبەرەکان پاڵ پێوەدەنێن. بەڵام ئەگەر گەنجەکانمان ئارام بگرن، بەم ئارامگرییە پاداشتیان دەست دەکەوێت.

گەنجەکانمان پێویستە ڕەچاوی بنەماکانی ئیسلام بکەن لە ژیانیاندا و، ئەوەندەی لە توانایاندا هەیە خۆیان لە گوناه و ناوەندە خراپەکان بە دووربگرن. پشت بە خوا لاوێکی لەم شێوەیە دەبێت بە میراتگری هاوەڵە بەڕێزەکان.

بەشی خوێندنەوە

## ڕۆحە هەستیار و ڕۆحە بێ هەستەکان

کاتێك هەستە باڵاکانی چەشنی ترس، ئومێد، ڕێز و خۆشەویستی ڕۆحی ئیماندارێکی دڵسۆز دەتەنن، ئەو دڵۆپە ئاوانەی لە چاویەوە دێنە خوار، پێیان دەوترێت فرمێسك. ئەو کەسەش کە بە فرمێسك ڕوخساری دەشوات مرۆڤە ڕۆح ناسکەکانن. ئەوانەش کە برژانگیان تەڕ نابێت چەند بەدبەختێکن.

لەمڕۆدا ئێمە وەك موسوڵمان لە نێوان موسوڵمانێتییە شڕ و پینەکراوەکەمان و حاڵی ڕاستەقینەماندا، ناسازییەکی جددی هەیە و ژیانمان چەندین تابلۆی تێدایە کە پێویستە بۆی بگرین. لە هەموو بەشەکانی ژیانی ماددی و مەعنەویماندا دووچاری چەندین تاقیکردنەوە بووینەتەوە، کەچی هەندێکمان هێشتا دەتوانین پێبکەنین و سەرگەرمی ڕابواردنی بێمانا بین. لەم دۆخەدا کە بەشێکمان خوێن سارد و بێباکین، بەشەکەی دی هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی دابنیشێت و بە کوڵ فرمێسك بڕێژێت. ئەگەر ئەرکی من بووایە و لەدەستم بهاتایە، بەمەبەستی نەرمکردنی دڵی ڕەقی ئەم بێخەمانە، ڕۆژانە بیست و چوار کاژێر بێ وەستان، بگرە وەك حەزرەتی یەعقوب (عَلَیْهِ السَّلَام) تا کوێربوون دەگریام.

لە ڕاستیدا ئەو دڵە ڕەقانەی خۆیان بۆ خراپەکاری تەرخانکردووە نەك تەنها فرمێسك بەڵکو ئاوی کەوسەریش ناتوانێت نەرمیان بکات، چونکە ئەم جۆرە مرۆڤانە هێندە بێبەش و دوورن لە ڕەحمەت و شەفەقەت، ئەگەر بشکەونە نێو دەریای خەمەوە بە ئەندازەی دڵۆپە ئاوێك تەڕنابن. بەڵێ لە لایەك ئەوانەی کە بە تۆزێك شێ چاویان تەڕ دەبێت -یاخوا گیانم بە قوربانی ئەوانە بێت!- و لە لایەکیش ڕۆحە ڕەق و تەقەکان کە دەریاکانیش تەڕیان ناکات...

ئەمڕۆ ئەوەندە شت زۆرە کە پێویستە بۆی بگرین! جاری وا هەیە نازانم بۆ چ شتێك بگریم و بۆ چ شتێك دڵتەنگ ببم. بۆ شکانی هێلکە، یان بۆ پلیشانەوەی جووجەڵە، بۆ بای پایز، یان بۆ بەباچوونی خەرمان، بۆ لەدەست چوونی بەهار، یان بۆ بەهەدەرچوونی وەرزی پێگەیشتنی میوەکان؟

ئەی ئەوانەی بە درێژایی مێژوویەك گریانتان بیرچووەتەوە! وەرن با پێکەوە لە ژوور سەری کارە ناکامەکانمانەوە، بە مەبەستی کۆتایی هێنان بەو بێباکی و خەمساردییەمان، کە چەند سەدەیەك تەمەنیەتی، هەموو پێکەوە بگرین!

لەم ڕێیەدا کە ئەم هەموو شتەی تێدایە شایانی گریان بێت و پڕبێت لە ئازار و ژان، پێویستە گەورەترین تێشووی ئیماندار ئارامگریی بێت. پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە هەمبەر ئەو ئازار و ناڕەحەتییەی کە خێزانی یاسر دەیکێشێت، دەفەرموێت :

"صبرا يا آل ياسر، فأن موعدكم الجنة"

واتە: "ئارام بگرن ئەی خێزانی یاسر، بەهەشت پەیمانێکە و بە ئێوە دراوە."

کەواتە هەموو لە دایکبوونێك پێویستی بە قووتدانی دڕکی "ئارامگری" هەیە. دەبێت ئەم دڕکە گەرووتان زامدار بکات و گەدەتان بکزێنێتەوە و ڕیخۆڵەکانتان بهاڕێت و لە ئازار و ژاندا بتان تلێنێتەوە. تۆزێکی دیکەش ئارام بگرن، کۆتایی ئەم ڕێگایە بەهەشتە. ڕۆژێك دێت و لە ژیانێکی تردا ئەوانەی تا دوێنێ هەوڵی چاندنی دڕکیان دەدا لە باخچەی گوڵاندا. شەو و ڕۆژ لە پیلان گێڕاندا بوون بۆ شکاندنی هێلەکەکان، لەو ڕۆژەدا دەکێشن بە ئەژنۆیاندا و پەشیمانن لەو کارانەی کردوویانە. بەڵام ئیدی ئەو ڕۆژە دەفتەرەکان داخراون و کار لە کار ترازاوە...

بەشی خوێندنەوە

## ئازارە داستانئامێزەکەی حەزرەتی خەبابی کوڕی ئەرەت

بەگشتی موسوڵمانانی ساڵانی سەرەتای ئیسلام هەژار و دەستکورت و بێکەس بوون، بێباوەڕەکانی مەککە بە شێوەیەك ئەشکەنجەی موسوڵمانەکانیان دەدا کە بە عەقڵ و خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەدەهات. کاتێك موسوڵمانەکان گەیشتنە ئەو حاڵەی کە توانای خۆڕاگرییان نەما بەرامبەر ئەو ستەمانەی لێیان دەکرا، چوونە لای پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) و داوایان کرد کە دوعایان بۆ بکات تا لەو ناڕەحەتییانە ڕزگاریان ببێت. پێغەمبەریش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) داوای لێکردن کە ئارام بگرن و باسی ئەو ستەمانەی بۆ کردن کە بەسەر باوەڕدارانی سەردەمەکانی پێشوودا هاتوون.

یەکێك لەوانەی ڕووبەڕووی ستەم و ئەشکەنجەی بێ باوەڕەکانی مەککە بوویەوە حەزرەتی "خەبابی کوڕی ئەرەت" بوو، حەزرەتی خەباب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە هۆزی تەمیم بوو، شازدەهەمین کەس بووە کە موسوڵمان بووە.

حەزرەتی خەباب کۆیلەی ژنێکی بێباوەڕبوو بە ناوی "ئوم ئەنمار"، ئەم ژنە بێباوەڕە کاتێ زانی خەباب موسوڵمان بووە خەریك بوو تێکبچێت.

دەیوت: "چۆن بەبێ مۆڵەتی من موسوڵمان دەبیت؟" داوای لێکرد کە لە ئاینەکەی پاشگەزبێتەوە، بەڵام خەباب ئامادە نەبوو بە گوێی بکات. بۆیە ئوم ئەنمار دەستیکرد بە سزادانی بە شێوەیەکی زۆر توند، بەشێوەیەك ئاسنی لە ناو ئاگردا سوور سوور دەکردەوە و پشت سەری خەبابی پێ کون دەکرد، بەڵام خەباب ئارامی دەگرت. ئوم ئەنمار بەردەوام بوو لە ئەشکەنجەدانی خەباب.

ڕۆژێك خەباب سکاڵای خۆی دەباتە لای پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَیْهِ). پێغەمبەریش (عَلَیْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِیمِ) دوعا دەکات و دەفەرموێت: "خوایە یارمەتی خەباب بدە." زۆری نەخایەند لە دوای ئەوە ئوم ئەنمار توشی نەخۆشییەکی سەخت بوو، وەك گورگ لە تاو ئازار دەستی کرد بە لوراندن، بۆ چارەسەرکردنی هەموو ڕێگەیەکی گرتەبەر، تا ئەوەبوو ئامۆژگاری کرا کە سەری داخ بکرێ ئەگینا ڕزگاری نابێت لەو نەخۆشییە. سەیری حیکمەتی خوا بکەن، ئەم جارە نۆرەی حەزرەتی خەبابە کە ئوم ئەنمار داخ بکات، ئەوەبوو ئوم ئەنمار فەرمانی کرد بە خەباب سەری داخ بکات.[1]

ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لەو هاوەڵانەی کە بێ بەزەییانە ئەشکەنجە دەدران چوونە خزمەتی پێغەمبەر(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَیْهِ) و داوایان لێکرد داوای یارمەتی و هاوکاری لە خوا بکات، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا چاکەتەکەی کردبوو بە سەرین و لە سێبەری کەعبەدا پشووی دەدا، فەرموی: "لەناو نەتەوەکانی پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون کە دەخرانە

---

١. ابن الأثير، أسد الغابة، ٢/١٠٢؛ ابن سعد، الطبقات، ١٦٤/٣.

چاڵێکەوە پاشان بە مشارێك دەکران بە دوو کەرتەوە، یان بە چەقۆ گۆشت لە ئێسقانیان دەکرایەوە، بەڵام لە بەرامبەر هەموو ئەمانەشدا لە ئاینەکەیان پاشگەز نەبوونەوە، سوێند بە خوا، خوا سەرکەوتن دەبەخشێت بە ئاینەکەی، تەنانەت ڕۆژێك دێت سوارێك بێجگە لە ترسی خوا و ترس لەوەی گورگێك پەلاماری ڕانەکەی بدات، بێ ترس لە "صەنعا"وە هەتا "حەضرمەوت" دەڕوات، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن."[١]

١. البخاری، المناقب، ٢٥.

# ٨. بەلا، تاقیکردنەوە، فیتنە

﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (البقرة: ١٥٥)

واتە: "سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس و بیم و برسێتی و کەمبوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کار و تیاچوونی بەروبوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگر و ئارامگرن."

## ئەم دونیایە شوێنی تاقیکردنەوەیە

بەلا و موسیبەت و فیتنە، ئەم وشانە هەموویان باسی تاقیکردنەوەیەکمان بۆ دەکەن. ئێمە لەم باسەدا هەموو ئەم واتایانە لەژێر ناوی "تاقیکردنەوە"دا هەڵدەسەنگێنین.

ئاشکرایە کە هۆکاری هاتنە دونیای مرۆڤ بەندایەتییە. ئەو پلە و پایەیەش کە بەهۆی بەندایەتییەوە بەدەستدێت، تاقیکردنەوە دیاری

دەکات. لەبەر ئەوە تاقیکردنەوە یەکێکە لە حیکمەتەکانی هاتنە دونیای مرۆڤ. خوا مرۆڤ بە شێوەی جۆراوجۆ تاقی دەکاتەوە. بۆ نموونە هەندێك جار بە برسێتی و ترس و زیانی ماڵی و گیانی تاقیمان دەکاتەوە.[1] هەندێك جاریش خوای گەورە بە بەخشینی ماڵ و منداڵ تاقیمان دەکاتەوە.[2]

بە کورتی دەتوانین بڵێین چاکە و بەخشینەکان لەلایەك و بەڵا و موسیبەتەکان لەلایەکی تر، هەموو بە تێکڕا بۆ ئێمە دەبن بە ئامرازی تاقیکردنەوە. کەواتە، کەی و لە کوێ و بە چی تاقیدەکرێینەوە، ئەمانە هەمووی پەنهانە لێمان. ئەم دیارینەکردنەش مرۆڤ دەخاتە باری ئامەدەگییەکی تەواوەوە، تا لە هەموو کات و ساتێکدا ئامادە بێت بۆ هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەکی کتوپڕ و هەمیشە لە بێداریدا دەبێت.

هەر ڕێبوارێك ئەو تەمەنەی بۆی دیاریکراوە دەیگوزەرێنێت و پاشان هەر کە کاتی خۆی هات بەرە و ئەو دونیا کۆچ دەکات و ئەم دونیایە بە جێ دەهێڵێت. پەروەردگارمان لە خودی خۆمان پەیامبەرانی بۆ ناردووین تا ئاگادارمان بکەن و خۆمان بپارێزین لەو ڕێگا چەوتانەی کە لەم میوانخانەیەدا دێنە ڕێمان. بێگومان ئەو زاتەی کە ئەم پێغەمبەرانەی ناردووە، کۆمەڵێك داواکاریی لە ئێمە هەیە.

هەروەك چۆن ئێمە لە کاتی ئەنجامدانی هەر خێر و چاکەیەکدا چاوەڕوانی ڕێز و دەستخۆشیی دەکەین، ئەو زاتەی کە ئێمەی بە

---

١. البقرة: ١٥٥.

٢ الانفال: ٣٥؛ آل عمران: ١٨٦؛ الانبیاء: ٣٥.

نیعمەتە لە ژمارەبەدەرەکان پۆشتە کردووە و لە مێرووپەکی ژەهراوی هەنگوینمان بۆ دروست دەکات و لە خاکی وشك و برنگ و بێ گیان و بێ عەقڵەوە جۆرەها نیعمەتی پێ بەخشیوین و، دونیای وەك خانوویەك بۆ ڕازاندووینەتەوە و، خۆری تیادا وەك ئاگردانێك لێکردووە و، مانگیشی کردووە بە چرایەکی شەوانە و، ئاسمانی بۆ کردووین بە بنمیچ.

مێشکمانی کردووە بە زانکۆیەك کە بە هەستە جیاوازەکان چەندەها کۆلێجی خستووەتە کار و، لە هەموو ساتێکدا لە ڕێگەی کرداری هەناسەدانەوە دەمانژیێنێت و گەرمیی لەشمانی بە هاوسەنگی ڕاگرتووە و، چەندەها تۆپی خڕی تری هاوشێوەی ئەم زەوییەی خۆمان بە دەستی قودرەتی وەك دانەکانی تەسبیح بە بۆشایی ئاسماندا دەجوڵێنێت. بێگومان دیارە ئەو زاتە پێویستی بە هیچ شتێك نیە، بەڵام لە بەرامبەر ئەم بەخشینانەوە داوای سوپاسگوزاریمان لێدەکات.

ئەم سوپاسگوزارییە لە هەمان کاتدا پێشیدەوترێت "بەندایەتی بۆ خوا". ماهییەت و چۆنێتی و چەندێتی ئەم بەندایەتی و سوپاگوزارییە لە ڕێی خۆشەویست و نێرراوی خۆی حەزرەتی محەممەدەوە بۆ ئێمە باسکردووە و پێی گەیاندوین. ئێمە چەند سوپاسی ئەو (جَلَّ جَلَالُهُ) بکەین هێشتا هەر کەمە.

لەبەر ئەم هۆیە پێویستە دڵنیابین لەسەر هەر کارێك کە هەڵدەستین بە ئەنجامدانی و هەر هەناسەیەك کە دەیدەین و هەر هەنگاوێك کە دەینێین، لە دوارۆژدا لێمان دەپرسرێتەوە. قورئان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ

باسی ئەم بابەتە دەکات و ڕوودەکاتە مرۆڤ و، ئامۆژگاری دەکات کە دونیا ئاوەدان بکاتەوە:

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾ (القصص: ٧٧)

واتە: "هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیویت ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕە و بەشی خۆشت لە دنیادا بە حەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناهـ و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن."

لە لایەکی تریشەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا گرنگی ئاخیرەت دووپات دەکاتەوە و، لەدەست نەدانی ئاخیرەت دەکاتە یەکەم ئەرك لەسەر شانمان و بەم جۆرە یادمان دەخاتەوە:

﴿ أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾
(المؤمنون: ١٠٥)

واتە: "(ئەوسا خوا پرسیاریان لێدەکات) ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی من بەسەرتاندا نە دەخوێنرایەوە؟ کەچی ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بە درۆتان دەزانی؟"

خوای گەورە فەرمانی گرتنەبەری ئەم ڕێگایەی دەرکردووە

و پێغەمبەرمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرەتا ئەم ئایەتەی لە ژیانی خۆیدا جێبەجێ کردووە. پاشان نەوە لە دوای نەوە بە زیندووڕاگرتنی سوننەتەکانی ئەو، ئەم دەستوورانەیان گەیاندووە بەوانەی دوای خۆیان.

## ناچارین لە تاقیکردنەوەی دونیا دەربچین

بەڵێ ئەوە چەسپاوە کە مرۆڤ تەنها ڕێبوارێکە و لە ماهییەتیشیدا خولیای ژیانێکی ئەبەدییە، ئەو مرۆڤەی کە خوا بە ناونیشانی فەرمانبەرێکی کاتیی ناردوویەتیە ئەم دونیایەوە، لە هەمان کاتیشدا هەستی حەزنەکردن بە مردنیشی تێدا داناوە. هەر ئەم ئارەزووی نەمردن و حەزکردن بە نەمرییەیە کە پەروەردگارمان نزاکەمانیٚ گیرا کردووە و بەهەشتی بۆ ئێمە دروستکردووە.

بەڵام خوای گەورە ئێمەی ڕاپێچی تاقیکردنەوەیەکی وەها کردووە تا لێرە فێری ئەدەب و شەرمێکمان بکات کە شایستەی چوونە بەهەشت بێت. تاقیکردنەوەکەش ئەوەندە ئاسانە کە پرسیارەکان تیایدا ئاشکران و کات و ئەنجامەکەشی دیاری کردووە. بۆنموونە، لەبەرکردنی کتێبی مێژوو و تاقیکردنەوە تێیدا سەختترە، یان دەست نوێژ هەڵگرتن و نوێژکردنێك؟ یەك مانگ لە ساڵێکدا بەڕۆژوو بیت ئاسانترە یاخود خوێندنی هاوکێشە ئاڵۆزەکانی جەبر و ئەندازەی بیرکاری؟ مەگەر دزی نەکردن ئەوەندە شتێکی ئەستەمە؟ لەبەرکردنی کتێبی زیندەوەرزانی و تاقیکردنەوە تێیدا قورسترە، یاخود گزی نەکردن لە کێشانە و پێوانەدا؟ چ بەهانەیەکی ژیرانە و وەرگیراو هەیە بۆ کەسێك کە شەست ساڵی

تەمەنی بە تاقیکردنەوە دونیاییەکانەوە سەرقاڵ بکات، بەڵام خۆی گێل بکات لەم تاقیکردنەوە ئاسانە؟ بێگومان هیچ بیانوویەك نییە بۆ ئەمە. لەبەر ئەمە پێویستە باوەڕدار هەموو ساتەکانی تەمەنی لەم دونیایەدا وەك تاقیکردنەوەیەك بەسەرببات.

یاساکانی ئەم تاقیکردنەوەی دونیایە هەموو کەس دەگرێتەوە. ئەوەی کە مرۆڤ خراوەتە ژێر باری ئەم تاقیکردنەوەیە، یەکێکە لە سوننەتەکانی خوا. قورئان بە مەبەستی دەرکەوتنی ڕاستگۆیی مرۆڤ هەواڵی تاقیکردنەوەمان بە خێر و شەڕ پێ ڕادەگەیێنێت. ئەمە بۆ پشتڕاستکردنەوەی دامەزراویی ئیمانەکەمانە.[1]

## ئەگەر ناخۆشییەکان نەبوونایە نرخی خۆشییەکانمان نەدەزانی

با ئێستا شوێنێك بهێنینە پێش چاوی خۆمان کە، هەموو لایەکی ڕووناکە و تیشکی خۆر دەگاتە هەموو سوچ و قوژبنێکی. لەم بارەدا نە لە بوونی خۆر و نە لە بوونی ڕووناکی ئاگاداردەبین. لە کەشێکی وەهادا بۆ ئەوەی هەست بە بوونی تیشکی خۆر بکەین، پێویستە بچینە ژوورێکی تاریکەوە. ئەگەر چەند کلاوڕۆژنەیەکمان دروستکرد و لەوێوە تیشکی خۆر ژوورەکەی ڕووناك کردەوە، ئەوا بەشێوەیەکی گومانبڕ هەست بە بوونی خۆر و تیشکەکەشی دەکەین.

دونیاش بەهەمان شێوە وەك ژوورێکی تاریك وایە. ئێمەش لەم

١. طه، ١٣١؛ الأنفال، ٢٨؛ الزمر، ٤٩؛ طه،٤٠؛ التوبة، ١٢٦؛ الحج، ١١.

دونیایەدا، خوا خستوینیەتیە نێوەندێکی وەهاوە تا بەهۆی دژەکانی وەك خێر و شەڕ، چاکە و خراپە، لە جوانییە بێهاوتا و بێ سنوورەکانی خوای گەورە تێبگەین. ئەگەر هەموو شتەکانی دونیا جوان بوونایە ئەوکاتە "جوانیی" هیچ مانایەکی نەدەبوو. لە ڕاستیدا ئەو ناخۆشی و ئازارانەی بە بەردەوامیی دێنە ڕێمان، ژوورە تاریکەکەی ئێمە دەڕازێننەوە. بەو ئەزموونانەی کە لە ناخۆشییەکانەوە بە دەستی دەهێنین، نرخی جوانیی و چاکە و خێرەکان دەزانین.

ئێمە لەم لانەیەی دونیادا دەرفەتی ناسینی ڕاستییەکان و ئاشنابونمان پێیان بۆ ڕەخساوە. گەر تاریکی و سەرما و ناشرینی نەبوونایە ئەوا پلەکانی ڕووناکی و گەرما و جوانی بە پەنهانی دەمانەوە. گەر مەملەکەتێکی وەك دونیا بوونی نەبووایە و هەمووان لە بەهەشتدا دروست بکرانایە، ئەوکاتە نەماندەتوانی لانەی بەختەوەریی هەمیشەیی بە بەهەشت ناوزەد بکەین و، کار و بارە بێهاوتاکانی ئەوێ مانایەکیان نەدەبوو.

لەبەر ئەوە ئێرە بە بەراورد لەگەڵ بەهەشت وەك بەندیخانە وایە. چونکە لێرە هەم شتە دژیەکەکان هەیە و هەم لە بەهەشتدا شتە جوانەکانی ئەم دونیایە لە جوانترین و ڕێکوپێکترین و بەرزترین ئاستدا دەبینین، بە جۆرێك جوانییەکانی ئەم دونیایە ناتوانێت ببێت بە سێبەری سێبەری جوانییەکانی ئەوێ.

بەهەمان شێوە دونیا بە بەراورد بە دۆزەخ، وەك بەهەشت وایە. چونکە هەموو ئەو جوانییانەی کە لێرە هەن، لەوێ بونیان نییە و

هەموو ئەو ئازار و نارەحەتییانەی کە لێرە هەن، لەوێ بەشێوەیەکی قورستر و ناخۆشتر و بەسۆتر ئامادەکراون.

ئێمە لەم دونیایەدا هەمیشە گومانی چاك و باش بەو بەندانەی خوا دەبەین کە پێیان دەوترێت "وەلی"، ئەویش لەبەرئەوەی خوا چەند کەرامەتێکی پێبەخشیون. تەنانەت لەحاڵێکدا گەر شتێکی نەشیاویشیان لێ ببینین پاساویان بۆ دەهێنینەوە و بە خۆمان دەڵێین: "بێگومان حیکمەتێکی تێدایە" ئەو خوایەی کە بەدیهێناوین و بە نیعمەتەکانی پەروەردەی کردووین و بە بەردەوامی پێداویستییەکانی ژیانمان بۆ ڕەوانە دەکات، لە بەرامبەر ئەم خوایەوە کە بەخششەکانی خۆی بەسەردا باراندووین، چۆن دەبێت ڕێگە بە خۆمان بدەین کە لە هەموو کاروبارێکدا حیکمەتێك و لە هەموو ڕووداوێکدا کە بەسەرماندا دێت، جوانی و دانایییەك نەبینین؟! ئەمە لەکاتێکدا ئەو کەراماتانەی کە لە وەلی یەکەشەوە دەرکەوتن هەر لەلایەن ئەووەیە.

کەواتە، پەروەردگارمان بێگومان تاقیمان دەکاتەوە، ئەوەش کە پێویستە لەسەر ئێمە خۆ ئامادەکردنمانە بۆ هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەك کە دێتە ڕێمان.

بەشی خوێندنەوە

## گرنگترین ئەو تاقیکردنەوانەی کە دەکرێت ڕووبەڕوومان ببنەوە کامانەن؟

بە لای منەوە گرنگترین چەمکی تاقیکردنەوە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ (الأنعام: ٥٣)

واتە: "وە بەو جۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێز و بەهرەی پێ بەخشیوون لە ناو ئێمەدا ؟ ئایا خوا لە هەموو کەس زاناتر نییە بەوانەی شوکرانە بژێرن؟"تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانی خزمەتە لەنێو یەکدیدا.

ئەم تاقیکردنەوەیە ترسناکترینی تاقیکردنەوەکانە و سەختترینیانە. هاوەڵە بەڕێزەکان چەندین جار ڕووبەڕووی ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە بوونەتەوە و بە یارمەتی خوای گەورە بە زوویی لە هەموویدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

یەکێکی تریش لە تاقیکردنەوەکان، جەستە پەرموەری، خانەپەروەری، منداڵپەرستی و، نەوەپەروەری و هاوشێوەی ئەمانەیە. ئەم تاقیکردنەوەیە بەتایبەت بۆ ئەوانەی لە سەفەری بەردەوامی خزمەتدا ڕۆژێك لە ڕۆژان پێشەنگ بوون، هەمیشە چاوەڕوانکراوە. ئێستاش دوور نییە ببێتە هۆی دوورخستنەوەی زۆر کەس. "ئێمە زۆرمان کرد، با ئیدی گەنجەکان خەریك بن. با ئێمە کەمێك پشوو بدەین و گرنگی بە ماڵ و منداڵمان بدەین"، دەکرێ ئەم بیرکردنەوەیە بە سەرەتای تاقیکردنەوەیەکی وەها هەژمار بکەین. لەم بارەیەوە پێویستە هەردەم ئەو ڕاستییە لە یاد نەکەین کە حەزرەتی ئەبو ئەییوبی ئەنصاریی لە کاتی گەمارۆدانی ئیستانبوڵدا لە سێبەری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا بەیانی کرد:

﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ (البقرة: ١٩٥)

واتە: "لە پێناو خوادا ببەخشن. بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە نێو مەترسییەوە، هەمیشە خێر و چاکە ئەنجام بدەن و چاکەخواز بن و (ماڵ و سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونکە بەڕاستی خوا ئەو چاکەکارانەی خۆشدەوێت."

لە کاتی گەمارۆدانەکەدا هەندێك لە سەربازەکان، کە دەیانبینی هەندێك لە هاوڕێکانیان بە ئاشکرا خۆیان فڕێ دەدایە بەردەم مردن، بە خوێندنی ئایەتی پیرۆزی: ﴿ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ (البقرة: ١٩٥) بە واتای: "بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە نێو مەترسییەوە" ئاگاداریان دەکردنەوە.

لەم بارەیەوە میوانداری پێغەمبەر، حەزرەتی ئەبا ئەیوبی ئەنصاریی فەرمووی: "ئایەتەکە بە ڕاستی دەخوێننەوە بەڵام بە هەڵە لێکی دەدەنەوە. ئێمە وەك پشتیوانان لە پاش ڕزگارکردنی مەککە وتمان، ئیدی ئیسلام بە شکۆ گەیشت. ئێمەش داراییمان لەگەڵ کۆچبەراندا بەشکرد، باخ و باخچەکانمان فەرامۆش کردووە. با ئێستا بیرێك لە خۆمان بکەینەوە. ئەم ئایەتە پیرۆزە لەو کاتەدا هاتە خوار." واتە: "داراییتان لە پێناو خوادا ببەخشن. بە نەبەخشینی بە دەستی خۆتان، خۆتان مەخەنە نێو مەترسییەوە."" وەك دەبینین بە دەربڕینی قورئانی پیرۆز، ئەم بیرۆکانەش دەکرێت بە تاقیکردنەوە هەژمار بکرێت.

بەش بە حاڵی خۆم، لەو باوەڕەدام کە ئارەزووکردنی مردنیش تاقیکردنەوەیەکە. بەیەك دەگەین یان بەیەك ناگەین ئەوە بابەتێکی ترە، بەڵام ئارەزووی گەیشتن بە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان و چەندین کەسایەتی دیکەی مەزن شتێکی جوانە. بەڵام کێ ناڵێت ئەمە بەهۆی ئەو ناڕەحەتییانەوە نییە کە لەبەر خزمەت دەچێژرێت!

بە کورتی، دونیایەك تاقیکردنەوە تووشی پاڵەوانانی خزمەت بووە. گرنگ ئەوەیە پاڵەوانانی ڕاستی درك بەمە بکەن و ئەو هەڵوێستە بپۆشن کە بەندایەتی داخوازیەتی.

لە یادتان نەچێ! "ئەم فەرمانبەرییە مەزنترینە و نەفسیش نزمترین."[1]

---

١. محەمەد فەتحوڵڵا گولەن، ئاوێزە

## هەموو تاقیکردنەوەیەک ڕەحمەتە

هەروەك چۆن کاتێك کەسێکی نزیکمان نەخۆش دەکەوێت و دکتۆرەکان بە یەکدەنگی هەواڵی ئەوەمان دەدەنێ کە پێویستە نەشتەرگەری بۆ بکرێت، ئێمە بە هیوای چاك بوونەوەی دەست بەجێ و بێ دوودڵی هەموو ڕێکارە پێویستەکان دەگرینە بەر و ئامادەی دەکەین بۆ نەشتەرگەری. پاشان لە ڕۆژی نەشتەرگەریدا بەشێوەیەکی جوان نەخۆشەکە ڕەوانەی ژووری نەشتەرگەری دەکەین و بە پزیشکەکانی دەسپێرین. کاردانەوەی ئیمە چی دەبوو گەر ئەو نەشتەرگەرییەی لە ژوورەوە دەکرێت لە شاشەیەکدا نیشانمان بدرێت؟

بۆ نموونە لە بارێکی وەك ئەمەدا ئایە دەتوانین بڵێین: ”ئەم دکتۆرانە خەریکن ناو سکی جگەرگۆشەکەم هەڵ ئەدڕن، شەرت بێ بیان دەم بە دادگا، بەس بابێنە دەرەوە نیشانیان ئەدەم من کێم؟!“ بێگومان نەخێر، چونکە ئێمە دکتۆرەکان بە ستەمکار نازانین، بەڵکو ئەوان وەك تیمارکاری مرۆڤەکان سەیردەکەین، بۆیە بەوپەڕی ئارامیەوە چاوەڕێی ئەنجامی نەشتەرگەرییەکە دەکەین. لەپاش تەواوبونی نەشتەرگەرییەکەش زۆر دەست خۆشیان لێدەکەین و بە گوڵ و دیاری جۆرا و جۆر ڕێز و خۆشەویستی خۆمانیان پێشکەش دەکەین.

بە هەمان شێوە ئەو کۆنەندامانەی کە لایەنی مەعنەوی ئێمەیان پێك هێناوە، بەهۆی غەفڵەت و گوناهەوە توشی نەخۆشی درێژخایەن بوون. ئێمە ناتوانین ئەو هەستیارییەی کە لەبەرامبەر نەخۆشییە ماددیەکان هەمانە، بەهەمان شێوە هەستیاریین بەرامبەر بەو نەخۆشییە

مەعنەوییانەی دووچاریان دەبین. ئیتر لەم کاتەدا خوای گەورەی خاوەنی ئامێرەکان و بەدیهێنەری هەموو جوانییەکان بە مەبەستی دەرکەوتنی جوانییە هەمیشەییەکان، خودی خۆی نەشتەرگەریی ئەم ئامێرانە دەگرێتە ئەستۆ.

ئەوە هەر خوای گەورەیە کە بڕیار لەسەر شێوە و ماوەی ئەو ئامرازانە دەدات کە لە نەشتەرگەرییەکەدا بەکاردێن. ئێمەیەك کە متمانە بە پزیشکەکان دەکەین و سەرپێچییان ناکەین، ناکرێت متمانە بە خوا نەکەین. لە کاتێکدا کە خوای گەورە بە هۆی نەخۆشی و بەڵا و موسیبەتە جۆراوجۆرەکانەوە تیمارمان دەکات. ئایا جێی خۆی نییە کە بەئەندازەی ئەو جوانییانەی کە ئەندامەکانمان لە ژیانی هەمیشەییدا بەرهەمی دەهێنن، سوپاسی پەروەردگاری خۆمان بکەین؟

مرۆڤ تەنها بۆ ئەوە نەهاتووەتە ئەم دونیایە تا بکەوێتە دوای چێژە ماددییەکان و سەرقاڵی تێرکردنی گەدە و ئەندامەکانی تری بێت. بەڵکو لەگەڵ ئەمانەدا بە پەروەردەکردنی نەفس پێویستە خۆی لە ئاژەڵ جودا بکاتەوە. ئەگینا ئەو مرۆڤەی سەرمایەیەکی زۆری پێبەخشراوە و ئەرك و فەرمانبەرییەکی مەزنی لە ئەستۆ نراوە و بە چەندەها قات لە سەروو ئاژەڵەوەیە، زۆر خراپ دەخەڵەتێت و لەم دونیا فانییە، کە شوێنی بە دەستهێنانی ئەو ئامرازانەیە کە لە خانەی هەمیشەییدا پێویستی پێیان دەبێت، بۆ ئەوەی پلەی ئاژەڵێتی دەست بکەوێت[1] کۆچ دەکات.

---

١. الأعراف: ٧٩.

بەڵێ، کەسێك کە لەم ئاستەدا بوو، ئەو ئەرك و فەرمانانەی لێی چاوەڕێ دەکرێت، نیشانیان دەدات و ئەو ماتەوزانەی پێی بەخشراوە، دەخاتە گەڕ و بە بۆیەی ئەبەدییەت ڕەنگینیان دەکات. بۆ ئەوەی ئەمانە بەدەست بهێنێت، پێویستە بە بێژنگی ژیانی ئاڵۆزی دونیادا کە پڕە لە پێچەوانەکان، تێبپەڕێت. ئەم دونیایەی کە تێیدایەتی بۆ ئەوەیە یان بەهەشتی بەرین یان دۆزەخی بۆ وەدەست بخات. مافی هەڵبژاردنیش بە کەسەکە خۆی دراوە.

## بەڵا و موسیبەتەکان لاوازیی و کۆڵەواریی مرۆڤ دەردەخەن

مرۆڤ بەهۆی لاوازی و هەژارییەوە دەستی لە چەندین گەنجینەی نەبڕاوە گیر دەبێت، هەرچەندەش پەی بردن بە مانای کۆڵەواری و هەژاری کارێکی هەروا ئاسان نییە. لەم کاتەدا نەخۆشی و موسیبەتەکان دەبنە جوانترین ڕێگە بۆ تێگەیشتن لێیان. بەڵی، ئێمە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشییەکان و دوورکەوتنەوە لە ناخۆشییەکان، ڕێوشوێنی پێویست دەگرینە بەر. بە گرنگی پێدان و هەستیارییەکی زۆرەوە ئاگامان لە تەندروستی خۆمان دەبێت. بەڵام ئەگەر لەدەرەوەی بازنەی ئیرادەمان دووچاری نەخۆشی و بەڵا و موسیبەتەکانیش بووینەوە، لایەنێکی جوانی تێدا دەدۆزینەوە و هەوڵ دەدەین لە گەڵیان هەڵبکەین و بژین.

نەخۆشی گرنگترین هۆکارە بۆ هەستکردن بە بوونی یەکێك لە گەورەترین نیعمەتەکان، کە ئەویش لەشساغییە. ئەگەر مرۆڤ دووچاری نەخۆشی نەبێت، ئەوا هەست بە نیعمەتێکی گەورەی

وەك لەشساغی ناكات. ئەگەر كەسانی نەخۆشیش ببینێت نایباتەوە سەرخۆی و وەك خۆی هەستی پێناكات. لەبەر ئەوە بە گشتی هەموو مرۆڤێك لە ژیانیدا دووچاری نەخۆشی بچووك یان گەورە دەبێت، تاكو ئەو سوپاسگوزارییەی كە پێویستە لەبەرامبەر لەشساغیەوە ئەنجام بدرێت، ئەم لەقوڵایی دڵیەوە پشت ڕاستی بكاتەوە و بەجێی بگەیەنێت. پێشكەش كردنی سوپاس گوزارییەك كە شایانی بەخششی لەشساغی بێت، بەبێ بوونی ئاوێنەی نەخۆشی نابێت و ناكرێت. كەواتە نەخۆشی دەبێتە سەنگی مەحەك و لەشساغیمان پێ دەناسێنێت. كەواتە ئەگەر نەخۆشی وەك بۆمان دەركەوت، ببێتە هۆی دەرخستنی ئەو هەموو جوانییانەی كە لە لەشساغیدا هەیە، ئەوا خودی خۆیشی دەبێتە جوانی و دیمەنێكی جوان.

یەكێك لە بازرگانە بەناوبانگەكان، ئەم باسەمان بۆ تەواو دەكات و بەشێوەیەكی ناوازە تیشك دەخاتە سەر ئەم بابەتە و، دەڵێت: "با لەش ساغی بە ژمارە "یەك" دابنێین و هەموو ئەوشتانەی لەژیانماندا بەدەستمان هێناون بە "سفر" ئاماژەیان بۆ بكەین، بەجۆرێك كە ژمارە "یەك" لە سەرەتادا بێت و سفرەكانیش كە ژمارەیان بە هەزارەها دەبێت لە بەردەمیدا دابنێین. سەیارە و ماڵ و خانوو و ئیش و هەموو شتێكی ترمان ئەو سفرانەن كە لە بەردەم ژمارە "یەك" دایدەنێین. ئەم "سفر" انە مرۆڤ بۆ لای خۆیان كێش دەكەن و بەردەوام چاوی مرۆڤیان لەسەرە. لەكاتێكدا لەشساغی سەرنجی هیچ كەسێك ڕاناكێشیت. بەڵام ئەگەر شتێك بەسەر لەشساغیدا بێت ئەوا "یەك" جێی لەنگ دەبێت و دەكەوێتە

لەرزە. خۆ هەرچەندە چەندین "سفر" لەم نێوەندەدا هەیە و، تەنانەت ئەگەر هەموو ئەو سفرانە کۆبکرێنەوە و کەڕەتی یەکتریشیان بکەین ئەوا سەرەنجام هەر تەنها یەك "سفر"ی گەورە دەردەچێت. بەهەمان شێوە ئەگەر تەندروستی لەدەست بچێت، ئەوا هەموو ئەو شتانەی کە وەك چاو دەمان پاراستن و خاوەنیان بووین مانایەك نابەخشن. ئەمەش بۆ هەموو کەسێکە بە بێ جیاوازی. مەگەر چەندەها جار ڕووینەداوە کە سەروەت و توانایەکی زۆر لەبەرامبەر لەشساغیدا هەر وەك نەبوو وابووە و دادی خاوەنەکەی نەداوە؟!"

نەخۆشی لەهەمان کاتدا ژیانی کۆمەڵایەتی گەرم دەکات. نەخۆش پێویستی زۆری بەکەسانی تر هەیە و چاو لە دەستیانە. مرۆڤ بەهۆی نەخۆشییەوە جوانتر لەوە تێدەگات کە ژیانی دونیا بە تەنیا و بە بێ یارمەتی کەسانی تر بەڕێوە ناچێت. بە تایبەتی لە کاتی نەخۆشیدا مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە خزم وکەسوکاری نزیك گەنجینەیەکی بە نرخە.

ئەمە وادەکات کە مرۆڤەکان زیاتر تێکەڵاوی یەکترین و هاریکاری یەکتر بکەن. گەر وردبینەوە دەبینین نەخۆش بەزمانی حاڵ، چەندەها دانایی لێ دەخوێنرێتەوە و دۆست و خۆشەویستانیش بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە هەستی یارمەتیدان و بە دەمەوەچوونیان دەبزوێت و بەم شێوەیەش پردی پەیوەندییەکان توندوتۆڵتر دەبێت. بەم شێوەیە ئەم بارە کۆمەڵایەتیە وا لە مرۆڤەکان دەکات زیاتر ئاوڕزانی یەکتر بن.

ئەو مرۆڤەی کە وریا دەکرێتەوە بە نەخۆشی و تێگەیشتووە لەوەی

که لاشەی ئەمانەتێکی خواییە، ئەوا موڵکداریی هەموو شتەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خوا و بەس. ئیتر قەبوڵی دەکات کە خوای گەورە سەربەستە لە چۆنێتی مامەڵە کردن لە موڵکی خۆیدا و، ڕەزامەندی خۆی بەرامبەر هەموو فەرمانەکانی خوا نیشان دەدات و تێدەگات لەوەی کە هەموو شتێك مادەم لەوەوە بێت ئەوا جوانە و ئەم ڕاستییە دەگوازێتەوە بۆ هەموو لایەنەکانی تری ژیانی.

تێدەگات لە نیعمەتی لەشساغی پێش نەخۆشییەکەی و حاڵی دەبێت لە هەموو نیعمەتەکانی تر و، تا لە ژیاندا بێت بە چاوی ڕێزەوە لەو نیعمەتانە دەڕوانێت و، لە کاتی بەکارهێنانی نیعمەتەکانیشدا سوپاسگوزاریی پەروەردگاری خۆی دەکات.

بەشی خوێندنەوە

## خوای گەورە بۆچی مرۆڤەکان بە موسیبەتەکانی وەک هەژاری و نەخۆشی و کەم ئەندامی تاقی دەکاتەوە؟

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین کە دەتوانرێت ئەم پرسیارە تەنها بۆ تێگەیشتن لە حیکمەتی بەدیهاتن بکرێت. بە پێچەوانەوە لێرەدا -حاشا- لەوانەیە مانای لێپرسینەوە لە خوا بگەیەنێت، لە ڕاستیدا هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە، چونکە ئەم دونیایەی ئێمەی تیادا دەژین بەو هەوایەوە کە هەڵی دەمژین و بەو ئاوەوە کە دەیخۆینەوە و هەروەها مانگ و خۆر و ئەستێرەکانیش هەموویان موڵکی ئەون. هەموو شتێك کە ئێمە هەمانە یان نیمانە، هی ئەوە و بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. خاوەن موڵکیش چۆنی بوێت مامەڵە بە موڵکی خۆیەوە دەکات.

دەتوانین ئەمە بە نموونەیەك زیاتر ڕوون بکەینەوە. جارێکیان پیاوێکی سەخاوەتمەند، سێ کەس دەبات بۆلای منارەیەك کە سێ قۆناغ بەرزە و دەتوانرێت لە ناوەوە بە پلیکانە بۆی سەربکەویت. هەر یەك لە قۆناغەکان پلیکانەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە. پاشان پیاوە سەخاوەتمەندەکە بۆ هەر یەکێك لەوان، پلیکانەیەك دیاری دەکات و فەرمانیان پێ دەکات کە سەربکەون بە سەریدا و، لەگەڵ سەرکەوتنیان

به سەر هەریەکێك لە پلەکانی ئەو پلیکانەیەدا، تەنها لە بەخشندەیی و بەزەیی خۆیەوە و بێ ئەوەی قەرزاریان بێت، دیارییەکی تایبەتیان پێ دەبەخشێت. ئا لەم کاتەدا ئایا پیاوی منارەی یەکەم و دووەم کە لە چاو پیاوی منارەی سێیەمدا نزمترن، مافی ئەوەیان هەیە بە پیاوی سێیەم بڵێن: "بۆچی ژمارەی پلیکانەکانی من کەمترن؟ بۆچی دیاری کەمترت بە من دا؟" ئایا پیاوی منارەی یەکەم مافی ئەوەی هەیە بڕوانێتە پیاوی منارەکانی دووهەم و سێهەم، یان پیاوی منارەی دووەم بڕوانێتە سێهەم و بە بەشی خۆی ناڕازی بێت و ڕەخنە بگرێت؟ ئایا ئەم کردارە بە بێ شەرمیی و ناحەقیی دانانرێت؟

خوای گەورە ئێمەی لە هیچەوە دروست کردووە، لە جیاتی ئەوەی بمانکاتە بەرد و خاك و گیا و زیندەوەری تر، ئێمەی وەك مرۆڤ بەدیهێناوە. بەمەشەوە نەوەستاوە و نیعمەتی بێشوماری پێ بەخشیوین، وەك ئەوەی هەموو گەردوونی خستبێتە خزمەتمانەوە. لەوەش گرنگتر بە پایەی بەندایەتی شەرەفمەندی کردوین و کردووینی بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی. ئایا سپڵەیی و بێوەفایی نابێت بەرامبەر خوا، گەر پاش هەموو ئەمانە مرۆڤ هەستێ ڕەخنە بگرێ و بڵێ من بۆچی کەم دەرامەتم؟ بۆ کوێرم؟ بۆ ئیفلیجم؟ حاشا! خۆ خوا قەرزارمان نییە تا ناڕەزایی بەرامبەر دەرببڕین! ئەوەی دەکەوێتە سەرمان ئەوەیە شوکری ئەو نیعمەتانە بکەین کە خوای گەورە لوتفی فەرمووە، نەك چاو ببڕینە شتانێك کە خوای گەورە پێی نەداوین.

خوای گەورە حیکمەت گەلێکی ئاشکرا و شاراوەی زۆری لە

جیاوازیی ئاست و چینی مرۆڤەکاندا داناوە، هەوڵدەدەین لێرەدا هەندێك لەو حیکمەتە زانراوانە بخەینە ڕوو.

یەکەم: خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) ناوی لە ژمارەبەدەری هەیە و، ئەم ناوانەش داخوازی هەمەچەشنین لە بەدیهاتندا، بۆ نموونە: ناوی "الرزاق"ی خوای گەورە داخوازی بوونی زیندەوەری ئاتاج و، ناوی "الشافي"ش داخوازی بوونی نەخۆشە، تا ئەم ناوانەی خوای گەورە بدرەوشێنەوە. دیسان خوای گەورە بە ناوی "المجید"یەوە دەچێت بەدەم ئەوانەی کە لە تەنگانەدان و، بە ناوی "القابظ"یەوە فریادڕەسی بێ ئاگایان دەبێ و، بەناوی "الباسط"یشیەوە دەگاتە هاواری ئەوانەی لە نارەحەتیدا خنکاون، بەم جۆرە خوای گەورە بە ناوە لە ژمارەبەدەرەکانی، خۆی دەناسێنێت و مەبەستی بوونی ئێمەش هەر ئەمەیە.

دووەم: هەموو شتێك بە پێچەوانەکەی دەناسرێت. گەر تاریکی نەبێت، نرخی ڕووناکی و، گەر نەخۆشی نەبێت نرخ و بەهای تەندروستی و، برسێتی نەبێت قەدری تێری و، هەژاری نەبێت بەهای دەوڵەمەندی نازانرێت، گەر کەم ئەندامەکان نەبوونایە لەشساغەکان هەستیان بەوە نەدەکرد خاوەنی چ نیعمەتێکن!

ئەوانەش کە ئەندامێکی جەستەیان نەخۆشە یان لە دەستیانداوە، بەهای ئەندامەکانی تری جەستەیان وەك پێویست نەدەزانی، نەخۆشی و موسیبەتەکان کاتێکی زۆر کەمی ژیانی ٦٠-٧٠ ساڵەی مرۆڤ داگیر دەکەن، مرۆڤە کەم ئەندامەکان ڕێژەیەکی زۆر کەمی ژمارەی دانیشتوانی دونیا دەگرنەوە، شایەنی باسە زۆربەی نەخۆشی و

کەمئەندامییەکانیش لە خراپ بەکارهێنانی مرۆڤ خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت.

سێیەم: ئەم دونیایە شوێنی تاقیکردنەوەیە. خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) هەندێك جار بە هەژاری و هەندێك جار بە دەوڵەمەندی و هەندێك جار بە نەخۆشی و هەندێك جاریش بە لەشساغی، مرۆڤ تاقیدەکاتەوە. هەریەك لە جوانی و هێز و سەروەت و کەم ئەندامی و تەندورستی باش هۆکارێکی تاقیکردنەوەن، خوای مەزن بەم جۆرە ئەم ڕاستییەمان پێ ڕادەگەیەنێت:

﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (البقرة: ١٥٥)

واتە: "بێگومان ئێمە، ئێوە بە کەمێك ترس و برسێتی و کەمبونەوەی ماڵ و سامان و گیان و بەرهەمەکانتان تاقی دەکەینەوە، مژدە بەوانە بدە کە ئارام دەگرن"

لە ئایەتە پیرۆزەکانی دوای ئەمانەدا باس لە وەسف و تایبەتمەندییەکانی ئارامگران دەکرێت و ئاماژە بەوە دەدرێت کە لە لایەنی خوای خۆیانەوە پاداشتی مەزن دەکرێن. خوای گەورە (عَزَّ وَجَلَّ) بارێك بە کەسێك هەڵناگرێت لە توانایدا نەبێت و لێپرسینەوەی لەسەر شتێك لەگەڵدا ناکات کە خاوەنی نەبێت.

چوارەم: خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) خاوەنی دادپەروەری ڕەها و میهرەبانی بێ سنوورە. هەرگیز ناهەقی بەرامبەر بەندەکانی ناکات،

بەڵام بۆئەوەی بە باشی لە دادپەروەری خوا بگەین، پێویستە پێکەوە بیر لە دونیا و دوارۆژ بکەینەوە. دونیا فانییە، دێت و دەڕوات، ئەوەی سەرەکییە ژیانی ئەو دونیایە. دونیا تەنها کێڵگەی دوارۆژە و نەخۆشی و موسیبەتەکان دەچنە حوکمی پەرستشەوە بۆ مرۆڤی باوەڕدار و ئارامگر. گەر لەبەر کوێریی، ئیماندارێکی بێبەش لە جوانییەکانی دونیای فانی لە تەمەنێکی کورتی ٦٠–٧٠ ساڵەی ئێرەدا ئارام بگرێت، لەبەهەشتدا بەو جوانییە بێسنوورانە خەڵاتدەکرێت کە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە. خوای گەورە یەك شت وەردەگرێت و لە بەرامبەریدا چەندین قاتی ئەوە دەبەخشێتەوە، بەس ئەوەندەی مرۆڤ لەدڵەوە بڕوا بەمە بکات و ئارامگر بێت.

پێنجەم: خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) مرۆڤی بۆ بەندایەتی هێناوەتە دونیاوە. ئاسوودەیی و بەختەوەری ڕاستەقینە لە نزیکیی خوای گەورەدایە و لە گەیشتن بە ڕەزامەندی ئەودا دەدۆزرێتەوە. نەخۆشەکان و ئەوانەی دووچاری ناڕەحەتی و بەڵا و موسیبەت بوون، بە بەراورد بەو کەسانەی کە لەنێو ئاسوودەیی تێر و پڕیدا دەژین ئاسانتر لە بێدەسەڵاتی خۆیان دەگەن و زووتر هەست بە پێویستی وەرچەرخان بەرەو خوای گەورە دەکەن. لە پەرستشەکانیاندا هەستیارتر دەبن، هەوڵ دەدەن تا لە دەستیان دێت، خێر و چاکەی زیاتر ئەنجام بدەن. مەگەر ئامانجی بوونیشمان هەر ئەمە نییە؟! مادەم وایە، گەر ئەم جۆرە دۆخانە لە هەڵەی خۆمانەوە سەرچاوەی نەگرتبێت، نابێت وەك سزا لێیان بڕوانرێت. بەڵکو پێویستە وەك لوتفێکی خوای

گەورە تەماشا بکرێن. بێگومان نەخۆشی و کەمئەندامی و بەڵا و موسیبەت داوا ناکرێت، بەڵام کە هاتیش ئیماندار کامڵ دەڵێت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ (البقرة: ١٥٦) واتە: "ئێمە هی خواین و کە کاتیشی هات، بۆ لای خۆی دەگەڕێینەوە"

# ٩. لێبوردەیی و ئاسانکاری

﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (النور: ٢٢)

واتە: "ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوا نەدەن، دەبا لێبووردە بن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو و میهرەبانە."

## دڵفراوانی سیفەتی مرۆڤی بڕوادارە

لە ناوەڕۆکی ئاینەکەماندا دڵفراوانی و ئاسانکاری هەیە. دڵفراوان بوون لەباسکردنی حەق و حەقیقەتەکاندا زۆر گرنگە. تا ئێستا زۆرێك لە دڵە ڕەقەکان بە هۆی دڵفراوانی و ئاسانکارییەکانەوە نەماون و تواونەتەوە و چوونەتە ناو بازنەی نووری ئیسلامەوە. خوای گەورەش

بە تایبەتی داوای لێکردووین کە بەرامبەر مرۆڤەکان دڵفراوان بین و زمانێکی نەرم بەکاربهێنین.[1]

مرۆڤی دڵفراوان لە هەموو لاپەڕەیەکی ژیاندا هەمیشە کەسێکی براوەیە و هیچ کاتێك نادۆڕێت. ژیان لەو ڕۆژەدا کە مرۆڤی تێدایە و هەبوونی بەرنامە بۆ داهاتوو و حیکمەت، بەهرەیەکی خواییە و تەنها بەو کەسانە دەدرێت کە دڵفراوانن. ئەوانەش کە ئەمە بەدەست دەهێنن تاقە میراتگرانی دونیای داهاتوون.

بڕوادارێك کە بە ڕەوشتە قورئانییەکان پەروەردە بوویێت، وەڵامی خراپەکان بە چاکە دەداتەوە و نابێت گوێ بدات بە ڕەوشتە خراپەکان. پێویستە هەمیشە بە دڵفراوانی و لێبوردەییەوە هەڵسوکەوت بکات و بەرامبەر بە کردەوە توند و ناقۆڵاکان لێبوردە بێت.

شارستانێتیی ئیسلام بریتییە لە شارستانێتیی دڵفراوانی. هەر لە سەرەتای قورئانی پیرۆزەوە کە بە "بسم الله" دەست پێدەکات خوای گەورە بەخشندەیی و میهرەبانی خۆیمان نیشان دەدات، هەروەها پێغەمبەرمان (صَلَّیَ اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم) دەفەرموێت: "ئێوە سۆز و بەزەیی خۆتان بۆ ئەوانەی سەر زەوی نیشان بدەن تا ئەوەی لە ئاسماندایە سۆز و بەزەییان بۆ ئێوە هەبێت."[2] پێغەمبەرمان (صَلَواتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيه) داوامان لێ دەکات کە دڵی یەکتر نەشکێنین و بە دڵفراوانییەوە بانگمان دەکات بۆشارستانێتیی لێبوردەیی.

---

١. طه: ٤٤.

٢. ابو داود، الأدب، ٥٨.

بە ملیۆنان کەسی بەڕێز و ڕەوشت بەرز بە ڕەوشتەکانی ئیسلام پەروەردە بوون، بەتایبەتی ئەوانەی کە دۆستانی خوا بوون و بە جوانترین شێوە نوێنەرایەتی ئەم دڵفراوانییەیان کردووە. کاتێك هاوەڵێکی پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَلاةِ وَسَلَام) بە سەرخۆشیی هاتە مزگەوت هاوەڵانی تر سەرزەنشتیان کرد، پێغەمبەر نەهی لێکردن و ئاگاداری کردنەوە. هاوەڵێکی تریش کە ناوی "جولەیبیب" بوو، پێش ئەوەی بەهۆی هەوا و ئارەزووی لاوێتییەوە لەڕێ بترازێت، بە ئامۆژگارییەکانی ئەو سەروەرە ڕزگاری بوو، کاتێکیش لەجەنگێکدا شەهیدبوو، تەرمەکەی دۆزییەوە و کردییە باوەشی و دوعای خێری بۆکرد. ئەم دوو ڕووداوە تەنها دوو تابلۆن لە میهرەبانی و بەزەیی پێغەمبەری ئازیزمان. کە ئەمە یەکێکە لە تابلۆکانی جوانی و بەزەیی و دڵفراوانی مرۆڤەکان.

لە سایەی ڕووناکی ئیسلام و دەستە پڕ بەزەییەکانی پێشەواکانەوە، ئاسنەکان توانەوە و خەڵوزەکان بوون بە ئەڵماس. هەموو حوکمێکی ئیسلام بریتییە لە سۆز و بەزەیی، وە ئەو شتانەش کە لە دونیا قەدەغە کراون و سزایان لە سەرە، بۆ ئامانجی ڕزگارکردنی مرۆڤەکان و کۆمەڵگایە. تەنانەت ئەو سزایانەش کە لە قورئان و فەرموودەکانیشدا هاتوون پێشنیاری لێخۆشبوونیان تێدا کراوە. ئەگەر لەم لایەنەوە سەیر بکەین ئیسلام بە هەموو یاسایەکیەوە ئاینێکە کە بەزەیی و لێخۆشبوون و دڵفراوانی و ئاسانی لە پێشەوە گرتووە. لەبەرئەوە پەیڕەوانی ئەم ئاینەش، دەبێت ئەم جۆرە بیروبۆچوونە بکەن بە سەر مەشق بۆ خۆیان.

## خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا چۆن باسی ئاسانکاری دەکات

لە قورئانی پیرۆزدا وشەی "یسر: ئاسانکاریی" (٤١) جار هاتووە. خوای گەورە بەرامبەر مرۆڤەکان ئەو شتەی کە پێیان ناکرێت نایخاتە سەرشانیان، وە مرۆڤیش بەرامبەر بە ئەرکەکانی بەرپرسیارە.[١] خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) هیچ شتێك ناخاتە ئەستۆی کەس کە لە توانای خۆی زیاتر بێت، پەروەردگار لە دوای هەموو قورسییەك، ئاسانکاریی دەخولقێنێت، شتی قورس لە مرۆڤەکان داوا ناکات، ئاسانکاریی دەوێت بۆیان.[٢] لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان بە لاوازی بەدیهێنراون، ئەو (جَلَّ جَلَالُهُ) نایانخاتە ژێر بارێکی قورسەوە، لەبەر ئەوەی دەیەوێت بارە قورسەکان ئاسان بکات.[٣]

ئاین لە لایەن خوای گەورەوە ئاسانکراوە.[٤] لە پاڵ ئەو پەرستشانەی کە فەرمانی پێکراوە و لە پاڵ حوکمە گشتییەکاندا کە پێیان دەوترێت "عەزیمەت"، لە ڕێگەی بەکارهێنانی "ڕوخسەت"یشەوە کە ئاسانکاریە لە حوکمەکاندا، ئەرکی سەرشانمان ئاسان دەکات.

ئاسانکاری هەیە لەوەی کە داوای لێخۆشبوون بکەین بۆ ئەو گوناهانەی کە کردوومانن، جگە لەمەش هەمیشە دەرگای تەوبە کراوەیە بە ڕووماندا. زۆرکردن لە کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێك شتێکی فیتری نیە. لەبەر ئەوە لە ئاینی ئیسلامدا قەدەغەکراوە کە

١. البقرة: ٢٨٦.
٢. البقرة: ١٨٥.
٣. النساء: ٢٨.
٤. الحج: ٧٨.

به زۆر یەکێك بکرێت بە موسوڵمان، چونکە ئاین پەیوەندی بە باوەڕ و هەڵبژاردنەوە هەیە.

بەپێی ئایەتی پیرۆزی قورئان لە ئایندا زۆرلێکردن نییە.[1] بۆ ئەوەی یەکێك ببێت بە موسوڵمان کەس ناتوانێت زۆری لێبکات. لە بنەڕەتدا ئەگەر خوای گەورە بیویستایە هەموو کەسێکی دەکرد بە موسوڵمانی خاوەن ئیمان.[2]

جێی خۆیەتی لێرەدا ئەوەش بوترێت کە حوکمی "زۆر لێکردن لە ئایندا نییە"، پەیوەندی بە موسوڵمانبوونی سەرەتای کەسێکەوە هەیە، ئەگینا مرۆڤێك دوای ئەوەی بە ویستی خۆی موسوڵمان بوو و هاتە ناو ئیسلامەوە لە بەجێهێنانی داواکارییەکانی ئاینەکەی بەرپرسیارە.[3] هەر کەسێك دوای ئەوەی کە موسوڵمان بوو، بە بێ بوونی هۆیەکی رێگە پێدراو ئەرکەکانی جێبەجێ نەکات، هەم لەم دونیا و هەم لەو دونیاش ڕووبەڕووی کۆمەڵێك سزا دەبێتەوە. ئەمەش بە واتای زۆرلێکردن نایەت، بەڵکو بریتییە لە ڕێکخستنی ژیانی ئەو کەسەی کە بە ویستی ئازادانەی خۆی ئەم ئیمانەی وەرگرتووە و یارمەتی دەدات بەو جۆرە بژی کە ئەم بیر و باوەڕە داخوازیەتی و ئاسانکاری دەکات بۆ ئەوەی باوەڕدار ئەو ڕێیەی گرتویەتی بەخێر کۆتایی پێ بێت.

---

١. البقرة: ٢٥٦.
٢. یونس: ٩٩.
٣. الاحزاب: ٣٦.

بەشی خوێندنەوە

## چەکی لێبوردەیی بەرامبەر چەکی ئاگرین

ماوەیەکی دوور و درێژ بوو کە پێشنوێژێك بانگبێژێکی بۆ مزگەوتەکەی نەدەدۆزییەوە، بەڵام ڕۆژێك بانگبێژێك دەرکەوت، 'کاك عەبدوڵا" کە یەکێك بوو لە نوێژخوێنان ئەمەی زۆر پێخۆشبوو، وتی: "چاوتان ڕۆشن مامۆستا، ئەوە بانگبێژێکیان بۆ دامەزراندووین!" مامۆستا بە دڵەڕاوکێ و زەردەخەنەیەکی ئاوێتەی دوودڵیی و گومانەوە وەڵامی دایەوە و، وتی: "ئەم بانگبێژە لەو بانگبێژانە نییە کە بە دامەزراندن هاتبێتە ئێرە. یەکێکە لەو بانگبێژانەی کە بە چەکی لێبووردەیی و میهرەبانی نەرممان کردووە! ئەو چەکی ئاگرینی لە ئێمە ڕاکێشا، ئێمەش چەکی دڵفراوانیمان هەڵگرت، سەرەتا ئەو ئێمەی گرت ئینجا ئێمە ئەومان گرت. ئێستاش تا بانگبێژییەکەی دەکات دڵسۆزیمان نیشان دەدات."

کاك عەبدوڵا هیچ لەمە تێنەگەیشت. مامۆستاش بەم شێوەیە ڕووداوەکەی باس کرد: "بەیانییەکی تاریك مزگەوتەکەم داخست، بۆ ماڵەوە دەڕۆشتمەوە، کە لە حەوشەکە دەرچووم دەنگێکی لەناکاو منی وەستاند. "مامۆستا! دەست بەرزبکەرەوە ئەگینا تەقەت لێدەکەم!" سەیرم کرد، بەڵام لەبەر تاریکی نەمتوانی بیناسمەوە، ڕووی

چەکەکەی لە من کرد و ئاماژەی بۆ کردم. ”پێشکەوە!“ دەستم نایە سەر سەرم و بۆ ئەو شوێنە ڕۆشتین کە دەیویست. وە لە کۆتاییدا چوینە گۆڕستانێك. بەو فەرمانانەی کە لەپشتمەوە دەهات زۆر سوڕاینەوە لەناو گۆڕستانەکەدا، بێ ئەوەی سەیری دواوە بکەم بانگم کرد و، وتم: ”بۆچی دەسوڕێیتەوە؟“ وەڵامەکەی زۆر سەیربوو: ”من کوڕی فلانە پیاوم کە نوێژخوێنی مزگەوتەکەی تۆبوو و زۆرت خۆش دەویست، لە گۆڕی باوکم دەگەڕێم.“

زۆرم پێ سەیربوو و تۆزێکیش ئاسوودە بووم. ”گۆڕی باوکت ئەوەتا لێرەیە.“ چوینە سەر ئەوگۆڕەی کە ئەو بۆی دەگەڕا، بەڵام لە دوامەوە فەرمانێکی تر هات. ”لە شوێنی خۆت بکەوە سەر ئەژنۆ و سورەتی یاسین بخوێنە!“ ئەوەندەی تر سەرم سوڕما، سورەتی یاسینم خوێند، لەم کاتەدا بە لاچاوێك سەیری دواوەم دەکرد، بینیم چەکەکەی خستووەتە گیرفانیەوە و دەگری. ئینجا وتی: ”تۆ کاری خۆت کرد، فەرموو بڕۆ“ وتم: ”نەخێر هەرگیز تۆ بەجێناهێڵم و ناڕۆم، پێویستە تایبەتمەندیی ئەم شوێنە بزانم؟“ ئەوەندەی تر گریانەکەی تاوی سەند. دوای تۆزێك هاتەوە سەر خۆی و دەستی کرد بە باسکردنی بابەتەکە.

”چەند حەیفە کە من دەخۆمەوە، ئەمشەویش دیسان خواردوومەتەوە. لەخەونمدا باوکمم بینی سەرزەنشتی دەکردم و، دەیوت: ”تۆ چۆن مناڵێکیت؟ لەوەتەی لە تۆ جیابوومەتەوە هیچ دیارییەکی تۆم پێ نەگەیشتووە، ئایا ئەمە ڕەوایە؟“ منیش کە خەبەرم بووەوە ویستم یاسینێك بۆ باوکم بخوێنرێت، سوپاست دەکەم تۆ ئەرکی خۆت ئەنجامدا،

ئێستاش بە دەردی خۆمەوە بەجێم بهێڵە، من یەکێکم لەوانەی کە کەوتوومەتە ناو زەلکاوی تاوانەوە.“

وتم: ”نەخێر تۆ لەوانە نیت کە کەوتونەتە ناو زەلکاوی گوناهەوە، تەنانەت ئەگەر ئاڵتونیش کەوتە سەر زەوی هیچ لە بایەخەکەی کەم نابێتەوە. تەنها پێویستە خۆڵەکەی لێ بتەکێنرێت و ئاڵتونەکە وەدیاربخرێت.“ وتم: ”دەی با بتبەمەوەماڵەوە“، پێداگریم کرد، بە یەکەوە هاتینەوە ماڵەوە. کەسێك بوو خۆی بە شایانی ئەوە نەدەزانی کە کەسانی تر گرنگی پێ بدەن. خۆی وەکو کەسێکی بێ نرخ قەبوڵ کردبوو. منیش وتم: ”لە باوکێکی وەها، مناڵێکی خراپ دروست نابێت، هەموو شتێك کاتی خۆی هەیە، ئێستاش کاتی گەڕانەوەیە.“ بەم جۆرە بووین بە هاوڕێ، ئەم هاوڕێیەتییەمان وا فراوان بوو وەکو بینیتان بوو بە بانگبێژی مزگەوتەکەمان.

بە کورتی ئەو چەکی ئاگرینی لە ئێمە ڕاکێشا، ئێمەش چەکی دڵفراوانی و بەزەییمان لەو ڕاکێشا، لە پێشدا ئەو ئێمەی ترساند، بەڵام دوایی ئەومان بەم شێوەیە گرتا“

## لە کرۆکی ئایندا ئاسانکاری هەیە

بێگومان ئەو کەسەی کە مرۆڤ بە باشترین شێوە دەناسێت تەنها بەدیهێنەرەکەیەتی. خوای گەورە توانا و لێهاتنی مرۆڤ زۆر بە باشی دەزانێت، ڕێك بەگوێرەی ئەمانە چوارچێوەی بەندایەتی بۆ کێشاوە، کاتێك کە داوای شتێك لە مرۆڤەکان دەکات، بە پێی توانا و لێهاتنی

مرۆڤەکان فەرمان دەکات. ئەو لەبەر ئەوەی کە خاوەنی دادپەروەری ڕەهایە بە گوێرەی توانای مرۆڤەکان داواکاریی لێکردوون.

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بە ڕوونی باس لەوە کراوە کە بەپێی توانای مرۆڤەکان ئەرکیان لێ داوا دەکرێت.

﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ۖ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا ۚ أَنتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾

(البقرة: ٢٨٦)

واتە: "خوای گەورە هیچ بارێك ناخاتە سەر شانی کەسێك کە پێی نەکرێت. هەموو کەسێك ئەو قازانجە باشەی وەری دەگرێت لەسەر داواکاری خۆیەتی و ئەو کارە خراپانەشی کە دەیکات دژی خۆیەتی. ئەی خوای گەورە! ئەگەر بیرمان چووەوە یاخود بەبێ ویستی خۆمان هەڵەیەکمان کرد، بەرپرسمان مەکە لێی. ئەی خوای گەورە! شتێکمان مەخەرە سەرشان کە لە تاقەت و تواناماندا نەبێت..."

واتە خوای گەورە هیچ عیبادەتێکی ڕۆحی و جەستەیی لە سەروو توانای مرۆڤەوە دانەناوە و بەپێی توانای ماددی و مەعنەویەکانی ئەرکی خستووەتە سەرشان.

بۆیە ئەو ئەرکانەی خوای گەورە خستویەتیە سەر شانی بەندەکانی توانای بەندەکەشی لەبەرچاو گرتووە، بۆ نموونە حەج فەرزە لەسەر ئەو

کەسانەی کە لە ڕووی جەستەیی و مادییەوە گونجاون و ئەو مەرجانە دەیانگرێتەوە کە بتوانن حەج بکەن.

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾ (آل عمران: ٩٧)

واتە: "ئەوانەی کە توانایان هەیە سەردانی ماڵی خو بکەن، حەقێکە لە سەریان."

یەکێکی تر لەوانە دەستنوێژە کە مەرجە بۆ نوێژ، بەڵام گەر هات و هەلومەرجەکان گونجاو نەبوون بۆ دەستنوێژ، دەتوانین "تەیەممومو" بکەین. واتا داواکارییەکان بە پێی توانا کراون.[1]

خوای گەورە ئەو شتانەی کە بەندەکەی پێی ناکرێت نەیکردووە بە ئەرك بە سەریەوە، لەبەر ئەوە نایەوێت بەندەکانی شتەکان زۆر لە خۆیان قورس بکەن.[2] چونکە لە بەندایەتیدا ئاسانکاری بنەمایەکی گرنگە، ناوەڕۆکی هەموو ئەم بنەمایانەش بەم شێوەیەیە:

﴿ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾ (النساء: ٢٨)

واتە: "ئینسان بە لاوازی بەدیهێنراوە." زانایانی تەفسیر وتویانە ئەم ئایەتە بۆ هەموو بڕیارەکانی ئاین بەکارە و ئەم ئاسانکارییەی خوای گەورەش چاکەکردنە لەگەڵ بەندەکانیدا.[3]

کاتێك سەیری ژیانی پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکەین دەتوانین ئەوە ببینین کە ئاسانکاری وەکو بنەمایەك قەبوڵ کردووە.

١. المائدة: ٦

٢. المائدة: ١٠١.

٣. الرازي، مفاتيح الغيب، ١٠/٥٥.

هاوەڵان دەفەرموون: "ئەگەر پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لە نێوان دوو شتدا دوودڵ بووایە ئاسانترینیانی هەڵدەبژارد."[1] هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: "ئاسانکار بن و کار لە خەڵك قورس مەکەن، مژدەدەربن و ترسێنەر مەبن."[2]

ناوەڕۆکی ئاینەکەمان گرنگی بە ئاسانکاری داوە، ئەم ئایەتە دووجار لەسەر یەك ئەم ڕاستییەمان یاد دەخاتەوە:

﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ (الشرح: ٥-٦)

واتە: "بە دڵنیاییەوە لە پاڵ قورسییەکاندا ئاسانکارییەکیش هەیە، بە ڕاستی لەگەڵ هەر قورساییەکدا بەیەکەوە ئاسانکاریش هەیە"

لە ڕاستیدا لە هەندێك عیبادەتدا بەپێی شوێنەکان ئاسانکاری کراوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە موسوڵمان پەرستشەکان لە هەموو ناوەند و هەلومەرجێکدا بە ئاسانی جێبەجێ بکات، بۆ نموونە ئەوانەی کە ناتوانن بەڕۆژوو بن دەتوانن لە دوای مانگی ڕەمەزان بە قەزا بیگرنەوە، ئەوانەی کە ناتوانن بە پێوە نوێژ بکەن دەتوانن بە دانیشتنەوە بیکەن، وە ئەگەر هاتوو ئاو نەبوو بۆ دەستنوێژ گرتن دەتوانن تەیەموم بکەن و، لە گەشتەکاندا نوێژەکان کورت دەکرێنەوە، ئەمانە هەمووی ئاسانکاریی ئاینە.

بە ڕەچاوکردنی توانا و پێداویستیی مرۆڤ، چەندین ئاسانکاری تریش لە ئاینەکەماندا هەیە. لەبەر ئەم هۆکارانە حوکمەکانی ئیسلام

---

١. أبو داود، الأدب، ٤؛ الموطأ، حسن الخلق، ٢.

٢. البخاري، العلم، ١١، المغازي، ٦٠، الأدب، ٨٠؛ مسلم، الجهاد، ٤.

خاوەنی ئەو سیفەتەن کە لە هەموو کاتێکدا و لە هەموو شوێنێکدا دەتوانرێت پیادە بکرێن.

## لێبوردەیی سەردارمان چۆن بووە؟

پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خاوەنی دڵێکی فراوان بوو، لای خوای گەورە ناوی ئەو بریتی بوو لە "زۆر بە بەزەیی و زۆر میهرەبان". حەزرەتی عائیشە (رضيَ اللهُ عَنْها) دەفەرموێت: "پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَلاةِ وَسَلام) وشەی ناشرینی نەدەوت، پێچەوانەی شەرم و پەروەردە و نەزاکەت هیچ هەڵسوکەوتێکی نەدەکرد، لە ناو بازاڕدا بە دەنگی بەرز قسەی نەدەکرد و دەنگە دەنگی دروست نەدەکرد، وەڵامی خراپەی بە خراپە نەدەدایەوە، بەڵکو دەیبەخشین."

دووبارە حەزرەتی عائیشە (رضيَ اللهُ عَنْها) دەفەرموێت: "کاتێك پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلاةٍ وَسَلام) لە نێوان دوو شتدا دوودڵ بووایە ئەوا ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد، ئەگەر بیزانیایە کە دەکەوێتە گوناهەوە ئەوا زۆر خۆی لێ بەدوور دەگرت."[١]

دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە بەردەوامە لە باسکردنی ئەودا دەڵێت: "پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە موجهەدەدا نەبێت، هەرگیز لەکەسی نەداوە، هیچ کەسێك نە لە ڕەفتار و نە لە کرداری پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلاةٍ وَسَلام) زیان و ئازاری بەرنەکەوتووە، ئیتر چ بگات بەوەی هەستی تۆڵەسەندنەوەی بەرامبەر بە هاوەڵێکی هەبێت،

١. التجريد، ٩/٢٧٦.

مەگەر کەسێك بێ ڕێزی نواندبێت بەرامبەر بە سنوورەکانی خوا، ئەوکاتە لەبەر خاتری خوا تووڕە دەبوو و تۆڵەی لێدەسەندەوە"[1]

"قازی بەیضاوی" ئەم بابەتە بەم شێوەیە باس دەکات: "پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) کەسێکی ئارامگر و خاوەنی ڕەوشتێکی بەرز بووە، وە ڕێزی لە حەق گرتووە، ئەگەر مافی خەڵك و مافی خوای گەورەی نەدابایە، ئەمە بە مانای زەلیلی دەهات، وە ئەگەر لەبەر خاتری نەفسی خۆی مافی بسەندایە بەهەڵەشە و بێ ئارام هەژمار دەکرا."

هاوەڵی پێغەمبەر ئەنەسی کوڕی مالیك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: "کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەڕۆیشتین دەشتەکییەك عەباکەی پێغەمبەری زۆر بە توندی ڕاکێشا، کاتێك سەیری پێغەمبەرم کرد لە ملی گیربووبوو، دەشتەکییەکە پێی وت: "ئەی محمد! لەو ماڵەی کە خوا پێی داویت فەرمان بکە بڕێکم پێ ببەخشن!" پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاوڕی دایەوە و زەردەخەنەی کرد، دوایی فەرمانی کرد کە شتێکی بدەنێ."

وەك حەزرەتی ئەنەس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەرگیز شتێکی ڕووبەڕووی کەسێك نەدەوت کە بێتاقەتی بکات، هەروەها هەرگیز عەیبی کەسی نەدەوت. کردارە خراپەکانی بە شێوەیەکی گشتی باس دەکرد، تا ئەو کەسەی کە ئەو هەڵەیەی کردووە بێتاقەت نەبێت و دڵی نەشکێت! هەرچەندە ئاماژەیەکی

١. مسلم، الفضائل، ٧٩.

پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەلایەن شوێنکەوتووانیەوە وەکو فەرمان تەماشا کراوە، سەرەڕای ئەمەش بۆ ئەوەی کەسێك لە ئوممەتەکەی دڵی نەشکێت زۆرترین هەستیاریی نیشانداوە.

جارێکیان پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بینی کە پیاوێك بەهۆی بۆنێکی قورسەوە هەموو کەسانی چواردەوری خۆی بێتاقەت کردووە، هەتا پیاوەکە نەڕۆشت هیچ شتێکی نەوت، بە دەموچاویدا نەدایەوە، دوای ئەوەی کە ڕۆشت بە خەڵکەکەی وت: ”بەشێوەیەکی نەرم و نیان بەم کەسە بڵێن کە جارێکی تر ئەم بۆنە بێزارکەرە بەکار نەهێنێت!“

هاوەڵان دەربارەی پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەڵێن: ”ئەگەر شتێکی پێ خۆش نەبووایە بە ڕوخساریەوە دیاربوو.“ هەروەها لەم فەرموودە پڕمانایەدا پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بە هاوەڵان دەفەرموێت: ”هیچ کەس باسی خراپەی یەکێکی ترتان لای من نەکات، چونکە من دەمەوێت بە دڵێکی پاکەوە بەناوتاندا بگەڕێم.“

## پێغەمبەرمان هەمیشە لایەنی دڵفراوانی و گفتوگۆ کردنی گرتووە

کاتێك سەیری ژیانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکەین، دەبینین بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی کاریگەری لەگەڵ مرۆڤەکاندا هەبێت، هەمیشە هەوڵی داوە لە گفتوگۆدا بێت لەگەڵیاندا. بۆ نموونە سەرەڕای ئەو مەرجە قورسانەی کە پەیماننامەی حودەیبییە لە خۆی گرتبوو، بەڵام ئەو قەبوڵی کرد بۆ ئەوەی ئاشتیی بەرقەراربێت، ئەمەش دەیسەلمێنێت

که کەسێکی ئاشتیخواز بووە.بەم شێوەیە لە قورئانی کەریمدا هاتووە:

﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ﴾ (الممتحنة: ٨)

واتە: "دڵنیاشبن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاك ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینیان نەکردوون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون، چونکە بە ڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت."

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ﴾ (التوبة: ٧)

واتە: "کە ئەوان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردن، ئەوا ئێوەش بە ڕاست و دروست هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن."

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە داوای پاراستنی ئەو کەشە ئاشتییە دەکات کە ڕێکەوتننامەی حودەیبییە فەراهەمی کردبوو. بەپێی ئەمە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرەڕای نارەزایەتییەکان و سەرەڕای موسوڵمان بوونی "ئەبو جەندەل"، بۆ ئەوەی پابەندیی خۆی بۆ یەکێك لە ماددەکانی ڕێکەوتننامەی حودەیبییە دووپات بکاتەوە، ناچاربوو ئەو هاوەڵە بەڕێزە بگێڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی، هەرچەندە پەنای پێهێنابوو. بەناچاری دایەوە دەست "سوهەیل"ی باوکی کە بە نوێنەرایەتی مەککەییەکان هاتبوو.

بەم شێوەیە لایەنگری خۆی بۆ ڕێکەوتن و دیالۆگ دووپات

کردەوە. لە پەیماننامەی ئاشتی حودەیبییەدا هاتبوو، کە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ ئاشتی لەنێوان موسڵمانان و مەککەییەکان بەرقەرار دەبێت. پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەم ماوەیەدا نێرراوانی خۆی نارد بۆ لای سەرۆکی وڵاتانی دەوروبەر و هەوڵیدا پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ دروست بکات، لە ماوەیەکی کەمدا ئەنجامە جوانەکانی ئەم هەوڵانە دەرکەوتن. یەکێك لەمانە "نەجاشییە".

با تۆزێك بچینەوە بۆ دواوە. یەکسەر دوای جەنگی بەدر، نەجاشی لە حەبەشە حەزرەتی "جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵب" و هاوڕێکانی بۆ لای خۆی بانگ دەکات. کاتێك موسوڵمانەکان دەچن بۆ لای دەبینن جلێکی کۆنی لەبەردایە و لەسەر زەوی دانیشتووە. سەریان سووڕ دەمێنێت، داخۆ بۆچی پاشایەکی وەك ئەو جلێکی وای پۆشیوە و لەسەر زەوی دانیشتووە!

نەجاشی هۆکاری بانگکردنی موسوڵمانەکانی بۆ لای خۆی بەم شێوەیە باس دەکات: "من بۆ ئەوەی هەواڵێکی خۆشتان پێ ڕابگەیەنم ئێوەم بۆ ئێرە بانگ کردووە! لە شارەکەی ئێوەوە یەکێك لە پیاوەکانم هات بۆ لام و هەواڵی سەرکەوتنی خوا و پێغەمبەرەکەی و شکانی دوژمنەکانیشی بۆ هێنام. ئەوان لە ناوچەی داری سیواکەکان کە بە "بەدر" ناسراوە ڕووبەڕووی یەکتر بونەتەوە. ئێستا وەکو ئەوە وایە کە ئەوێ ببینم، چونکە من سەردەمانێك لەوێ حوشترم دەلەوەڕاند."

موسوڵمانەکان پێش ئەوەی بڕۆن پرسیاریان لێکرد: "باشە بۆچی لە کاتێکدا کە فەرمانڕەوایت، لەسەر زەوی دانیشتویت و ئەم جلە کۆنانەشت

لەبەردایە؟“ وەڵامەکە بەم شێوەیە بوو: ”ئێمە لەو شتانەی کە خوای گەورە بۆ عیسای (عَلَيْهِالسَّلَام) ناردووە تێدەگەین، کاتێك خوای گەورە نیعمەت دەبەخشێت بە بەندەکانی، جوانترین شت کە لەبەرامبەردا بەندەکان بیکەن خاکی بوون و خۆبەکەم زانینە. لەبەر ئەوە کاتێك خوای گەورە نیعمەتی سەرکەوتن دەبەخشێت بە پێغەمبەرەکەی، منیش ویستم بەم شێوە سادەیە، خۆم هەواڵەکەتان پێ بڵێم.“

سەرەڕای ئەو شکستەی کە بەسەر مەککییەکاندا هاتبوو، دوای ماوەیەك "عەمری کوڕی عاص" و "عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعە" دووبارە دەنێررێنەوە بۆ حەبەشە و دەیانویست هیچ نەبێ موسوڵمانەکانی ئەوێ بهێننەوە و حەقی خۆیان لەوان وەرگرنەوە، دەیان وت: ”با حەقی خۆمان لە خاکی حەبەشە وەربگرین! پیاو بنێرن بۆ لای پاشای ئەوێ تا هاوەڵەکانی پێغەمبەر بدات بە ئێمە و لەبری کوژراوەکانی بەدر ئەوان بکوژینەوە!“

دووبارە بە دیاریی بەنرخەوە دەچن بۆ لای نەجاشی و بۆ ئەوەی وەکو جاری پێشوو تووشی نوشوست نەبنەوە، ئامۆژگاریی زۆری پیاوەکانیان کرد، لەگەڵ ئەمانەشدا دووبارە بەهەڵەداچوون.

چونکە بە ماوەیەکی کەم پێغەمبەرمان (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) خەبەری لەم بارودۆخە دەبێت و یەکسەر نامەیەك بە "عەمری کوڕی ئومەییە"دا بۆ نەجاشی دەنێرێت. لەبەر ئەمە نەجاشی دووبارە بە دیارییە گرانەکان و قسە و ڕووکەشیان هەڵنەخەڵەتا و نێردراوەکانی مەککەی بە دەستبەتاڵی ناردەوە.[1]

---

١. قرطبي، الجامع، ٢٥٥/٦.محمد حيدالله، الوثائق السياسية، ٩٩.

بەشی خوێندنەوە

## چەند وتەیەک لەسەر دڵفراوانیی و لێبووردەیی

- ئەگەر یەکێك تەنانەت وەکو ئێمەش بیرنەکاتەوە، دەبێت بە لێبوردەیی و ڕێزەوە لێی بڕوانین.
- کاری ئێمە شکاندنی دڵەکان نییە، بەڵکو پاککردنەوەی دڵەکانە.
- پێویستە لە بیرمان نەچێت کە ئوممەتی پێغەمبەرێکین، کاتێك ددانیان شکاند و سەریان قڵیشاند، دەیفەرموو: "خوایە لێیان خۆشببە و ڕێی ڕاستیان نیشان بدە، چونکە ئەوان نامناسن، ئەگەر بیانناسیبام وایان نەدەکرد." بۆیە پێویستە بابەتەکانی ئەو مرۆڤەی کە جددیترینی مرۆڤەکانە، بە ڕژانە سەرشەقام و هات و هاوار نەخەینە ژێر پێی خەڵکی. (موحەممەد فەتحوڵلا گولەن)
- ئەم سەردەمە پێویستی بە ئاینێکی هاوبەش نیە بەڵکو پێویستی بە تێگەشتن و قەبوڵکردنی دوولایەنە هەیە لەنێوان ئاینە جیاوازەکاندا.
- بنەمای سەرەکی هەڵسوکەوت کردن بریتییە لە لێبوردەیی، مەحاڵە ئێمە هەموومان بەیەك شێوە بیربکەینەوە، چونکە ڕوانینمان بۆ

ئەو بەشەی ڕاستیی "حەقیقەت" کە لێمانەوە دیارە جیاوازە.
(غاندی)

- کاتێك کەسێك تەماشای گوڵێك دەکات و لە خەیاڵیدا بیر لەشەڕە کۆنەکان دەکاتەوە، چۆن دەتوانێت هەست بەو جوانییە بکات کە بوونی گوڵەکە لەو کاتەدا دەریدەبڕێت؟
- لەبری ئەوەی دڵتەنگ بین بەوەی گوڵ دڕکی هەیە، با دڵخۆش بین بەوەی دڕك گوڵی هەیە. (گوتە)

# ١٠. ژیانی بەکۆمەڵ

﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴾ (آل عمران: ١٠٣)

واتە: "هەر هەمووتان، دەست بە پەتی (ئاینی) خواوە بگرن، توند باوەشی پێدا بکەن، جودا و پەرتەوازە مەبن."

## جەماعەت واتای چییە؟

جەماعەت، کۆمەڵێك مرۆڤن کە لە دەوری هەست و بیر و باوەڕێکی دیاریکراودا بە هەستێکی قووڵەوە جەم بوون.

خوای گەورە مرۆڤی وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دروست کردووە. ئەوی بە جۆرێك هێناوەتە بوون، کە پێویستی بە هاوڕەگەزەکانی خۆی بێت. مرۆڤ دەتوانێت تەنها لە نێو کۆمەڵدا بژی و ئاسوودە بێت. ئاینەکەمان بایەخ بەوە دەدات کە موسوڵمانان بە کۆمەڵ بژین و، لە سەرجەم لایەنە ماددی و مەعنەوییەکانی ژیاندا هاوکاری یەکتربن.

پەروەردگارمان لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە دەکات و، دەفەرموێت:

"ئەو ئیماندارانەی خۆشدەویێت کە وەك بینایەکی پتەو، ڕیز دەبەستن و لە ڕێگەی ئەودا تێدەکۆشن"[1]، پێغەمبەری ئازیزیشمان لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "ئیمانداران وەك ئەندامەکانی جەستەیەك وان. گەر ئەندامێك نەخۆش بکەوێت و زیانی پێبگات، هەموو جەستە پێوەی گیرۆدە دەبێت."[2]

ژیانی بەکۆمەڵ ئەو سەنگەرە پارێزراوەیە کە بەرامبەر شەپۆلە ڕووخێنەر و داپلۆسێنەرەکانی ئاخرزەمان دەوەستێت. لە پاڵ ئەگەری چەندین هەڵە کە دەکرێت لە ژیانی تەنیاییدا ڕووبدات، لە ژیانی بە کۆمەڵ و جەماعەتدا ئەم ئەگەرە کەمترە. لە لایەکی دیکەوە ئەو کەسانەی کە بە تاك دەژین، لەو کەش و هەوا نوورانییە بێ بەش دەبن کە خوای گەورە بە جەماعەتی دەبەخشێت. جووڵەی هاوبەش لە نێو جەماعەتدا هەیە و دەبێت هەبێت، هەروەها لە جەماعەتدا ئەگەری دامەزراویی و سەرکەوتن زیاترە. چونکە لە لایەکەوە کۆکراوەی هەست و بیری چەندین مرۆڤ و تێگەیشتنی بە کۆمەڵ، لەو لاشەوە بیری یەك دانە مرۆڤ گەر بلیمەتیش بێت...

بەڵێ، ئەمانە تەنانەت بەراوردیش ناکرێن. لە بەر ئەم هۆکارانەیە کە پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) فەرموویەتی: "خوای گەورە لەگەڵ جەماعەتدایە."[3]

---

١. الصف: ٤.

٢. البخاري، الأدب، ٢٧؛ مسلم، البر، ١٧.

٣. الترمذي، الفتن، ٧.

## هەمیشە هێز لە پێکەوەبوون دایە

پێغەمبەری سەردارمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی بەوە کردووە کە هێز و ڕەحمەت لە یەکێتی و، سزا و ئازاریش لە پەرتەوازەییدا هەیە.[1] دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە پاداشتی ئەو پەرستشەی بە جەماعەت دەکرێت، بیست و حەوت پلە لە سەروو ئەو پەرستشانەوەیە کە بە تاك دەکرێن.[2]

دوو کەس گەر پێکەوە نەبن، تەنها (١)ن، بەڵام کاتێك دێنە پاڵ یەك دەبن بە (١١). گەر سیانیش بن دەبن بە (١١١). لە سەر بنچینەی ژمارە هەوڵماندا ئەم دۆخە وێنا بکەین. با ئێستاش بیر لەوە بکەینەوە، ئایا ئەو ڕووناکییەی کە یەك کەس بە گرتنی مەشخەڵێك لە تاریکیدا دەیهێنێتە مەیدان لەگەڵ هی (١١) کەس و (١١١) کەسدا دەبن بە یەك؟ لە هەڵگرتنی گەنجینەیەکیشدا هەمان دۆخ لە ئارادایە. با لەگەڵ هێز و بازوودا یەکگرتنی توانا و بیرۆکەکانیش هەژمار بکەین. سەرەڕای ئەوەش گەر یەکێتی ئامانج و خەون لەگەڵ کۆشش و بڕیاردان یەکبگرن، ئەوا ئەو کاتە سەدای ورەیەکی بەرز و پۆڵایین لەو بڵند گۆیەوە دەبیسترێت کە گوللەتۆپەکانیش ناتوانن بەرامبەری ڕابوەستن.

ئەگەر دەتانەوێت ببنە دارێکی بەرداری کراوە بە ڕووی ڕەحمەتدا، ئەوا ببنە دارێکی نێو دارستان. گەر بە تەنها بمێننەوە هیچ ڕەحمەتێکتان

---

١. المسند، ٤/١٤٥.

٢. البخاري، الأذان، ٣٠.

بۆ نابارێت، ڕەنگە وشك ببن و بپوكێنەوە. بەڵام لە شوێنی دارستاندا بێگومان بارانی ڕەحمەت دەبارێت و ئێوەش سوودی لێدەبینین.[1]

وەك كەمێك پێشتریش باسمان كرد مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتی دروست كراوە، ئەو كەسەی بەتەنها دەژی، ڕەنگە بكەوێتە نێو بارێكی ناهەموارەوە. لە بەرامبەر ڕەشەباكانی گومڕاییدا كە لە هەر چوارلاوە فێڵبازانە هەڵدەكەن، وە لەوەش خراپتر، دەكرێت ببێتە ئامانجی تیرە ژەهراوییەكانی شەیتان. لە بەر ئەوە دەبێت خۆمان بە دووربگرین لە ژیانی تەنها و، پەنا بۆ ژێر سایەی جەماعەت بەرین.

## پێویستمان بە ڕۆحی پێكەوەبوونە

یەكڕیزی دڵەكان و پاشانیش یەكڕیزی كردارەكان، هەروەك یەكێكە لە بناغە مەزنەكانی ئاینی ئیسلام، بەهەمان شێوە ئامانجێكی بنەڕەتیشییەتی. پەروەردگارمان لە باسی ئەم ڕاستییەدا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾

(آل عمران: ١٠٣)

واتە: "هەمووتان پێكەوە، دەست بە ئاینی ئیسلامەوە بگرن تا لە كەوتن و هەڵدێران ڕزگاربن. لە ناو خۆتاندا وەك ئەهلی كیتاب مەبنە

1. موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، لە سێبەری باوەڕدا.

تاقم تاقم. (یا مەبەست ئەوەیە وەك سەردەمی جاهیلیەت مەمێننەوە کە بە گژی یەکتردا ئەچوون). بیری ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە خوا ڕژاندی بە سەرتانا و، ئەوە بوو ئێوە لە ناو خۆتانا دوژمن بوون و ماوەیەکی دووردوودرێژ لە یەکترتان ئەکوشت، پاشان خوا بە هۆی نیعمەتی ئیسلامی پیرۆزەوە ئاشتی کردنەوە و لەناو خۆتاندا بوون بە برای یەکتر. ئێوە لە سەر لێواری چاڵی ئاگری دۆزەخ بوون و ئەگەر ئاینی ئیسلام فریاتان نەکەوتایە و ئیسلام نەبوونایە لە وانەبوو تێبکەون. خوا هیدایەتی دان و ڕزگاری کردن لەو ئاگرە. خوا بەم جۆرە ئایەتەکانتان بۆ ڕوون دەکاتەوە تا زیاتر شارەزابن و ڕێگای ڕاستی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بەر نەدەن"

به هەڵسوکەوت کردن بەم ئایەتە پیرۆزە و هاوشێوەکانی، زانایانی ئیسلام فەرموویانە کە لە پاش شایەتی(لا إله إلا الله محمد رسول الله)دا سێهەمین حەقیقەت کە پێویست بێت قەبوڵ بکرێت و بچەسپێت برایەتی موسوڵمانانە. واتە قەبوڵ کردن و وەکو پێویست کارکردن بەو ڕاستییەی کە دەبێت بە کۆمەڵ بژین.

نوێژ کردن بە جەماعەت و پێدانی زەکات و سەدەقە لە لایەن دەوڵەمەندانەوە بۆ هەژاران و، بە جێهێنانی حەج و نوێژی جەژن و نوێژی هەینی و قەبوڵ بوونیان وەك جەژنی ساڵانە و هەفتانە و هەموو ئەو مەرج و دروشمانەی کە ئیسلام هێناونی، ئەم بنچینانە دەری دەخەن کە ئاینەکەمان چەندە بایەخ بە جەماعەت و ڕۆحی بە کۆمەڵ دەدات. وە بەڵگەی ڕوونیشن لە سەر پێویستیی ڕەها بە نوێ کردنەوەی

زوویەزووی ئەم ڕۆحیەتە بۆ مەبەستی بەردەوامیی و دامەزراندنی.

بنیاتنانی برایەتی لە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەدا لە لایەن پێغەمبەری ئازیزمانەوە، هەر لەگەڵ گەشتنیاندا بۆ مەدینە، ئاماژەیە بۆ چی؟ ئایا ئەم مامەڵەیە پێویستیمان بە ڕۆحی بە کۆمەڵ و گرنگی دان بە بنیاتنانی ئەم هەستە دەرناخات؟

بە تایبەت لە سەردەمێکی وەك ئێستادا کە گوناهەکان لە هەر چوار لاوە دادەبارێن، هەرگیز ئەو هەست و بیرە تەندروست نییە کە بڵێین: "من دەتوانم بە تەنها پارێزگاری لە ئاین و ئیمانەکەم بکەم." شەقامەکان، مەیدانەکان، تەلەفیزیۆنەکان، ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بڵاو کراوەکان، پێشەنگاکان، ئینتەرنێت و هەموو ژینگەیەك پڕە لەو تابلۆیانەی کە مرۆڤ بۆ گوناه بانگهێشت دەکەن. ئیدی لە بەرامبەر هێرش و لافاوێکی ترسناکی وەهادا، ئارامگرتن و پارێزگاریکردن لە ئیمان و ئەخلاق، تەنها بەوە دەبێ کە موسوڵمانان وەك یەك جەستە بجوڵێنەوە و بەو جۆرە دەبێت کە بە ماهییەتی تەمسیل کردنی کەسێتیی مەعنەوی ئیمان و ئیسلام، خزمەت پێشکەش بکەن.

## ئەو نیشانانە چین کە پێویستە لە ژیانی بەکۆمەڵی موسوڵماناندا هەبن؟

١) موسڵمانێك کە لە ڕۆحی ژیانی بە کۆمەڵ تێگەیشتووە نابێت ئازاری هەستەکانی کەس بدات. دەبێت دووربکەوێتەوە لەو دەربڕین و هەڵوێستانەی کە شکۆداری و دەروونی کەسانی دی بریندار دەکەن.

ئیماندار دەبێت لە بەرامبەر خۆیدا داواکار بێت و بەرامبەر ئیماندارانی دیش وەك پارێزەر بێت. گەڕان لە دووی ناتەواوییەکانی خەڵکی بێ ئەدەبییە. باس کردنیان لەملاولا هەڵەیەکە لێبووردنی نییە. ئەو هەڵانەش کە لە مرۆڤەکان دەبینرێن پێویستە بە شێوازێکی نەرم و بە زمانێکی چاکساز ڕێك بکرێنەوە.

٢) پێویستە مرۆڤ خۆی وەك یەکێك لە مرۆڤەکان ببینێت، خۆ بەکەمزانین بکاتە دروشم. دەبێت خۆی بە دووربگرێت لەو بابەتانەی پاڵی دەنێن بەرەو خۆ بە زلزانی و لوتبەرزی. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لە پلەو پایەیەکی بەرزدایە، پێویستە خۆی بە یەکێك لە خەڵك بزانێت.

بوونی کەسێك لە نێو کۆمەڵێکی وەها ڕێکوپێکدا چەندێك پێگەیشتوو خۆی دەردەخات، ئەوەندەش کەماڵی کۆمەڵەکە دەردەخات کە لە ناویدایە.

٣) ئیماندار پێویستە تا دەتوانێ لە فیتنە و فەساد بەدووربێت و هەمیشە لە پاڵ چاکسازیدا بێت. لەبەرئەوە ئیمانداره ڕاستەقینەکان هەمیشە پاسەوانی ئاشتەوایی و سازان و دڵنیایین.

٤) متمانەیەکی پتەو لە ناو ئەو تاکانەدا هەیە کە خاوەنی ڕۆحی بەکۆمەڵن. ئەوان هەم متمانە بە یەکدی دەکەن و هەم متمانە دەبەخشن. هەرگیز هاوڕێکانیان دووچاری نائومێدی ناکەن و عەشق و شەوقیان بەرامبەر خزمەتکردنی ئیمان و قورئان ناشکێنن.

٥) دەبێت سەرکەوتنەکان نەدرێنە پاڵ هەوڵ و کەماڵاتە کەسییەکان،

بەڵکو ببەسترێنەوە بەو میهرەبانییەوە کە دەڕژێتە سەر کەسێتی مەعنەوی جەماعەت. ئەم هەستە، هەروەك هۆکارە بۆ یەکێتی و خۆشەویستی، لە هەمان کاتیشدا دەبێت بە سوپاسگوزارییەکی مەعنەوی.

بەشی خوێندنەوە

## کۆمەڵەی پەسەند

حەزرەتی سوفیانی کوڕی عویەینە دەفەرموێت: ''گەر مرۆڤەکان لە شوێنێك کۆببنەوە و باسی خوا بکەن، ئەو کاتە شەیتان و دونیا (لەو ڕووەوە کە فانییە) لەوێ دوور دەکەونەوە.''

شەیتان بە خەمبارییەوە دەڵێت:

- دەبینی ئەو مرۆڤانە چی دەکەن؟

دونیاش دڵی دەداتەوە و، دەڵێت:

- تۆ ئێستا نزیکیان مەکەوە... کاتێك لێرە ڕۆشتن من یەك یەك ئەوانت بۆ دەگرم و تەسلیمت دەکەم.

لەبەرئەمەیە کە ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەر جەماعەتە. وە بڕیاری چەندین کاری گرنگ لەم شوێنانەدا دراون و یەکەمین تۆوەکانی میوەی پڕ بەرەکەت لەم جۆرە پێکەوەبوونانەدا وەشێنراون.

مرۆڤ چەندە بچێتە ئەو مەجلیسانەوە و، ماڵ و شوێنی کارەکەی بکات بە جێگای ئەم جۆرە کۆڕانە، ئەوەندە لە تەڵەکانی شەیتان و دونیا بە دوور دەبێت. پێویستە کەشی ئەو مەجلیسانە ببرێتە هەموو شوێنێك.

لە هەموو شوێنێك ئەوشتانە باس بكرێت كە لەوێ باس كراوە، ژیانیش بە ڕەنگی ئەو وانە نوورانییانەی ئەوێ ڕەنگ بكرێت.

ئەوانەی دەڵێن: ”من گەر نەشیەم لە گەڵتانم“، ئەوانەن كە ناتوانن هەست بە بارینی ڕێژنەی نووری ئەو هەوایە و ئەو گەنجینەیە بكەن. وەك چۆن لێرە بێبەشبوونیان ئاشكرایە، لەولاش كاتێك دیارییەكان بەسەر ئەو كۆمەڵە نوورانییانە دابەشدەكرێت، هەر ئاشكرا دەبێت.

وتەی "بە دڵ لە گەڵتانم" یان "دڵم لە لاتانە"، هێندەی وتەی "عەقڵم لە لاتە" ی كەسێك بێمانایە كاتێك دەعوەتی دەكەن بۆ نان و خوانێك، وە هێندەی سەرزەنشتی قوتابییەكی لێ نەهاتوو و ناتەواوە كە بێ ئەوەی چووبێتە كۆلێژی پزیشكی، داوای بڕوانامە دەكات و دەیەوێت بە گوتەی "دڵم لە گەڵتانبوو" دەستی خۆی بخات.

### بەدیعوززەمان چۆن باسی ڕۆحی پێكەوە بوونمان بۆ دەكات؟

لەم بارەیەوە مامۆستا بەدیعوززەمان ئاماژە بەوە دەكات كە ئەو مرۆڤە گەرم و گوڕ و ڕاستگۆ و فیداكارانەی كە لە كاروباری قیامەتدا بە گوێرەی دەستووری هاوبەشیكردن هەڵسوكەوت دەكەن و نهێنی هاوكاری و یارمەتیدانی یەكتر دەكەنە ڕێبازیان، هەر یەكێكیان نەك وەك یەك زمان و یەك عەقڵ و یەك دڵ، بەڵكو هێندەی ژمارەی براكانی زمان و عەقڵ و دڵی دەبێت و بەو جۆرە بە هەستێكی بەتینەوە، بەندایەتی و داوای لێخۆشبوون دەكات. واتە ئەو گوناهانەی كە لە هەزار لاوە هێرش دەكەن، خۆیان لە بەرامبەر هەزاران زمان و

دڵدا دەبیننەوە، بەم جۆرە ئەو کەسە لە مەترسی و زیانە ماددی و مەعنەوییەکان پارێزراو دەبێت.

کارکردنی کەسێك بە تاك جیاوازە لە کارکردنی لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکدا. ئەوانەی لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکدا خزمەت دەکەن، بە گوێرەی بەهای ئەو کۆمەڵەیەی کە پێکیانهێناوە و ڕاستگۆییان بۆ ئەو پەیمانانەی کە بە یەکیانداوە، بە شێوازێکی بەرز کەڵك لە بابەتە هاوبەشەکانی یەکدی وەردەگرن. کارە پەرتوبڵاوەکان ئەرك و زەحمەتیان زۆرە و بەرهەمیشیان کەمە. بەڵام هەریەك لەوانەی کە بە کۆمەڵ کاریان کردووە و بە پشتبەستن بە ڕێککەوتن و پەیمانێك، لێهاتوویی جۆراوجۆر و کارە جیاجیاکانیان بە دڵسۆزی و لە خۆ بووردەییەوە یەك خستووە، بە عەشق و شەوقەوە باوەشیان بە کارەکەیاندا کردووە، لەگەڵ وەرگرتنی حەقی ئەو کارانەی خۆیاندا، بە زیادیشەوە سوودمەند دەبن لە کار و دەسکەوتەکانی برا و هاوکارەکانیان و بەشیان تیایدا دەبێت. بۆیە ئەوانەی ئەهلی ئیمان و تەقوان و بۆ زیندووکردنەوەی ئیسلام تێدەکۆشن، لە بەر ئەوەی کارگەیەکی مەعنەوییان بنیاتناوە، نەك تەنها لە کردەوە و هەوڵەکانی خۆیان، بەڵکو بە شێوەیەکی دەراسا لە بەخشندەیی و میهرەبانی خوای گەورە بەرەکەت و نووریان بە نسیب دەبێت.

بۆ نموونە ئەندامێکی کەسێتی مەعنەوی و سوودمەندبوون لەو ئەنجامە گشتی و قازانجە بەرفراوانەی کە ڕوو لەو جەماعەتە دەکات، کۆمەڵە مەرجێکی هەیە، وەك دڵسۆزی و خزمەتکردن و

تەقوا (دووركەوتنەوە لە حەرامەكان) و كردەوەی چاك (بەجیٚ هێنانی فەرزەكان) و نزاكردن بۆ هاوەڵەكانی و هەڵسوكەوت كردن بە پێی دەستوورەكانی برایەتی. مرۆڤ بەگوێرەی بەجێهێنانی ئەم مەرجانە و نیەتی خۆی، كەڵك لەو میهر و بەرەكەتە دەبینیٚ كە ڕوو لە جەماعەت دەكات. بەم جۆرە دەشێت بچێتە نێو دەستەی ئەوانەی خۆشبەختی هەمیشەیی و ڕزگاربوونی ڕاستەقینەیان بەدەستهێناوە.

## سۆزی خوای گەورە لەگەڵ جەماعەتدایە

ژیان لە ناو كۆمەڵدا لە ڕوانگەی پاداشتیشەوە كارێكی تابڵێی پڕ دەستكەوتە. چونكە تەنانەت گەر ئەو كارانەش كە جوزئی و سادەن، بە كۆمەڵ بكرێن، لە ڕوانگەی پاداشتەوە دەگۆڕێن بۆ پاداشتی كوللی و گشتگیر. چونكە ژیان لەناو كۆمەڵێكدا واتە بەشداری كردن لە كارگەیەكی مەعنەویدا كە تەنها و تەنها بۆ ئاخیرەت بنیات نراوە. بەم جۆرە ئەو قازانجەی كە ئەم شەریكەیە بۆ ئەندامان و هاوبەشانی خۆی دەستەبەری دەكات كە بە بەشداری ملیۆنان كەس بەڕێوە دەچێت، بێگومان گەلێك لە قازانجی تاكە كەسێك زۆرترە.

"سۆز و قودرەتی خوای گەورە لە گەڵ جەماعەتدایە."[1] لە ڕاستی ئەم فەرموودە پیرۆزەوە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە كەرەم و سۆز و میهرەبانی خوای گەورە ڕوو لە جەماعەت دەكات. مادەم وایە پێویستە كەسێتی مەعنەوی خاوەن هەست و ڕۆحێكی بە كۆمەڵ بێت، كە

١. الترمذي، الفتن، ٧؛ النسائي، التحريم، ٦.

ئەهلی ئیمان تەمسیلی دەکات تاوەکو ئەو میهرەبانییە خواییەی کە ڕوو لە هەمووان دەکات زیاتر بێت.

ئەو کەسەی وا دەزانێت پێویستی بە کەس نییە و خۆی بە تەنها لە ژێر باری قورسی ئەرکە ماددی و مەعنەوییەکان دەردەچێت، لە نێو بە هەڵەداچوونێکی گەورەدایە. بە ئەنقەست ئارامی و ئاسوودەیی خۆی جێدێڵێت و بە ئاشکرا دەچێتە نێو زیان و بێبەشبوونەوە. چونکە کەسێکی وەها هەوڵی ئەوە دەدات خۆی بە تەنها بە یەك عەقڵ و یەك دڵ و دوو چاو و دوو گوێوە، واتە بە ئەندازەی هێز و توانای خۆی بابەتەکان چارەسەر بکات و تێیانبگات و بیانبینێت و بیانبیستێت و زاڵ ببێت بە سەریاندا. لە کاتێکدا ئەو کەسەی لە نێو کۆمەڵێکدا دەژی هێندەی ژمارەی ئەو کەسانەی دەیانناسێت و پرسیان پێ دەکات یاخود پەیوەندی لەگەڵیان هەیە و ڕێز لە بیر و تواناکانیان دەگرێت، دارای عەقڵ و چاو و گوێ و دەست و قاچ دەبێت و بە ئەندازەی ئەو توانا گەورە و ئیرادە فراوانەی کە کۆمەڵەکە هەیەتی کار دەکات.

پێغەمبەری ئازیزمان(صَلَّىَاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) فەرموویەتی: ”کێ بستێك لە جەماعەت دووربکەوێتەوە، زنجیرەی ئیسلامەتی لە ملی خۆی کردووەتەوە.“ بەم شێوەیە ئاشکرا بۆمان دەردەخات کە ئیسلام ئاینی جەماعەتە و، پێویستە موسوڵمانان خاوەنی ڕۆحی بە کۆمەڵ بن و ئاینەکەیان بە کۆمەڵ پراکتیزە بکەن.

## ئەو لایانانە چین کە دەبێت کەسانی نێو جەماعەت وریای بن؟

ئەوانەی بە کۆمەڵ دەژین پێویستە سەرنجی ئەم لایانانەی لای خوارەوە بدەن و ئەم خاڵانە بکەنە کرۆکی ژیانیان.

١) پێویستە ئیماندار ئەو هاوڕێیانەی کە پێکەوە لە گەڵیاندا خزمەت دەکات لەبەر خاتری خوا زۆر خۆشبوێن و هەمیشە لە پەیوەندیدا بێت لە گەڵیان.

٢) دەبێت خاوەنی دەستووری (الفناء في الاخوان) بێت. دەستووری "تووانەوە لە برایاندا" بریتییە لەوەی بگەیت بە کەماڵی تەواوەتی لە خۆشەویستی دوولایەن و ببیت بە خاوەنی ئاستێکی ئەخلاقی وەها، کە لە هەموو نیعمەتە ماددی و مەعنەوییەکاندا بە شادمانی و ئامادەییەکی تەواوەوە براکەت پێش خۆت بخەیت. بەم جۆرە ئەو کەسە دەچێتە نێو دونیای بیر و هەستی براکانیەوە و لەگەڵ ئەواندا دڵخۆش دەبێت و لە گەڵیاندا خەمبار دەبێت.

٣) بە بێ ڕاوێژ کارنەکات و ڕێز لەو بیر و باوەڕانە بگرێت کە براکانی کۆکن لە سەری.

٤) لەگەڵ هەموو کەسێکدا خۆی بگونجێنێت و موناقەشە لەگەڵ کەسدا نەکات.

٥) بەرامبەر گەورەکان بەڕێز و بەرامبەر بچووکەکانیش میهرەبان بێت.

٦) نەرم و نیانی بکاتە بنچینەی هەڵسوکەوتەکانی.

٧) دوعا بۆ سەرکەوتن و سەرفرازیی دونیا و ئاخیرەت و ماددی

و مەعنەوی هەر یەك لەو برایانەی بكات، كە كەسێتی مەعنەویی پێك دەهێنن.

## نابێت جەماعەتەكان بكرێن بە هۆكار بۆ پەرتەوازەبوون!

بوونە جەماعەت ئاسایی و سروشتییە، ئەوەی نائاساییە ئەوەیە كە ئەم بوون بە كۆمەڵە بكرێتە هۆكارێك بۆ جودایی و ناكۆكی. پەیوەندی نێوان تاكەكانی كۆمەڵەیەك لە نێوان خۆیاندا چەندە گرنگ و شایەنی باس بێت، پەیوەندی باش لە نێوان كۆمەڵەكانیشدا هێندە مەرجێكی گرنگ و شایەنی هەڵوێستەیە. گەر وەها نەبێت پێكەوە بوونەكان دەبنە مایەی دابەش بوون و پەرت بوون و تووانەوە. ئەمەش زیانێكی گەورەیە بۆ ئیسلام. تاكە چارەسەری ڕزگاربوونیش لەمە جەم بوون و پارێزگاریكردن لە یەكێتی و پێكەوەبوونە. لەم بابەتەشدا بە باشی دەزانین چەند بنچینەیەك بهێنینەوە یاد:

١) نابێت هیچ كۆمەڵەیەك دژی هیچ كۆمەڵەیەكی دی بوەستێت.

٢) تاكەكانی كۆمەڵەیەك بەڕێزبن بەرامبەر بە كەسە گەورەكانی نێو كۆمەڵەیەكی تر و هەمیشە بەڕێزەوە ناویان بهێنن.

٣) هەموو كۆمەڵەكان بە دەم خەمی یەكترەوە بن و لە خۆشیشیاندا هاوبەشیان بن.

گەر ئەمانەی باسمان كرد گرانیش بوون لە سەر نەفسمان، پێویستە زۆر لە نەفسەكان بكرێت و لەم بارەوە قایل بكرێن.

## مادەم ئاین هەیە، ئیدی چ پێویستیمان بە جەماعەت هەیە؟

با هەوڵ بدەین ئەم پرسیارە لە ڕێگەی نموونەیەکەوە شی بکەینەوە. هەر یەك لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ فەرمانی جیا جیا بەجێدێنێت و هەمووشیان ڕۆڵی جۆراوجۆر دەگێڕن لە بەردەوامی دان بە ژیانی مرۆڤ. گەر چاو بڵێت: "وەرن هەمووتان وەك من بن." ئەم وتەیە هەم زیانە و هەم مەحاڵیشە. لەو کاتەدا گونجاوترین وتە ئەوەیە هەموو ئەندامەکان بێن و بڵێن: "با ئامانجمان یەك بێت، با هەر کەسە و بە ئەندازەی توانای خۆی خزمەت بە جەستە و بەردەوامی دان بە ژیان بکات."

دەکرێت بەم جۆرە لە کۆمەڵە و تەریقەت و جیاوازیی مەزهەبەکان بڕوانین. هەموویان وەك ئەندامە جیاجیاکانی جەستە وەهان، بەڵام دەبێت تاکە ئامانجێکیان هەبێت ئەویش خزمەت کردنە بە مرۆڤایەتی لە پێناوی خوای گەورەدا. گەر ئامانج یەك بێت، جیاوازی ناوەکان گرنگ نابێت.

لایەنێکی گرنگی تریش ئەمەیە، کۆمەڵەکان ئەرکی سەرشانی خۆیان جێبەجێ بکەن و ڕەخنە لە یەکدی نەگرن. گەر لە مرۆڤەکان

بپرسین: "باشترین دایکی دونیا کێیە؟" بە گشتی هەموو کەس دەڵێت: "دایکی من". ئەو کەسە لەم وەڵامەیدا بە گوێرەی خۆی لەسەر حەقە. بەڵام ئەم وەڵامە مانای ئەوە نییە کە دایکانی تری دونیا باش نین.

گەر لە ئێمەش بپرسرێت جوانترین مەزهەب و مەشرەب کامەیە، دەکرێت بڵێین: "باشترینیان ئەوەی منە." خەڵکانی تریش دەکرێت وەها بیر بکەنەوە. کەسیش ئەمەی پێ ناخۆش نابێت و ئەو کاتەش جودایی و دوژمنایەتی نامێنێت.

کۆمەڵەکان وەك ئەو ئەندامانە وەهان کە هەوڵ دەدەن بەردەوامی بە ژیانی مەعنەوی کۆمەڵگا بدەن. بە واتایەکی تر وەك کۆلێژە جیاوازەکانی زانکۆی ئیسلام وان. هەتا ئامانجیان یەك بێت لە دابەش کردنی ئەم ئەرکەدا -بە ویستی خوای گەورە- ڕەزامەندی خوا بە دەست دێنن.

هەر وەك چۆن ژیانی ئێمە لە خواوە بەخشراوە، ڕێچکەی ژیانیشمان هەر لە لایەن خواوە دیاری دەکرێت. واتە، بۆ بوونی مرۆڤ چی پێویست بێت، دیسان لە لایەن خوای گەورەوە دیاری دەکرێت. بۆ ئەمە پێویستمان بە هیچ دەسەڵاتێکی تر نابێت. لەبەر ئەوە ئەو دامەزراوەی پێغەمبەرایەتییەش کە یاساکانی خوای گەورە دەکات بە سیستەم، بێگومان لە لایەن خوای گەورەوە بنیات دەنرێت و بەڕێوە دەبرێت. واتە لە سەرەتا قورئان و پاشانیش سوننەتی پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕابەری ئێمەن. مەزهەبە ڕاستەکانیشمان کە سوود لەم دوو سەرچاوەیە

دەبینن بە هەمان شێوە دامەزراوەی ئاینین، کە ئێمە لە خوای گەورە نزیك دەکەنەوە. ئەو دەستوور و بنچینانەش کە ئەوان دەیخەنە پێش چاو بە تەواوەتی گوڵچنی قورئان و سوننەتن. لە بەر ئەمە ئەوانیش پێکهاتەی ئاینی ئیسلامن و ناتوانین دەستبەرداریان ببین.

کۆمەڵەکانیش بە مەرجێك تەنها ئیخلاس و ڕەزامەندی خوا بکەنە بناغە، لە چوارچێوەی ئایندان. چونکە ئەو زانایانەی کە ڕابەری ئەم ڕێبازانەن، دەبینن کە لە هەموو پەڕەیەکی ژیاننامەیاندا دیدگای "من چۆن بتوانم ڕەزامەندی خوا دەست بخەم؟ چۆن بتوانم ئەم مرۆڤانە بە خوا ئاشنا بکەم؟" هەیە.

لە بەرئەوە دەبێت ئامۆژگاری و فەرمانەکانی ئەم جۆرە زانا و ڕابەرانەش لە نێو چوارچێوەی ئایندا هەژمار بکرێن، چونکە ئامۆژگارییەکانیان، لە ژێر ڕۆشنایی دەستوورە خواییەکاندایە و، مەبەست لێی ڕەزامەندی خوای گەورەیە و سەرچاوەکەشی قورئان و فەرموودەیە.

# ١١. زیکر و تەسبیحات

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾

(الأحزاب: ٤١-٤٢)

"ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! زۆر یادی خوا بکەن، زوو زوو ناوی بهێنن! وە بەیانی و ئێوارەش تەسبیحاتی ئەو بکەن!"

## زیکر بەواتای چی دێت؟

لەڕووی وشەزانییەوە زیکر بە واتاکانی یادکردنەوە و وەبیرهاتنەوەی پەروەردگار و خوێندنەوەی چەند دوعایەکی تایبەت بە شێوە و ژمارەیەکی دیاریکراو دێت. هەروەها بە واتای ئەوە دێت کە ئادەمیزاد هۆشیارانە بژی و بە تێڕامان و پەند وەرگرتنەوە تەماشای هەموو دروستکراوێك بکات و چەندین پەیامی لێ هەڵبگۆزێت. زیکر لەم ڕووەوە مرۆڤ بە خێراترین شێوە لە خوای پەروەردگار نزیك دەکاتەوە.

یەکێك لە گرنگترین چەمکەکانی قورئانی پیرۆز لەمەڕ یادکردنەوەی پەروەردگار، بێ هیچ گومانێك زیکرە. ئاماژەدانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەوەی کە هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤی ئیماندار لەحاڵەتی زیکری خوای گەورەدایە، زۆر بەجوانی ڕەهەندەکانی زیکر و پەرستشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

(آل عمران: ١٩١)

"ئەوانەی بە پێوە و بە دانیشتنەوە و بە ڕاکشانەوە یادی خوا دەکەن، واتە:لە هەموو حاڵێکدا ناوی خوا ئەهێنن و بیر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان دەکەنەوە و دەڵێن: پەروەردگارا! تۆ ئەمانەت بە خۆڕایی و بێ کاکڵە دروست نەکردووە، پاکی و بێخەوشی بۆ تۆیە، خوایە! تۆ لەوە دووریت، کە شتی بێهوودە دروست بکەیت. خوایە بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ."

زیکر کە خۆی خودی ژیانە، تەنانەت لە کاتی پێویستییە سەرەتاییەکانی ئادەمیزاددا وەك خواردن و خواردنەوە و خەوتن، ناهێڵێت خوایەتی و بەندایەتیمان بیربچێتەوە و، یادمان دەخاتەوە.

## قورئانی پیرۆز چۆن باسی زیکر دەکات؟

کاتێك تەماشای قورئانی پیرۆز دەکەین، دەبینین وشەی زیکر بە داتاشراوەکانیەوە (٢٩٢) جار ئاماژەی پێکراوە و خودی وشەی "زیکر"یش

بەتەنها (٧٦) جار هاتووە، ئەمەش گرنگیی زیکرمان نیشان دەدات.

لە قورئانی پیرۆزدا بە واتاکانی؛ ئاماژەپێکردن، باسکردن، ئاخاوتن، وەبیرهێنانەوە، یادکردنەوە، قەدرشناسی، پەسن کردن، ستایش کردن، شوکر کردن، تەکبیرکردن، بەدەمەوەچوون، دوعا و لالانەوە، وتە، چیرۆك، هەواڵ، کتێب، پەڕاو، نارده، قورئان، دابەزینی کتێبە ئاسمانییەکانی تری جگە لە قورئان، پێغەمبەر، شان، شکۆ، شکۆبەخش، ئامۆژگاری و پاڵنەری بیرکردنەوە، بیر، ئاگادارکردنەوە و ئامۆژگاری، بەڵگە، وتاری پڕ لە پەند. وەکو دەبینین وشەی "زیکر" بە چەندین واتای جیاواز هاتووە.

لەدوای ئەم پێناسانەوە بەڕوونی دەردەکەوێت کە زیکر تەنها بەواتای وتنی وشەی (اللّٰه) یان ئەو کۆمەڵە وشە و دەستەواژانە نایەت کە بە دووبارەکردنەوەیان خوای گەورەمان وەبیردەکەوێتەوە، لەبەر ئەمە زانایانی ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا زیکریان لە سێ بابەتی سەرەکیدا کۆکردووەتەوە:

یەکەمیان، یادکردنەوە و وەبیرهێنانەوەی پەروەردگار و ناوە جوانەکانی ئەوە، واتە "سوپاس و ستایش کردنی و، تەسبیح کردنی (بەپاك ڕاگرتن) و دانپێدانان بە گەورەیی ئەو و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و دوعا کردن." هەموو ئەمانە ئەو بەشەی زیکرە کە تایبەتە بەزمانەوە.

دووەم بەشی زیکر بیرکردنەوەیە لە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە و ئەو بەڵگانەی کە ئاماژە بە بوونی خوای گەورە دەکەن و، بیرکردنەوە لە فەرمان و قەدەغەکراوەکان و یاساکانی و داواکارییەکانی و پەیمان و

هەرِەشەکانی و ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە بەندایەتییەوە و، هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە حیکمەت و بەڵگەکانی ئەمانە و، بیرکردنەوە لە هەموو دروستکراوەکان و بیرکردنەوە لە بەڵگە ئەنفوسی (خۆیی) و ئافاقییەکان و نهێنی بەدیهاتنیان و، بینینی حیکمەتە خواییەکانی نێو هەموو گەردیلەکانی بوون، ئەمەش زیکرێکی فیکرییە و تایبەتە بە دڵەوە.

بەشی سێیەمی زیکریش ئەوەیە کە جەستەش بەو ئەرك و فەرمانانەی پێی سپێرراوە سەرقاڵ بێت و دووربکەوێتەوە لەو قەدەغەکراوانەی لەسەریەتی.

بنەمای زیکر، زیکری سەرەکی زیکری دڵ و ناخە و غافڵ نەبوونە لە پەروەردگار، ئەمەش بە گشتی سێ جۆرە:

١) بیرکردنەوە لەو چەمکانەی بەڵگەن لەسەر بوونی خوای گەورە و، دوورکەوتنەوە لە گومانەکان و تێڕامانە لەناو و سیفەتەکانی خوای گەورە.

٢) بیرکردنەوە لە یاسا و ئەرکی بەندایەتی و فەرمان و شتە قەدەغەکراوەکان و پەیمان و هەرِەشەکانی خوای گەورە. (بیرکردنەوە لە خۆیان و بەڵگەکانیان).

٣) بریتییە لە تەماشاکردن و بیرکردنەوە لە بوونەوەرە ماددی و مەعنەویەکان و تێڕامان لە نهێنی بەدیهێنانیان، بەمەگەردیلە دەبێتە ئاوێنەی جیهانێکی پیرۆز. ئەوانەی بەم شێوەیە تەماشای ئەم ئاوێنەیە

دەکەن نووری ئەو جیهانە درەوشاوە و گەورەیە دەبینن. ئەو چێژەی کە لەمەوە وەردەگیرێت چەند ساتێکە و هێندەی چاو تروکاندنێکە، بەڵام بە ئەندازەی هەموو بوون نرخی هەیە، وە ئەم مەقامەی زیکر کۆتایی و لوتکەی نییە.

## سەروەرمان دەربارەی زیکر چی دەفەرموێت؟

کاتێك تەماشای فەرمودەکانی سەروەرمان دەکەین، دەبینین کە سەروەرمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گرنگییەکی زۆری بە زیکر داوە، لەم بارەیەشەوە زۆر زانیاری لە کتێبەکانی فەرموودەدا تۆمار کراون. ئێمە کۆمەڵێك لەوانە هەڵدەبژێرین و دەیانخەینە ڕوو.

حەزرەتی ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ”سەردارمان ڕۆژێکیان دەچوو بۆ مەککە، کاتێك گەیشتە چیایەك کە پێی دەگوترا (جومدان)، بەوانەی لەگەڵیدا بوون فەرمووی: ”جومدان تێپەڕێنن چونکە موفەرریدەکان دەمێکە تێیانپەڕاندووە“، کە لێیان پرسی ئەی پێغەمبەری خوا موفەرریدەکان کێن و چین؟، فەرمووی: ”ئەو پیاو و ئافرەتانەن کە زۆر زیکری خوای گەورە دەکەن.“ لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ”موفەرریدەکان ئەوانەن کە تا ڕادەی عیشق و خوو وابەستەی زیکر بوون، ئەو زیکرانەی ئەوان کردوویانە قورساییەکانی سەرشانیان سوك دەکات و لەڕۆژی دواییدا لە کۆڵەکانی (سەرشانیان) ڕزگاریان دەبێت و دەحەسێنەوە و بەو شێوەیە دەچنە خزمەتی پەروەردگار“.[1]

---

١. مسلم ٢٠٦٢/٤.

هەروەها حەزرەتی مەعازی کوڕی ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) کە یەکێکە لە هاوەڵان، دەگێڕێتەوە: "پیاوێك لە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيْهِ)ی پرسی: "پاداشتی کام موجاهیدانە لەوانی دیکە زیاترە؟" شانازیی مرۆڤایەتی فەرمووی: "ئەوانەیان کە زۆرترین زیکر دەکەن." ئەم جارە هاوەڵەکە پرسیارێکی تری کرد: "پاداشتی کام یەکێك لە بەندە باشەکان زیاترە؟" پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دیسان هەمان وەڵامی فەرموویەوە: "ئەوانەیان کە زۆرترین زیکر دەکەن" ئەو پیاوە "هاوەڵە" هەمان پرسیاری سەبارەت بە نوێژخوێنان، حاجیانیماڵی خوا و ڕۆژووگران کردەوە و سەردارمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە وەڵامی هەموویاندا فەرمووی: "ئەوانەیان کە زۆرترین یادی خوا دەکەن" پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر بە حەزرەتی عومەری فەرموو: "ئەوانەی زیکری خوای گەورە دەکەن پاداشتیان بۆ ئێمە نەهێشتەوە"، پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) فەرمووی: "بەڵێ." [١]

ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودە هەرە گرنگانەی کە باسی گەورەیی زیکر دەکەن. ئامۆزای سەروەرمان ئیبن عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بۆمان باس دەکات: "ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ السَّلَام) بەلای عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەدا تێپەڕبوو لە کاتێکدا کە ئامۆژگاری هاوڕێکانی دەکرد، پێی فەرموون: "ئێوە کۆمەڵێکن کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووم ئارام بگرم لەسەرتان" و پاشان درێژەی بە وتەکانیدا و، فەرمووی:

---

١. الهيثمي، مجمع الزوائد، ١٠/٧١.

”باش گوێ ڕادێرن! ئێوە لێرە چەند کەس دانیشتبن ئەوەندە فریشتەش لەگەڵتان دانیشتوون، ئێوە تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن ئەوانیش تەسبیحی خوای گەورە دەکەن، کاتێك ئێوە سوپاسگوزاریی خوای گەورە دەکەن، ئەوانیش سوپاسگوزاری خوای گەورە دەکەن، کە ئێوە پەروەردگار بەگەورە دەگرن، ئەوانیش بە "الله اکبر" کردن شایەتی لەسەر مەزنیی ئەو دەدەن.“

پاشان ئەو فریشتانە دەچنە خزمەتی خوای گەورە. هەرچەندە پەروەردگار لە فریشتەکان باشتر دەزانێت کە بەندەکانی سەرقاڵی چی بوون، فریشتەکان دەڵێن: ”ئەی پەروەردگارمان، بەندەکانت تۆیان لە هەموو ناتەواوییەك پاك ڕاگرت، ئێمەش تەسبیحمان کردیت، (الله اکبر) یان کرد و ئێمەش بەهەمان شێوە، پاشان سوپاسگوزاریی تۆیان کرد و ئێمەش هەروەها.“

پەروەردگاریشمان لە بەرامبەردا دەفەرموێت: ”فریشتەکانم! ئێوە بە شایەت دەگرم، من لەوان خۆشبووم.“ فریشتەکانیش دەڵێن : ”بەڵام لەناو ئەواندا فلان و فیساریان لەگەڵدا بوو کە زۆر گوناهبارن.“ خوای گەورە دەفەرموێت: ” ئەوان کۆمەڵێکن هیچ کەسێك لەوانەی لەگەڵیان دادەنیشێت بەدبەخت نابێت.“[1]

لە لایەکی دیکەوە ئەم فەرموودەیە جارێکی دیکە ئەوەمان پێدەڵێتەوە کە دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان لە سەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)دا هەبووە. عەبدوڵای کوڕی

١. ابن حبان، صحیح، ١٣٩/٣.

عەبباسیش (رضيَ‌اللهُ‌عَنهُما) دەفەرموێت: "من بەوەدا دەمزانی لە نوێژ بوونەتەوە کە زیکرەکەم گوێ لێدەبوو."

## زیکر سەلامەتترین ڕێگەیە کە مرۆڤ دەگەیەنێت بە خوای گەورە

لەناو ئەو ڕێگایانەی کە مرۆڤ بەخوای گەورە دەگەیەنن زیکر سەلامەتترینیانە، هەر شتێك کە پەروەردگارمان وەبیربهێنێتەوە دەکرێت لەژێر چەتری زیکردا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

بۆ نموونە لە شوێنێك کەسێك باسی خوای گەورە دەکات و گوێگرەکان لەژێر کاریگەریی ئەو وتانەدا پەروەردگاریان وەبیردێتەوە، کەواتە لەو کۆڕەدا یادی پەروەردگار دەکرێتەوە. واتە هەروەك چۆن دووبارەکردنەوەی ناوێك یان سیفەتێکی پەروەردگار یان چەند دانەیەکیان پێکەوە زیکرە، بەهەمان شێوە هەموو کۆڕ و دانیشتنێکیش کە پەروەردگار وەبیربهێنێتەوە بە واتای زیکر دێت.

بەڵێ، ئەو تەسبیحاتانەش کە لە پاش نوێژ دەکرێن، خوێندنەوەی دوعا کۆکراوەکان، دوعای جەوشەن و ئەو ویردانەی ڕۆژانە ئەنجام دەدرێن، ئەمانەش دەچنە چوارچێوەی زیکرەوە.

"بەهەر شێوازێك بێت زیکری پەروەردگار بەهێزترین و سەلامەتترین ڕێگەی گەیشتنە بە پەروەردگار. بەبێ بوونی زیکر نزیك بوونەوە لە پەروەردگار کارێکی یەکجار ئەستەمە! بەڵێ، یادکردنەوەی پەروەردگار، بە جۆرێك کۆئەندامە مەعنەوی و ناسکەکانی مرۆڤیش هەردەم باسی

ئەو بکەن و فەرمانبەریی زاریش ببێت بە وەرگێڕی ئەم هاوئاهەنگییە، ئای ئەمە چ توێشویەکی نەبڕاوە و چ چاوگێکی پڕ فەڕە بۆ ڕێبوارانی ڕێی نەمری"[1]

ئێمە لە پاڵ ژیانی ماددیماندا ژیانێکی مەعنەویمان هەیە و ناوەندی ئەم ژیانەشمان دڵەکانی تێدایە. دڵەکانمان توانای کردنی چاکە و خراپەشیان هەیە. ئەگەر دڵمان لەو پێناوەدا بەکارهێنا کە بۆی بەدیهێنراوە، ئەوا بێگومان دەمانگەیەنێتە پەروەردگار. لەکاتی خراپ بەکارهێنانیشیدا دەکرێت بمانخاتە دۆخێکەوە کە تەنانەت شەیتانیش شەرمی لێ بکات. هەروەك چۆن ئیمان لە دڵدا جێگیر دەبێت، کوفر و دووڕوویش هەر بەهەمان شێوە لە دڵدا نەشونما دەکات. چۆن ئیخلاس کاری دڵە، بەهەمان شێوەش ریاکاری (ڕووپامایی) یان لەخۆڕازیبوون (سەرسام بوون بەخود) و خۆ بەگەورە زانین کاری دڵن. ئەرکی ئێمەش ئەوەیە کە، دڵمان لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان بپارێزین و، جگە لە پەروەردگار بە ڕووی هەموو شتێکی تردا دایبخەین. لەم سەروبەندەدا زیکر هەتا بڵێی گرنگیی بەدەست دەهێنێت، ئەو باوەڕدارانەی کە بە دڵ و زاریان یادی پەروەردگاری مەزن دەکەن، وەکو بڵێی چوونەتە ناو بەرزکەرەوەیەکی نهێنی و بەرەو گەورەی گەورەکان بەرز دەبنەوە و لە لوتکە زومرڕوتیەکانی دڵدا شەقەی باڵیان دێت و پەرواز دەکەن.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرمودەیەکدا دەربارەی زیکر دەفەرموێت: "خوای گەورە چەند فریشتەیەکی هەیە بە ڕێگاکاندا

---

١. موحەمەد فەتحوڵلا کولەن، تەپۆلکە زومرووتییەکانی دل.

لەدووی ئەو کەسانە دەگەڕێن کە یادی خوا دەکەن، ئینجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دۆزییەوە یادی خوا بکەن بانگی یەکتری دەکەن و دەڵێن: "وەرن بۆ ئەو شتەی بەدوایدا دەگەڕێن"، فەرمووی: "ئینجا بە باڵەکانیان دایاندەپۆشن هەتا ئاسمانی دونیا، فەرمووی: "جا خوای گەورە پرسیاریان لێدەکات، هەرچەندە خوای گەورە لەوان زاناترە ، بەندەکانی من چییان دەوت؟" دەڵێن: "(سبحان الله)و(الله اکبر) و (الحمد لله) و (لااله الا الله)یان دەوت"، خوای گەورەش (عَزَّوَجَلَّ) دەفەرموێت: "ئایا منیان بینیوە؟" ئەوانیش دەڵێن: "نەخێر، سوێند بەخوا تۆیان نەبینیوە"، خوای گەورەش دەفەرموێت: "دەبێت چۆن بن ئەگەر من ببینن؟" دەفەرموون: "ئەگەر تۆ ببینن باشتر دەتپەرستن و زیاتر بەگەورەت دەزانن و زیاتر تەسبیحاتی تۆ دەکەن"،

ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: "داوای چییان لێدەکردم؟" دەڵێن: "داوای بەهەشتیان دەکرد"، خوای گەورە دەفەرموێت: "بەهەشتیان بینیوە؟" دەڵێن: "نەخێر ، سوێند بە تۆ"، خوای گەورە دەفەرموێت: "دەبێت چۆن بن ئەگەر بیبینن؟" دەڵێن: "زیاتر گرنگی پێدەدەن و باشتر داوای دەکەن و زیاتر ئارەزووی دەکەن"،

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: "ئەی خۆیان لە چی دەپارێزن؟" دەڵێن: "لە ئاگر"، خوای گەورە دەفەرموێت: "ئایا ئاگریان بینیوە؟ دەڵێن: "نەخێر، سوێند بەتۆ"، دەفەرموێت: "دەبێت چۆن بن ئەگەر بیبینن؟" دەڵێن: "بیبینن زیاتر لەبەری ڕادەکەن و پتر لێی دەترسن"، ئینجا دەفەرموێت: "ئێوە دەکەمە شایەت من لەو کۆمەڵە خۆش بووم"،

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی:

"فریشتەیەك لە فریشتەکان دەڵێت: "پیاوێکیان لەناودا بوو لەوان نەبوو بۆ ئیشێك هاتبوو"، لە وەڵامدا خوای گەورە دەفەرموێت: "ئەوان کۆمەڵێکن نابێت کەس بەهۆیانەوە بەدبەخت ببێت."[1]

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "هەر کۆمەڵێك دابنیشن زیکری خوای گەورە بکەن فریشتەکان دەوریان دەدەن، وە ڕەحمەتی خودا دایاندەپۆشێت وە دڵنیایی (السکینه)یان بەسەردا دادەبارێت. وە خوای گەورەش باسیان دەکات لە ئاسمانەکان."[2]

---

١. اخرجه البخاري و مسلم و الترمزي و احمد و الروايات المختصرة.

٢. اخرجه مسلم و الترمزي و قال حديث صحيح.

بەشی خوێندنەوە

## چارەسەری نەخۆشی گوناهـ دۆزرایەوە

بایەزیدی بەستامی کە یەکێکە لە پیاوچاکان، ڕۆژێکیان بەلای شێتخانەیەکدا تێدەپەڕێت، دەبینێت خزمەتگوزاری شێتخانەکە بە دارێك لە شتێك دەدات. لێی دەپرسێت:

- چی دەکەیت؟

- ئێرە شێتخانەیە، دەرمان بۆ شێتەکان دروست دەکەم.

- ئەی چارەسەری نەخۆشییەکەی منیش دەکەیت؟

- نەخۆشییەکەی تۆ چییە؟

- نەخۆشییەکەی من ئەوەیە زۆر گوناهـ دەکەم.

- من لە نەخۆشی گوناهـ نازانم!، من دەرمان بۆ شێتەکان ئامادە دەکەم.

- یەکێك لە شێتەکان کە گوێبیستی ئاخاوتنەکەیان دەبێت بە بایەزیدی بەستامی دەڵێت: "وەرە باپیرە وەرە! با من چارەی نەخۆشییەکەت پێ بڵێم."

پاش ئەوەی بایەزیدی بەستامی دەچێتە لای شێتەکە، دەڵێت: "فەرموو

بڵێ چارەی دەردی من چییە؟"شێتەکە بەم شێوەیە ئامۆژگاری دەکات:

"ڕەگی تەوبە و گەڵای استغفار (داوای لێخۆشبوون) تێکەڵ بکە، لە دەسکەوانی دڵتدا باش بیکوتە و، لە بێژنگی ویژدانی بدە و بە فرمێسك بیشێلە و لەکورەی عەشقدا بیکوڵێنە. بەیانیان و ئێواران زۆری لێ بخۆ، ئەوکات دەبینیت شوێنەواری نەخۆشییەکەت نامێنێت"

دوای فێربوونی ئەم چارەسەرە ناوازەیە بایەزیدی بەستامی دەڵێت:

"هەی دونیای بێوەفا هەی! وادیارە وتویانە تۆ شێتیت و هێناویانیت بۆ ئێرە" و پاشان دەڕوات بەڕێی خۆیەوە. لە ڕاستیدا ئەم چارەسەرە لەم ڕۆژگارەشدا شایەنی ئەوەیە کە ئامۆژگاری توشبووانی دەردی گونە و تاوانیان پێ بکرێت. واتە ئەم هاوکێشەیە هێشتا بە چالاکی ماوەتەوە و کار دەکات.

## ئایا زیکر کاتێکی دیاریکراوی هەیە؟

تایبەتمەندییەکی گرنگی دیکەی زیکر ئەوەیە کە پەیوەست نەکراوە بە کات و شێوەیەکی تایبەتەوە. کاتی تایبەت بە زیکرکردن نییە، بەڵکو لەهەر چرکەساتێکدا دەکرێت بە ئەنجام بگەیەنرێت واتە سنووردار نەکراوە بە حاڵەتێکی تایبەتی مرۆڤەوە. قورئانی پیرۆز ئەم ڕاستییەمان بەم شێوەیە بۆ بەیان دەکات:

﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

(آل عمران: ١٩١)

"ئەوانەی بە پێوە و بە دانیشتنەوە و بە ڕاکشانەوە، واتە: لە هەموو حاڵێکدا ناوی خوا ئەهێنن و بیر لە دروستکردنی ئەرز و ئاسمانەکان ئەکەنەوە و ئەڵێن: پەروەردگارا! تۆ ئەمانەت بە خۆڕایی و بێ کاکڵ دروست نەکردووە، پاکی و بێ خەوشی بۆ تۆیە، خوایە! تۆ لەوە دووری کە شتی بێهوودە دروست بکەیت. خودایا بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ."

یادکردنەوەی پەروەردگار بە ناو و سیفەتە جیاجیاکانیەوە سەرەتا لەلایەن پێغەمبەرەوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) پەیڕەو کراوە. لەڕاستیدا سەروەرمان هیچ ساتێکی دوور لە پەروەردگار بەسەر نەبردووە، لەکاتێکیشدا چاوەکانی دەنوستن دڵی بەئاگا بوو، هیچ ساتێك بێئاگا لە خوا نەژیاوە. لە ژیانی کرداریشدا بە کۆمەڵە زیکرێك ژیانی ڕۆژانەی ڕازاندوەتەوە و پێویستییەکانی بوون بە مرۆڤێکی کامڵی بەجێگەیاندووە. سەرەڕای ئەوەی دوورترین کەس بووە لە گوناهەوە بەڵام لە ڕۆژێکدا زیاتر لە سەد جار داوای لێخۆشبوون و لێبوردەیی لە پەروەردگار کردووە. ئامۆژگاری هاوەڵانیشی بە کردنی کۆمەڵە زیکرێك کردووە کە سەرەتا خۆی ئەنجامی داون. هەموو مرۆڤایەتیشی فێری ڕەوشتی پەیوەندی نێوان بەندە و خوا کردووە. بەڵێ، زیکر کات و شوێنی دیاریکراوی نیە. پێویستە مرۆڤ بۆ ئەم مەبەستە سوود لە هەموو دەرفەتێك وەربگرێت و، زار و جیهانی دڵی لە دوورکەوتنەوە لە یادی خوای گەورە بپارێزێت.

سەبارەت بە مامەڵەکردنی فراوان لەگەڵ بابەتی زیکردا، دەتوانیت لە کاتی ئەنجامدانی کاروبارەکانی ڕۆژانەی وەکو بە پێ ڕۆیشتن و

بەکارهێنانی ئوتومبێل و هەموو کاروبارەکانی تردا، زیکر بکەیت. بۆ نموونە ئەگەر ڕۆژانە کاژێرێك ئۆتۆمبێل بەکاربهێنیت یان چل خولەك بەپێ بڕۆیت، دەتوانیت لەم کاتەدا چەند لاپەڕەیەك دوعا بخوێنیت یان گوێ لە قورئانی پیرۆز یا لە سروودێك ڕادێریت کە بەهۆیەوە ڕێیەك بەرەو پەروەردگار دەدۆزیتەوە.

بەم شێوەیە دەتوانن دڵتان چالاك بکەن و لوتی شەیتان بشکێنن و دەرسێکی باشی نەفستان دابدەن. ئەگەر هاوڕێیەکی سەفەرتان لەگەڵدا بوو دوای ماوەیەك لە هەواڵ پرسینی دەتوانن دەست بکەن بە خوێندنەوەی دوعایەك و ببنە نموونەیەکی جوان لە پێش چاویدا. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەش نابێت تەنها لەبەر سەلامەتی ڕێگەکە بکرێت، چونکە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە نەفسپەرستی تێدایە. لە کاتی سواربوونی وڵاخێکدا دەوترێت:

﴿ سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾
(الزخرف: ١٢ - ١٤)

واتە: "شان و شکۆی ئەو پەروەردگارە چەند بەرزە کە ئەمەی بۆ ئێمە فەراهەم کردووە، ئەگەر ئەو بۆی ڕام نەکردینایە، ئێمە توانا و هێزی ئەمەمان نەدەبوو. بێگومان ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە" . واتە زیکری پەروەردگار و یادکردنەوە و سوپاسکردنی سوننەتە.

زانایانی پێشین کاتێك سواری ئەسپ یان وشتر دەبوون ئەم ئایەتەیان دەخوێند و ناخیان پڕدەبوو لە هەستی شوکرانەبژێری، لەبەرئەوە دەکرێت

لەکاتی سواربوونی کەشتی، تەکسی، فڕۆکە و شەمەندەفەر ئەم دوعایە بخوێنرێت، چونکە ئەمانەش هەر یەکەیان نیعمەتێکی پەروەردگارن و دەتوانرێت بوترێت: "ئەی پەروەردگارا! تۆ بە گەورە و پاك و پیرۆز ڕادەگرین، ئەم فڕۆکەیە، ئەم شەمەندەفەرە، یان ئەم تەکسییەت بۆ ڕەخساندین" کەواتە دەتوانن وەرگرتنی نیعمەتەکانی خوای گەورە و سوود بینین لێیان بگۆڕن بە زیکر و یادکردنەوەی پەروەردگار بە ناو و سیفەتەکانیەوە.

## ئەو زیکرانە کامانەن کە سەروەرمان ئامۆژگاری کردووین لەسەری؟

زۆر زیکر هەیە کە سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) ئامۆژگاری نەتەوەکەی دەکات لەسەری. ئێمە هەوڵ دەدەین ئاماژە بە هەندێك لەوانە بدەین. لە یەکێك لە فەرموودەکاندا لەم بارەیەوە کە حەزرەتی جابر ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت: "باشترینی زیکرەکان لا اله الا الله" یە.[1]

یەکێکی تر لەو زیکرانەی کە سەروەرمان (عَلَيهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئاماژەی پێ کردووە (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم)ە، بە واتای: "ئەی پەروەردگاری دوور لە هەموو کەم و کورتی و ناتەواوییەك، سوپاسی تۆ دەکەم، ئەی پەروەردگاری پاك و بێگەرد لە هەموو هەڵە و کەم و کورتییەك، تۆ گەورە و مەزنیت."

سەردارمان (عَلَيهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەربارەی ئەم فەرمایشتە دەفەرموێت: "دوو وتە ئاسانن لەسەر زمان، لە تەرازوودا قورسن و خۆشەویستن لای

[1] ابن ماجة، الادب، ٥٥.

ڕەحمان (سبحان الله و بحمده سبحان الله العظیم)"[1]

بەڵێ، دوو وشە هەن کە وتنیان لەسەر زمان ئاسانە. زمان بێ زۆر لە خۆکردن دەتوانێت بێتە گۆ، لە ڕۆژی دواییدا کاتێك چاکە و خراپەکان دەکێشرێن ئەم دوو وشەیە بەوە دەناسرێنەوە کە تای تەرازووی چاکەمان قورس دەکەن. هەروەها ئەم وشانە زۆر خۆشەویستن لای خوای میهرەبان، خوای گەورە پێی خۆشە بەم شێوەیە یادی بکرێتەوە. پێدەچێت لەبەر بەرزیی نرخی مەعنەویی ئەم فەرموودەیە بێت کە ئیمامی بوخاری لە کتێبە بەپێزەکەی بواری فەرموودەدا (صەحیحی بوخاری) وەك کۆتاییەکی بۆنخۆش لە کۆتایی کتێبەکەیدا هێناویەتی.

دووبارەکردنەوەی ئەم زیکرە ڕۆژانە سەد جار، ئەوپەڕی شەش حەوت خولەك کاتی دەوێت، بەڵام گومانی تێدا نییە کە دەستکەوتە مەعنەوییەکانی زۆر زۆرن. یەکێکی تر لە دەستەگوڵی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە یادکردنەوەی پەروەردگاردا فەرمایشتی (لاحول ولا قوة الا بالله العلی العظیم)ە. بەواتای: "جگە لە دەسەڵات و هێزی پەروەردگار، هیچ هێز و دەسەڵاتێکی تر نی‌یە."

یەکێك لە هاوەڵانی سەروەرمان، عەبدوڵڵای کوڕی قەیس (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: "من لەم کاتەدا لەدوای وڵاخەکەی پێغەمبەرەوە بووم و دەستم کرد بە وتنەوەی (لا حول ولا قوة إلا بالله). پێغەمبەر (صَلَوات اللهُ عَلَيْهِ) دەنگمی بیست و فەرمووی: "ئەی عەبدوڵڵا" منیش وتم: "فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا"، ئەویش فەرمووی: "ئەی عەبدوڵڵا، هەواڵت

---

١. بخاري، دعوات، ٦٥؛ مسلم، ذکر، ٣١.

پێ بدەم بە یەکێك لە گەنجینەکانی بەهەشت؟" منیش وتم: "فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم پێ بدە دایك و باوکم بە قوربانت بن."، پێغەمبەر (عَلَيْهِ ٱلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمووی: "ئەو گەنجینەیە وتنی (لا حول ولا قوة إلا بالله)یە."[1]

سەروەرمان ئەم دوعایە دەچوێنێت بە گەنجینەی بەهەشت، دیارە ئەمەش واتای زۆری تێدایە. وەك ئاشکراشە بەهەشت گەنجینەی تایبەت بە خۆی تێدایە، یەکێك لەو گەنجینانە ئەم زیکرەیە. وا دەگەیەنێت کە کردنی ئەم زیکرە یەکێکە لە گەنجینەکانی بەهەشت و وا لە مرۆڤ دەکات شایەنی بەهەشت و چوونە نێوی بێت. ئەوانەی لە واتای ئەم دوعایە تێدەگەن و بە باوەڕی تەواوەوە دەیخوێنن، چێژی ئەو شتانە دەکەن کە بەهەشتییەکان دەیچێژن. ئەوانەی زۆر ئەم زیکرە دەخوێنن دەبنە خاوەنی یەکێك لە گەنجینەکانی بەهەشت و پاداشتی ئەم خاوەنداریێتییەشیان هەم لە دونیادا و هەم لە دوارۆژدا دەست دەکەوێت.

## ڕۆژانە دەبێت چەند لە ویرد و زیکرەکان بخوێنین؟

پێویستە هەر کەسێك هێندەی پلە و ئەرکەکەی ئەوراد و ئەزکار بخوێنێت. بۆ نموونە من پێویستە هەست بەوە بکەم کە ناچارم هێندەی پێنج کەس زیکر بخوێنم. پێویستە بە خۆم بڵێم: "مادەم ئەو هەموو خەڵکە نیەتی باشیان بەرامبەر بە تۆ هەیە، کەواتە دەبێت شایستەی ئەو نیەت باشیەی ئەوان بیت و لە هەمووان زیاتر پەیوەندیت توندوتۆڵ بێت

[1] احمد بن حنبل، المسند، ١٥٦/٥.

لەگەڵ پەروەردگارتدا. بەم شێوەیە پێویستە هەم سوپاسی ئەو نیعمەتە بکەیت و هەم داوای بەردەوام بوونی نیعمەتەکەش بکەیت.'' بەڵێ، بەم شێوەیە بەخۆم دەڵێم و هەوڵیش دەدەم جێبەجێی بکەم.

لەسەر ئەم بنەمایە؛ بانگبێژ، ئیمام، وتارخوێن، موفتی و هاوشێوەی ئەمانە کەسانی کاربەدەستن و لە کایە جیاوازەکانی خزمەتی ئیسلامدا، پێویستە بەپێی ئەو شوێن و پلەیەی کە هەیانە، زیکر و دوعایان زیاد بکەن و بە تەواوەتی پێویستە لەسەریان پەیوەندییەکی باش لەگەڵ پەروەردگاریاندا گرێ بدەن، بەپێچەوانەوە مافی ئەو فەرمانبەرییە نادەن کە لە ئەستۆیاندایە.

تکایە کەس پاساوی لەم جۆرە هەڵنەبەستێت و نەڵێت: ''لەناو ئەم هەموو سەرقاڵییەدا کاتمان نییە، شەوان بە ماندوویی و درەنگ دەگەڕێینەوە ماڵەوە'' ئەوانەی لە پشت ئەم بیانووەوە خۆیان دەشارنەوە ئەگەر ئاوڕێك بدەنەوە و سەیرێکی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بکەن شەرم دەکەن کە لە پێناوی هیچدا ئەو هەموو کاتە بەنرخەی خۆیان دەفەوتێنن.

جارێکی تر لەم بارەیەوە وتم: ''خەڵکی ئێمە نرخی کات نازانێت، کاتی وا هەیە چەند کاتژمێرێك بە پەرداخێك چاوە دەکوژێت، کاتی واش هەیە کاتی نییە تەرخانی بکات بۆ ئەو بابەتانەی کە مەسەلەی مان و نەمانن.'' بەڵێ، گەر تەماشای ژیانی ڕۆژانەمان بکەین زۆر لەم نموونانە دەبینین. ئیتر پێویست ناکات باسی ئەوە بکەین کە هێندەی هەموو دونیا کات بە شتی پڕوپوچ و بێماناوە بەفیڕۆ دەدەین. ئێستا ئەستەمە بتوانین واتایەك بدۆزینەوە بۆ ئەو هەموو کاتە زۆرەی

که سەخاوەتمەندانە بەفیرۆی دەدەین، کەچی کاتمان نییە بۆ بابەتە گرنگەکان.

لە ئەنجامدا دەبێت وەبیرتان بهێنمەوە کە پێویستە هەموو کەسێك کاتێکی تەرخانکراوی بۆ زیکر و دوعا هەبێت و هیچ بەهانەیەك لەمەڕ ئەم بابەتە نەهێنێتەوە.

## پێویستە تەسبیحات فەرامۆش نەکەین!

کاتێك باسی تەسبیحات دەکرێت لە پێش هەموو شتێکەوە تەسبیحاتی دوای نوێژ بە بیرماندا دێت. پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە زۆرێك لە فەرمایشتەکانیدا فێری ئەو دوعا و تەسبیحاتانەی کردووین کە لە دوای نوێژ دەخوێنرێن و ئامۆژگاریشی کردووین بە ئەنجامدانیان.

ڕۆژێکیان سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بە هاوەڵانی فەرموو: "ئایا کارێکتان فێر بکەم کە بە هۆیەوە دەتوانن بەوانەی پێش خۆتان بگەیەنێتەوە و پێشی ئەوانەی دوای خۆتان بدەنەوە و کەسیش نەبێت ئاستی لە ئێوە بەرزتربێت جگە لەوانەی وەکو ئێوە ئەنجامی دەدەن؟"

هاوەڵانیش فەرموویان: "بەڵێ ئەی نێردراوی پەروەردگار فێرمان بکە." سەرورەریشمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی: "بەوەی دوای هەموو نوێژێك یەکی سی و سێ جار (سبحان الله)، (الحمد الله)، (الله اکبر) بڵێن."[١]

١. ابو داود، الطهاره، ٢٠؛ احمد بن حنبل، المسند، ١٩٦/٥.

لە فەرموودەیەکی تردا ئەم بابەتە بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ کراوە:

"هەرکەسێك دوای هەموو نوێژێك ٣٣ جار سبحان الله و ٣٣ جار الحمد الله و ٣٣ جار الله اکبر بڵێت و پاشان بڵێت: "لا اله الا الله وحده لاشریك له، له الملك و له الحمد و هو علی کل شیء قدیر"، ئەگەر تاوانەکانی هێندەی کەفی دەریاش بێت ئەوا لێخۆشبوون دەیگرێتەوە."[١]

بەڵێ، لە فەرموودەکانەوە گرنگی تەسبیحات دەردەکەوێت. جاری وا هەیە بە پاساوی ڕەوا یان ناڕەوا تەسبیحاتەکەمان دەکەینە قوربانی تەمبەڵی و پشتگوێخستن و دەڵێین: "خۆ هەرچۆن بێت تەسبیحات سوننەتە ئەگەر نەشیکەم هەر دەبێت!" دەبێت وەك کەمتەرخەمییەك مامەڵە لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیەدا بکەین، چونکە سروشتی ئادەمیزاد حەز بە تەمبەڵی و کەمتەرخەمی دەکات.

سەرەتا بە وازهێنان لە تەسبیحات دەست پێدەکات و وردە وردە دەکرێت کە نوێژە سوننەتەکانیشی پشت گوێ بخات و خوای گەورە بمانپارێزێت ئەنجامی ئەم کارە لەوانەیە تا وازهێنان لە نوێژە فەرزەکانیش سەربکێشێت. مرۆڤی باوەڕدار لە ژیانی پەرستشی خۆیدا دەبێت بەجێگەیاندنی سوننەتەکان وەکو پەیوەندی بەستن لەگەڵ خاوەنی سوننەتدا کە پێغەمبەرە (صَلَّیَ اللهُ تَعَالَی عَلَیْهِ وَسَلَّمْ)تەماشا بکات و سوننەتەکانیش، لە پێشیانەوە تەسبیحات، بکاتە بەشی دانەبڕاوی ژیانی.

هەندێك جار لەژیانی ڕۆژانەماندا دەکرێت زۆر سەرقاڵ ببین، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ دوای نوێژکردن وا پێویست دەکات بگەڕێینەوە

١. مسلم، المساجد، ١٤٤.

سەر کارەکانمان، تەنانەت لەم کاتانەشدا نابێت تەسبیحات تەرك بکرێت، ئەگەر گونجا دەبێت بە پێوەش بێت تەسبیحاتی دوای نوێژ بکرێت.

## هەستیاریی بەدیعوززەمان لەمەڕ تەسبیحاتی دوای نوێژ

لەبەرئەوەی هەندێك لە برایانمان تەمبەڵیی و کەم تەرخەمییان لە تەسبیحاتی دوای نوێژدا دەکرد، پێم وتن: ئەو زیکرانەی بۆ دوای نوێژ دیاریکراون، سوننەتێکی خاوێنی پێغەمبەرن (صَلَّىَ اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و تەریقەتێکی پیرۆزی موحەممەدین (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) و ویردی ویلایەتی ئەحمەدین. لەبەر ئەمە، ئەو ویردانە لەم گۆشەیەوە گەلێك گرنگن.

پاشان حەقیقەتی ئەم قسەیەم بەمەی خوارەوە ڕوونکردەوە:

هەروەك ویلایەتی ئەحمەدی -کە بووە بە ریسالەت- لەسەرووی هەموو ویلایەتەکانەوەیە، بەهەمان جۆریش تەریقەتەکەی ئەو ویلایەتە کوبرایە و ویردەکانی کە لە دوای نوێژ دەخوێنرێن -بە هەمان پلە- لە سەرووی گشت تەریقەت و ویردەکانی ترەوەن.

پاشان ئەم نهێنییەم بەم جۆرەی خوارەوە لێ ئاشکرابوو:

هەروەك هەموو یەکێك لە زیکرخوێنانی ئەڵقەی زیکر یان خەتمەی زیکری ناو مزگەوت، هەست بە پەیوەندییەکی ڕۆحی پەیوەستدەر دەکات لە نێوان خۆی و هاوەڵەکانیدا و، تێکڕا هەمووشیان پێکەوە هەست بە حاڵەتێکی نوورانی دەکەن. بە هەمان جۆر مرۆڤی دڵ بێداریش کە هەموو جارێك لە دوای نوێژدا دەڵێت: "سبحان الله..سبحان الله..

سبحان الله“ لە ناخی ڕۆحی خۆیدا هەست بە هاوبەشێتی دەکات لە ئەڵقەیەکی زیکری سەد ملیۆن کەسیدا. وەك بڵێیت پێغەمبەری خۆشەویست (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەر ئەڵقەی ئەو کۆڕی زیکرە فراوانە بێت و ئەمیش لەوێ دانیشتبێت و ئەو زیکرە لە خزمەت ئەودا دووپات بکاتەوە! بەم چەشنە هەست و نەستانەی کە پڕن لە سۆزی مەزنی و سام و شکۆ و بەرزایەتی، مرۆڤی ئیماندار لە پاش نوێژەکانی (سبحان الله، سبحان الله..) دووپات دەکاتەوە.

پاشان کە فەرمانێکی مەعنەوی ئەو سەر ئەڵقە بەڕێزە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) (الحمد لله، الحمد لله) جار لەدوای جار دەڵێتەوە، بیر لە مەزنیی ئەو وشەی (الحمد لله)یە دەکاتەوە کە لە سنگ و زاری سەد ملیۆن زیکرخوێنی دووپات کەرەوەی وشەی (الحمد لله)وە لەو ئەڵقە فراوانەوە دەردەچێت!

ئەمیش کە ئەمە دەبینێت پڕ بە دڵ بەشدارییان دەکات و وهاودەم لەگەڵیاندا دەڵێت: ”الحمد لله.. الحمد لله“. هەر بەو جۆرە لەگەڵ وشەی (الله اکبر) و (لا اله الا الله)شدا، کە ئەوانیش سی و سێ جار دووپات دەبنەوە. پاشان زیکرەکە کۆتایی پێ دێت.

پاش تەواوبوونی ئەم ویردانە، هەر بەو هەستە ناسك و بیرکردنەوە و سەرنجدانە بەپێزانە لەواتاکانیان، مرۆڤی زیکرخوێن و براکانی گشت ئەو واتایانەی لە زیکرەکاندا بوون، لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن و ڕوو لە سەرتاجی ئەو ئەڵقەی زیکرخوێنندنە ئەکەن 'کە پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)" و پڕ بەدڵ دەڵێن:

(الف الف صلاة و الف الف سلام عليك يا رسول الله)

بەڵێ، ئاوا هەستم کرد و تێیگەیشتم و بگرە بە ئەندێشە ئاوا بینیم. لەبەر ئەوە دەڵێم: "زیکرەکانی پاش نوێژ دارای گرنگییەکی گەلێ مەزنن."

بەشی خوێندنەوە

## تەسبیحات تاهیری قەساب لە سێدارە ڕزگار دەکات

دەگێڕنەوە کە پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەی ئازا کە بە "تاهیری نەگبەت" ناسراوە، بە گوندەیی باج و سەرانەی لە خەڵکی ئافیۆن و دەوروبەری وەرگرتووە. پاش ئەوەی کەسێك دەکوژێت، لەناو خەڵکدا بە "تاهیری قەساب" ناو دەردەکات. پاشان دەکەوێتە بەندیخانەوە و بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت. تەنانەت کاتێکیش بە مەبەستی پشوودان دەهێنرێتە دەرەوە بۆ حەوشەی بەندیخانە، لە ترسی ئەوەی نەوەك زیان بە کەسێك بگەیەنێت، دەست و قاچی زنجیرکراو دەبێت.

ڕۆژێك لە حەوشەی بەندیخانەدا چاوی بە بەدیعوززەمان دەکەوێت. لە ڕوخساری پاکی ئەم زاتەدا ڕاستگۆیی و میهرەبانی دەبینێت و پێی دەڵێت: ”مامۆستا توخوا دوعام بۆ بکە لەم حاڵە ڕزگارم بێت!“

مامۆستا پێی دەفەرموێت: ”ئەم شتەی تۆیان پێ بەستۆتەوە، زنجیری مەحکومی سێدارە نییە، بەڵکو تەسبیحی تۆیە! تۆ دەست بکە بە نوێژ، تەسبیحات بکە، منیش دوعا دەکەم، ان شاء الله ڕزگارت دەبێت!“

لەو ساتە بە دواوە گۆڕان و پاکبوونەوەی ماددی و مەعنەوی لە

تاهیردا ڕوودەدات، دەست دەکات بە نوێژ، لە دوای نوێژ بە مەبەستی تەسبیحات ئەڵقەکانی زنجیرەکەی یەك یەك دەژمێرێت و دەبینێت ڕێك "سی و سێ" دانەیە! بەمشێوەیە زنجیرەکەی دەبێت بە تەسبیح بۆی.

ڕۆژان تێپەڕین و قسەکەی مامۆستا هاتە دی، لە ساڵی ۱۹۵۰ دا لێبوردنی گشتی گرتییەوە و دوای ڕزگاربوونی مەعنەوی گەیشت بە ڕزگاربوونی جەستەییش.

## جەوشەن چی یە؟

خوێندنەوەی جەوشەن یەکێکە لەو ڕێگایانەی کە بە جوانترین شێوە زیکری خوای گەورە بکەین. جەوشەن لە زمانی عەرەبیدا بە واتای "جلوبەرگی سەربازیی پارێزەر" دێت. لە بناغەدا جەوشەن کتێبێکی دوعایە کە زۆرێك لە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەی لە خۆ گرتووە و لە لایەن (موسای کازم، جەعفەری سادق، موحەممەدی باقیر، زەینولعابدین، حەزرەتی حسین و حەزرەتی علی)یەوە دەدرێتە پاڵ سەروەرمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). بەپێی ڕیوایەتەکە لە یەکێك لە غەزاکانی چاخی زێڕیندا "لە ڕیوایەتێکی تر لە ئوحوددا" لەکاتی تاوسەندنی جەنگەکەدا و لەکاتێکدا ئەو قەڵغانەی کە لەبەری پێغەمبەردا بوو (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) زۆر جەستەی سەروەرمانی گوشیبوو، پێغەمبەر دەستی بەرزکردەوە و دوعای کرد. جوبرەئیل دێتە خزمەتی پێغەمبەر و پێی دەفەرموێت: "ئەی موحەممەد! پەروەردگارت سەلامت لێدەکات و دەیەوێت ئەو قەڵغانەی لەبەرتدایە لایبدەیت و ئەم دوعایە بخوێنیت چونکە ئەم دوعایە هەم

بۆ خۆت و هەم بۆ ئوممەتەکەشت لە قەڵغان زیاتر سەلامەتیتان بۆ فەراهەم دەهێنێت."

دواتر لە ڕێگەی ئیمامە شیعەکانەوە دەکەوێتە دەست پیاوچاکان و دەبێت بە یەکێك لەو دوعا و تەسبیحاتە گرنگانەی کە بە بەردەوامی خوێندوویانە. زانایانی ئەهلی سوننەت بە چاوی گومانەوە لە جەوشەنیان ڕووانیوە، لەبەر ئەوەی لە سەرچاوەی شیعەکانەوە هاتووە. هەستیاری ئەهلی سوننەت بەرامبەر سەرچاوە شیعەکان ڕێگربووە لەوەی کە ئەم دوعا پیرۆزە لەسەرچاوەکانی ئەهلی سوننەتدا بەرچاو بکەوێت.

"الجوشن الکبیر" دوعایەکی دووردرێژە کە لە سەد بەش پێکهاتووە. هەر بەشێکیان دە لە ناو و سیفەتەکانی پەروەردگاریان لەخۆ گرتووە. لە کۆتایی هەر بەشێکدا (سبحانك یا لا اله الا انت الامان الامان خلصنا، اجرنا، نجنا من النار) واتە: "ئەی پەروەردگار، جگە لە تۆ (پەرستراوێك) بوونی نیە، داوای پارێزگاریت لێ دەکەین، لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە" دووبارە دەبێتەوە.

لەسەرەتای بیست و پێنج بەش لەم سەد بەشەدا بەدەستەواژەی "واسالك باسمائك" دەستپێدەکات و لەشێوەی "یا الله، یارحمن، یارحیم" ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەی لەخۆ گرتووە. بەشێوەیەکی گشتی لەدوای هەر یەکێك لەم دەستەواژانەی کە لە سەرەوە ئاماژەی پێدرا، لە شێوەی سێ بەشدا کۆمەڵێك دوعای لەخۆ گرتووە و چەند موناجاتێکیشی تێدایە، وەکو (یاخیر الغافرین). بەم شێوەیە سەراپای ئەم دوعایە لەخولگەی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەدا دەسوڕێتەوە، ٢٥٠ ناو و ٧٥٠ سیفەتی

پیرۆز و موناجاتی پەروەردگاری لەخۆ گرتووە. مەبەست لەم هەموو موناجاتانە وەکو لە کۆتایی هەموو بەشێکدا هاتووە: "الامان الامان خلصنا من النار" دوعای ڕزگاربوونە لە بەڵای دونیا و سزای ڕۆژی دوایی و ئاگری دۆزەخ.

## بەدیعوززەمان چۆن باسی جەوشەن دەکات؟

بەدیعوززەمان باسی ئەوە دەکات کە جەوشەن دوعای پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و خوێندوویەتی.

هەروەها بەدیعوززەمان ئاماژە بەوە دەکات کە جەوشەن موناجاتێکە لە قورئانەوە هەڵگۆزراوە و ناوەڕۆکەکەشی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا گونجاوە و یەکێکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ).

بێگومان ئەگەر جەوشەن بەردەوام بخوێنرێتەوە سوودی زۆری ماددی و مەعنەوی دەبێت، باشترین نموونەش بۆ ئەمە ژیانی مامۆستا خۆیەتی.

## وەڵامی ئەو دەنگۆیانەی کە دەربارەی جەوشەن دەخرێنە ڕوو

بۆچی لەنێوان موسوڵماناندا بیروبۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی جەوشەن، لەکاتێکدا هەندێکیان جەوشەنیان کردووەتە تاجی سەریان و هەندێکی تریان زۆر سارذن بەرامبەری، تەنانەت بێ ئاگاشن لێی؟

زۆر بیروبۆچوون لەبارەی جەوشەنەوە خراوەتە ڕوو. لەبەرئەوەی

جەوشەن زیاتر لە سەرچاوەکانی شیعەدا هاتووە، ئەهلی سوننەت بە ساردی مامەڵەیان لەگەڵ "جەوشەن" دا کردووە. بەڵام پەیوەندی ئێمە بە جەوشەنەوە کەمێك تایبەتمەندێتی هەیە. زیاد لە هێنانی بیروبۆچوونی کەسانی تر، لەم بارەیەوە دەمانەوێت بیر و بۆ چوونی خۆمان بخەینە ڕوو:

١) جەوشەن دوعایەکە لێوانلێوە لە ئیخلاس. هەریەکێك لە ڕستەکانی یان وشەکانی بە نموونە وەربگیرێت ئیخلاص و دڵسۆزیی لێ دەچۆڕێت. لەبەرئەوە جەوشەن بدرێتە پاڵ هەر کەسێك، نابێت کاریگەریی لەسەر تایبەتمەندیی ناوەڕۆکەکەی هەبێت. بێگومان لێرەدا نامانەوێت بڵێین جیاوازی لە نێوان وتەیەکدا نییە کە بدرێتە پاڵ سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەگەڵ وتەی کەسێکی تردا. بچوکترین وەسفی جەوشەن ئەوەیە کە دوعایە. تەنانەت ئەگەر جەوشەن هیچ تایبەتمەندێتی تریشی نەبێت، تەنها ئەم تایبەتمەندێتییەی بەسە بۆ ئەوەی کە بیکاتە موناجاتێکی پڕنرخ و بەها. بێگومان جەوشەن چەندین تایبەتمەندێتی تریشی هەیە کە لە خاڵەکانی تردا ئاماژە بە هەندێکیان دەکرێت. لەبەر ئەوە ڕەخنەگرتن لە جەوشەن تەنها لەبەر سەنەدەکەی پێناچێت کارێکی گونجاو بێت.

٢) فەرمایشتەکانی سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە سەروو وتەی هەموو مرۆڤێکەوەن. ئەوانەی کە شارەزاییان لە فەرمایشت و شێوازی هەڵبژاردن و بەکارهێنانی دەستەواژە و ئەو وشانەدا هەیە کە رسول الله (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەکاریهێناون، شاراوە نابێت لێیان کە جەوشەن لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بە دەستەواژەی پێغەمبەرانە ڕازێنراوەتەوە.

لەبەر ئەمە بەکارهێنانی ئەو دوعایانە کە پێغەمبەر کردوونی، هەم گرنگە و هەم نزیکتریشی دەکاتەوە لە گیرابوون. بەڵام ئەم بابەتە ئیختیارییە و بابەتی هەڵبژاردنە، چونکە مرۆڤ ئەو دوعایانەی کە لە دەرەوەی نوێژ دەیانخوێنێت بەهەر زمانێك بێت، کاریگەری لەسەر کرۆکی دوعاکە نابێت، لەبەرئەوەی پەروەردگار هەموو زمانەکان دەزانێت و بۆ گیرابوونی هەر دوعایەك زیاتر ڕەچاوی ئەو ئیخلاس و دڵسۆزییە دەکات کە پێویستە. ئایا جیاوازی زمان و ڕەنگی مرۆڤەکان بەڵگە و نیشانە نییە لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار؟

٣) وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد جەوشەن لە سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەدا نابینرێت. تەنها لە (موستەدرەکی ئیمامی حاکم)دا چەند بەشێکی بەدی دەکرێت. جگە لەوەش تا ئێستا من لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا نەمدیوە کە بەشێك یان دەستەواژەیەك دەربارەی جەوشەن "تۆمارکرابێت"، بەڵام ئەم مامەڵە گشتییەی موسوڵمانان لەگەڵ جەوشەندا کە ئاماژەمان پێدا، تەنها لە ژێر ڕۆشنایی ڕەچاوکردنی سەنەددا هاتووەتە ئاراوە و بە هیچ شێوەیەك کاریگەریی پێچەوانە و نەرێنی لەسەر نرخ و بەهای جەوشەن نییە.

زۆر فەرموودە هەن کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە و هەمان ئەو فەرموودانە بە جیاوازییەکی زۆر کەمەوە یان بە هەمان شێوە لە "الكافي الكليني" دا دەبینرێن. بەڵام زانایانی ئەهلی سوننەت تەنانەت یەك ڕیوایەتیشیان لە کولەینییەوە وەرنەگرتووە. ئەمە لە کاتێکدا ئەو فەرموودانەی کە لە بوخاری و موسلیمدا هاتوون، هەم

لەڕووی سەنەد و هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە باوەڕپێکراون.

بەڵام ئەو فەرموودانەی کە لە "الکافی"دا تۆمار کراون زیاتر ئیمامەکانی شیعە نەقڵیان کردووە، لەبەر ئەم هۆیەش هەر لە سەرەتاوە لای ئەهلی سوننەت بە گومانەوە تەماشا کراون و مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە.

هەمان شت بۆ جەوشەنیش ڕاستە. پێم وایە ئەگەر جەوشەن لە لایەن پێشەوایانی شیعەوە نەقڵ نەکرابایە لای هەموو ئەهلی سوننەت ڕەوایەتی پێدەدراو دەکرایە تاجی سەر، بەڵام تەنها لەبەرئەوەی جەوشەن لە ڕووی سەنەدەوە تووشی ئەو بەدبەختییە بووەتەوە، خەڵکانێکی زۆر لەو ژینگە پڕ نوور و بەرەکەت و فەیزەی جەوشەن بێبەش بوون. لەم کاتەدا توانای ئەوەمان نیە ڕێ لەو بەدبەختییە بگرین. ئەگەر ڕەواندنەوەی ئەو قەناعەتەی کە چەندین سەدە ڕەگ دادەکوتێت مەحاڵیش نەبێت ئەوا زۆر کارێکی گرانە.

## "القلوب الضارعة" کتێبێکی پاڕانەوە بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە

لە دوای باسکردنی گرنگیی زیکر و جەوشەن و تەسبیحات، ئێستا دەمانەوێت باسی کتێبێك بکەین کە بۆ خەڵکی ئەم سەردەمە ئامادە کراوە و جوانترین ئەو زیکرانەی لەخۆ گرتووە کە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (صَلَوَاتُ اللّٰهِ عَلَيْهِ) تا ئەمڕۆمان کراون، ئەویش "القلوب الضارعە"یە.

ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستا موحەممەد فەتحوڵڵا گولەنەوە

ئامادەكراوە كە لە چەند سەرچاوەیەكەوە هەڵبژێردراوون، سەرەكیترینیشیان كتێبی سێ بەرگیی "مجموعة الاحزاب"ە كە لەلایەن ئەحمەد ضیاء الدین گوموشخانەویەوە، كە شێخێكی تەریقەتی نەقشبەندیی-خالیدییە، كۆكراوەتەوە.

"مجموعة الاحزاب" كتێبێكی زیكرە و نزیكەی ٢٠٠٠ لاپەڕەیە و، "گوموشخانەوی" لەگەڵ خوێندكارەكانیدا بە وردی و هەستیاری ئامادەیان كردووە. لەم بەرهەمەدا بۆ هەر دوعایەك ناوی نووسەر و ناوی دوعاكە و كات و چۆنیێتی خوێندنی بۆ هەر بەشێك نووسراوە.

بێگومان ئەوەی گرنگییەكی زیاتری بەخشیوە بە "مجموعة الاحزاب" ئەوەیە كە بەدیعوززەمان بێ هیچ پچڕانێك ئەم حیزبانەی "مجموعة الاحزاب"ی خوێندۆتەوە و كردوونی بە ویرد بۆ خۆی.

"القلوب الضارعة" بە واتای "دڵی بەسۆ" دێت و وشەی "التضرع"ی قورئانی پیرۆزمان وە بیردێنێتەوە كە واتای "ناخ سوتاوی و بە جەرگ سوتاویەوە داواكردن لە خوای گەورە" دەگەیەنێت. وردە وردە دووركەوتنەوەمان لە خوێندنەوەی (مجموعة الاحزاب) خۆی لەخۆیدا نیشانەی بێوەفایی ئێمەیە. ئامادەكردنی "القلوب الضارعة" بۆ ئەوەیە كە مجموعة الاحزاب لای نەوەی نوێ خۆشەویست بكرێت و بتوانن سوود لەم بەرهەمە ناوازەیە وەربگرن. لەم بەرهەمە بە نرخەدا چەندین دوعای دۆستانی خوای گەورە كۆكراوەتەوە. جگە لەمانەش لە كۆتاییەكەیدا سەلاواتێكی گشتگیری مامۆستا فەتحوڵلا گولەنی تێدایە.

## یادی پەروەردگار بکە با یادت بکات!

نرخ و گرنگیی بەردەوام یادکردنەوەی پەروەردگار و بە زیندوو ڕاگرتنی یادی ئەو لە دڵدا لای موسوڵمانان ئاشکرایە. زیکری زیاتر بە واتای زیاتر نزیك بوون لە پەروەردگار دێت. نزیکترین مرۆڤ لە خوای گەورەوە کە سەروەرمانە(صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە زۆربەی زۆری کاتەکاندا یادی پەروەردگاری کردووە. ئەو لە کاتی دەست کردن بە نان خواردن و دوای تەواوبوون، لە کاتی پشوودان و خەوتندا و لە کاتی هەستاندا، وە لە کاتی چوونە تەوالێت و هاتنە دەرەوەدا و، لە کاتی چوون و هاتنە دەرەوە لە ماڵ و مزگەوت و، لە زۆر کاتی تردا هەردەم یادی پەروەردگاری کردووە و، هەرگیز لەبیری نەکردووە، چونکە ئەو وانەی بە مرۆڤایەتی وتووەتەوە لەمەڕ شێوازی پەیوەندی نێوان بەندە و پەروەردگاری.

لە ناخی دڵمانەوە بڕوامان بەوە هەیە کە موسوڵمان لە ژیانیدا جگە لە کاتی نوێژ، دەبێت کاتێکی هەبێت بۆ پەروەردگاری تەرخان کردبێت و لەو کاتەدا یادی ناو وسیفەتە جیاجیاکانی خوای باڵادەست بکاتەوە.

بەڵێ، پێویستە ئێوە بەو شێوەیەی کە شایانی پەروەردگار بێت یادی بکەنەوە، ئەویش لە بەرامبەردا بە شێوەیەك کە شایانی پیرۆزیی ئەو بێت شەرەفمەندتان دەکات بەوەی یادی ئێوە دەکاتەوە.

ئێوە، بە تەسبیحات و، خوێندنی کۆمەڵەی دوعا و، جەوشەن، یادی دەکەنەوە ئەویش لە بەرامبەردا لوتفتان لەگەڵدا دەنوێنێت و دەتانکاتە ئاوێنەی درەوشانەوەی ئایەتی:﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ﴾ (البقرة: ١٥٢) واتە: "یادم بکەنەوە با یادتان بکەمەوە".

ئێوە لە کاتی خۆشگوزەرانی و بەرامبەر تابلۆ دڵڕفێنەکان یادی ئەو لە زار و دڵتان هیچ پشتگوێ ناخەن، ئەویش لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە خۆشگوزەرانیتان لێ تێکدەدات، شەماڵی ڕەحمەتی خۆیتان بۆ دەنێرێت.

ئێوە لە نێوان سەرقاڵی و کاروباری دونیاتاندا ئەو لە بیر ناکەن و پەلە پڕوزێ لە یادی ئەودا ناکەن، ئەویش هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا چاودێریتان دەکات و دەتانپارێزێت. بەربەستەکانی بەردەمتان تەفروتوونا دەکات. ئێوە سوورن بەو شێوەیەی کە شایانی پەروەردگارە یادی بکەن، ئەویش وەك پاداشتێك بۆ ئەو هەوڵ و تەقەلایانەتان چێژی نزیکیی لێتانەوە بە دڵەکانتان دەچێژێت.

لە کاتێکدا ئێوە بە ڕەچاوکردنی سنوری فەرمانەکانی ئەو درێژە بە ژیانتان دەدەن، ئەویش هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا بەختیار و دڵخۆشتان دەکات. ئێوە بەو دوعا و یادکردنەوانەوە دەچنە خزمەتی، ئەویش بەو نیعمەتانەی کە بەخەیاڵیشتاندا نایەت سەرفرازتان دەکات.

بەم شێوەیەش ئێوە ئەو شتەی کە خوا داوای لێکردوون، بە دەربرینێکی تر ئامانجی بەدیهاتنتان دەهێننە دی و لە ڕێگەی گەیشتن بە "مرۆڤی کامڵ"دا ڕێیەکی زۆر دەبڕن، ئەویش لە ڕۆژی دواییدا و لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا حەشرتان دەکات و جوانیی خۆیتان نیشان دەدات و شەرەفمەندتان دەکات.

بەڵێ هەتا ئەمڕۆ ئەوانەی بوونەتە خاوەنی پلەی بەرز لای پەروەردگار، بە یادکردنەوەی پەروەردگار و ژیان لە پێناوی ئەودا بەو پلەیە گەیشتوون.

# ١٢. پێویستە نوێژ لە هەربارودۆخێکدا بێت بکرێت

هیچ شتێك؛ ئیش، بازرگانی، ئەرك، سەرقاڵی یان بەهانەیەك ناتوانن ببنە ڕێگر لەبەردەم نوێژی باوەڕداردا. بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە ئاینەکەمان هەموو جۆرە ئاسانکارییەکی بۆ دەستەبەر کردووین، وەك تەیەممومم کردن بۆ ئەوانەی کە ئاویان دەست ناکەوێت، یان ئەوانەی کە لە مەترسییەك دەترسن، بە پێوە بیکەن یاخود بە سواری و ڕێبواران فەرزە چوار ڕکاتییەکان بە دوو ڕکات بکەن، لە کاتی ناچاری و پێویستیدا نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ عەسر و نوێژی ئێوارە لەگەڵ خەوتنان لە کاتی نیوەڕۆ یان عەسر یان لە کاتی ئێوارە یان خەوتنان پێکەوە بیکەن.

ئەوانەی لە کاتی جەنگدان، چۆن لە توانایاندا بوو بەو شێوەیە، ئەوانەی کە لەوە ترسیان هەیە شتێك ڕوو بدات بە پیادەیی بیکەن یاخود بە سواری، یان ئەو نەخۆشانەش کە ناتوانن بە پێوە بوەستن یاخود ئەوانەی عوزریان هەیە، دەتوانن بە دانیشتنەوە بیکەن. ئەوانەی کە

توانای ئەمانەشیان نییە بە پاڵکەوتنەوە دەتوانن نوێژەکانیان بکەن. واتە بێجگە لە باری تایبەتی ئافرەتان و شێتبوون و لە هۆش خۆ چوون و بورانەوە و لەبیرچوونەوە هیچ شتێکی تر نابێتە عوزر بۆ نەکردنی نوێژ.

ئەو موسڵمانەی کە ئیمان لە دڵیدا جێگیربووە و باوەڕێکی ڕاستەقینەی بەدەست هێناوە، نوێژکردن نابێتە ئەرکێکی قورس و زەحمەت بۆی. بە پێچەوانەوە باوەڕدار کەمتەرخەمی لە نوێژەکانیدا ناکات، بەڵکو بە ئیرادە و چێژەوە نوێژەکانی بە ئەنجام دەگەیەنێت. خوای گەورە لە قورئاندا نوێژی ساردوسڕ و تەرککردنی نوێژی وەك کردەوەی موونافیقەکان لەقەڵەمداوە.

## حوکمی نوێژ نەکردن چییە؟

نوێژنەکردن گوناهێکی گەورەیە. ئەو کەسەی کە نوێژ ناکات، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یان ئەو کەسە باوەڕی بە فەرزبوونی نوێژ نییە و گرنگی پێنادات، یاخود تەمبەڵی تێدا دەکات و پشتگوێی دەخات، یان لە بیری دەچێت کە نوێژەکەی بکات. ئەو کەسەی کە باوەڕی بە فەرزبوونی نوێژ نییە و گرنگی پێنادات و ئەنجامی نادات، بە ئیماندار هەژمار ناکرێت، چونکە ئەم کەسە باوەڕی بە فەرمانێکی ڕاستەوخۆی خوای گەورە نییە. ئەو کەسەش کە باوەڕی بە فەرزبوون و گرنگی نوێژ هەیە و بەهۆی تەمبەڵی و پشتگوێخستن و سەرقاڵییەوە نایکات و هیچ پاساوێکی شەرعی نییە، ئەوا ئەو کەسە کەوتووەتە ناو گوناهێکی گەورەوە. ئەو فەرموودانەشی

که بەشێکیان لە خوارەوە بەبیردەهێنینەوە ماناکەیان ئەمەیە:

"هەر کەسێك واز لە نوێژی عەسر بهێنێت، کار و کردەوەکانی بە زایە دەچێت."[1]

"لە ئەنقەست واز لە نوێژ مەهێنن، هەرکەسێك بە ویست و ئارەزووی خۆی واز لە نوێژ بهێنێت ئەوا لە زیممەتی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بەری ئەبێت."[2]

پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕۆژێکیان باسی نوێژی بۆ هاوەڵان دەکرد، و دەیفەرموو: "کێ لەسەر نوێژەکانی بەردەوام بێت، ئەوا ئەم نوێژە لە تاریکایی ڕۆژی دواییدا دەبێتە ڕووناکی بۆی و، بەڵگەیەك دەبێت بۆ ڕاستگۆبوونی لەگەڵ خوادا و، لە سزای خوای گەورەش دەپارێزێت. هەر کەسیش لەسەر نوێژەکانی بەردەوام نەبێت، خاوەنی نوور و بەڵگە و ڕزگاری نابێت. بەڵکو ئەو کەسە لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ قاروون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەلەفدا حەشر دەکرێت."[3]

زانایانی ئیسلام ئاماژەیان بەوە داوە کە گەر باوەڕدارێك تەنها باوەڕی بە فەرز بوونی نوێژ نەبوو و لەبەر ئەمە وازی لێ هێنا، ئەوا ئەو مرۆڤە بەرەو کوفر هەنگاو دەنێت، فەرموویانە ئەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانی ئامانجیان ئەوەیە باوەڕداران لە نوێژ تەرك کردن دووربخەنەوە.[4]

---

١. البخاري، مواقيت الصلاة ، ١٥.

٢. المسند، ٤٢١/٦.

٣. المسند، ١٦٩/٢.

٤. جلال الدين السيوطي، شرح سنن النسائي، ١/(٢٣١ - ٢٣٣).

## بۆچی لەسەرمانە نوێژ بکەین؟

چونکە لە دوای شەهادەت هێنان، نوێژ گەورەترین پایەی ئیسلامە. وە هەروەها لە دوای یەکتاپەرستی یەکێکە لە هەرە گرنگترین بنەغەکانی ئاین. نوێژ دوا وەسیەت و ئامۆژگاری پێغەمبەرمانە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بۆ ئوممەتەکەی. لە ڕۆژی دواییشدا باوەڕدار لە پێش هەموو شتێکەوە لەسەر نوێژ لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

نوێژ، چاکترین کردەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردبێت. هۆکارێکە بۆ نزیك کردنەوەی مرۆڤ لە خوای گەورە. مرۆڤی باوەڕدار بە ئەنجامدانی نوێژەکەی شوکرانەبژێری ئەو نیعمەت و بەخششانە دەکات کە خوای گەورە پێی بەخشیوە. نوێژ؛ باوەڕدار لە گوناهەکان دەپارێزێت و دەبێتە قەڵغانێك بۆی. جگە لەمانەش دەبێتە هۆکاری لێخۆشبوونی گوناهەکانی و پاراستنی سزای ناو گۆڕ.

لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە نوێژ هەم لە دنیا و هەم لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە هۆکاری سەرکەوتن و یارمەتیدان و بەرچاو ڕوونی و سەرفرازیمان. هەر لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤی باوەڕدار لە هەر بار و دۆخێکدا بوو، نابێت نوێژ تەرك بکات.

## پەیوەندی نێوان نوێژ و ئیمان و ئیسلام چۆنە؟

جیاکردنەوەی نوێژ و ئیمان لە یەکتری بە هیچ شێوەیەك ناکرێت و گونجاو نییە. نوێژ و ئیمان هەڵقوڵاوی یەك سەرچاوەن و وەك دوو برای دووانە وان. ئیمان لایەنە فکرییەکەی ئاین و ئایینداری بنیات

دەنێت، بەڵام ئەوە پەرستشەکان و بە تایبەتی نوێژە، کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئەم لایەنە فکرییە و دەیگۆڕێت و دەیکاتە مۆرکێکی قووڵی سروشتی مرۆڤ. بە واتایەکی تریش دەتوانین بڵێین کە نوێژ، ئیمانێکی کردارییە و ئیمانیش نوێژێکی تیۆرییە. ئەو کەسانەی کە وا لە ئاین تێگەیشتوون کە ئاین قەبوڵکردنێکی ویژدانییە و پەرستش و بەندایەتی لەم سەردەمە جیادەکەنەوە. هەرچەندە وا دەزانن ئیش و کاریان لە بازنەی ئایندایە، بەڵام بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن دەکەونە ناو بازنەی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە.

بەڵێ، نوێژ کۆڵەکەی ئاینە. باوەڕدار بەهۆی ئەو نوێژەی کە ڕۆژانە بە لایەنی کەمەوە پێنج جار ئەنجامی دەدات، پاکدەبێتەوە و بۆی دەبێتە ڕووبارێکی تەوبە کە ڕووی لە جیهانێکی هەمیشەییە و، دەبێتە وێستگەیەکی خاوێن بوونەوە. نوێژ کە پەرستشێکی گرنگ و پەناگەیەکی تۆکمە و وەسیلەیەکی وەها پڕ بایەخە بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەدگار و هەروەها کورتترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە خوای گەورە، پێویستە تەنانەت لە مەترسیدارترین و گەرمترین ساتەکانی مەیدانی تێکۆشان و موجاهەدەدا حەقی خۆی پێبدرێت و ئەنجام بدرێت.

پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێت: "گەورەترین هۆکار کە مرۆڤ بگەیەنێت بە شیرك و کوفر، واز هێنانە لە نوێژ." لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە چۆن پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) باسی لەو پەیوەندییە بەهێزەی نێوان نوێژ و ئیمان کردووە. لە نێوان ئیمان و نوێژ پەیوەندیەکی ڕاستەوانە

هەیە. کاتێك کە مرۆڤ لە بەردەم پەروەردگاریدا بەندایەتی دەکات ئیمانی بەهێز دەبێت، کە ئیمانیشی بەهێز بوو ئەو کات بە عەشق و تاسەمەندییەکی زۆرترەوە نوێژەکانی ئەنجام دەدات.

لەم ڕۆژگارەماندا کۆمەڵە کەسانێك هەن کە ئەم بابەتە گرنگە بە چاوێکی سووك سەیر دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن و دەڵێن "دڵم پاکە و باوەڕم بەخوا هەیە." لە کاتێکدا بە شێوەیەکی ڕوون دیارە کە ئەم تێگەیشتنەی ئەوان کە پێیان وایە دڵپاکی بەسە بۆ مرۆڤ هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت. بە دەربڕینێکی تر دەتوانین بڵێین کە ئیمان لە چەند ڕێگەیەکەوە دەتوانرێت بەهێز و پتەوتر بکرێت، ئەو ڕێگایانەش بریتین لە:

چوون بۆ مزگەوت و ڕۆژوو گرتن و گرتنەبەری ئەو ڕێگایانەی کە دەبنە مایەی لەناوبردنی ئەو پیسییەی کە لە دڵماندایە. پاشان ڕۆیشتن بۆ ئەو حەجەی کە بە ئەرکێکی قورس و ناڕەحەت دێتە پێش چاومان و، فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە. چەندێك ئێمە لە پایەکانی ئیسلامەوە نزیك بین، ئەوا ئەوەندەش ئەو پایانە ڕاست و چەپ و پێش و دوا و سەرەوە و خوارەوەی ئیمانمان دەگرن و دەبنە پاڵپشتێکی توند بۆ بەهێزبوونی.

## نوێژکردن لە بارودۆخە سەختەکاندا

بەها و گەورەیی پەرستشەکان بەو ئەزیەت و ناڕەحەتیانە دەپێورێن کە بە مرۆڤی دەدەن. وە بێگومان ئەو پەرستشانەی کە لە کاتە قورس و

ناڕەحەتەکاندا دەکرێن پاداشتیان زیاترە. پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی خێر و چاکدا، چەندە ناڕەحەتیمان توش ببێت و ئەو کردەوەیەش چەنێك بە زەحمەت ئەنجام بدرێت، ئەوا ئەوەندە پاداشتی لەسەر وەردەگرین.

ئێمە چەنێك خۆمان بە کردەوە قورسەکانەوە خەریك بکەین و چەند بەسەر لەمپەرە سەختەکاندا سەربکەوین، ئەوا پاداشتەکەشمان بەو ئەندازەیە زۆر دەبێت. بۆیە ئەگەر بە بەقووڵی پەرستشەکان تێبگەین، ئەوە ڕۆحمان لێوانلێو دەبێت لە هەستە جوانەکان و ئیرادەمان سەردەکەوێت بەسەر لەمپەرەکانداو، دەستنوێژێکی ڕێکوپێك بگرین و پاشانیش نوێژەکەمان ئەدا بکەین. بێگومان کردنی نوێژێکی لەم جۆرە پاداشتەکەشی بەهەمان شێوە گەورە و زۆر دەبێت.

پێغەمبەری ئازیز (صَلَّىٱللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) ڕوودەکاتە هاوەڵە بەرێزەکان و پێیان دەفەرموێت: "ئایا دەتانەوێت ئەو شتانەتان پێ بڵێم کە بەهۆیانەوە خوای گەورە لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و دەیانسڕێتەوە و دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەتان. پاشان ئەو شتانەی پێی وتن بریتی بوون لە: دەستنوێژێکی بێ کەم و کورتی لەو دۆخانەدا کە دەستنوێژ گرتن قورسە و زەحمەتێکی زۆرمان پێدەگەیەنێت و، بڕینی ڕێیەکی دووری نێوان ماڵەوە و مزگەوت و، هەروەها چاوەڕوانکردنی نوێژی داهاتوو پاش بەئەنجام گەیاندنی هەر نوێژێك.

پێغەمبەری ڕابەرمان (عَلَيۡهِأَفۡضَلُالصَّلَاةِوَأَتَمُّالتَّسۡلِيمِ) لە دوای باسکردنی ئەم کردەوانە. فەرمووی: "ئەمە ئەو خۆ پەیوەست کردنەیە بە خواوە کە هاوشانی نۆبەت گرتن و پاراستنی سنووری وڵاتی موسوڵمانانە، واتە (الرباط)."

پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ ألفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەم فەرموودە پیرۆزەدا دەستنوێژی بە وشەی "إسباغ" دەربڕیوە، لەبەر ئەوەی ئەم وشەیە چەند مانایەك لە خۆ دەگرێت، کە ئەوانیش بریتین لە بەجێهێنانی پێویستیەکانی دەستنوێژ و، گرتنی بە شێوەیەکی تەواو و پاکردنەوەی دەم و لووت بە باشی و، شۆردنی دەست و قاچ بەبێ کەم و کورتی.

یەکێکی تر لەو وشانەی کە لە فەرموودەکەدا ئاماژەی پێدراوە وشەی "علی المکارە"، ئەم وشەیەش مانای ئەوەیە کە بەبێ ئەوەی ساردی و گەرمی ئاوەکە لێکبدەینەوە دەستنوێژەکانمان بە شێوەیەکی تەواو و بێ کەم و کورتی بگرین.

کاتێك سەیری ژیانی پێغەمبەری ڕابەرمان (عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پێغەمبەر لە کاتی جەنگەکانیشدا وازی لە نوێژ نەهێناوە و تەنانەت نوێژەکانی بە کۆمەڵ کردووە. هاوەڵە بەڕێزەکان لە ناهەموارترین ساتەکانی جەنگی بەدردا نوێژیان بە کۆمەڵ دەکرد. سوپای بێ باوەڕان سێ ئەوەندەی سوپای موسوڵمانان بوو. لە بەرەنگاربوونەوەیەکی تەواوی ژیان و مردندا بوون. بەڵام پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ ألفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) و هاوەڵە بەڕێزەکان لە جێی بیرکردنەوە لە پاراستن و ڕزگارکردنی گیانی خۆیان، نوێژکردنیان بە کۆمەڵ و شان بە شانی یەکتر و پێکەوەبوونیان لە بەردەم خوای پەروەردگاردا هەڵدەبژارد.

کاتێك کە نیوەیان نوێژیان دەکرد، ئەوانی تر دەجەنگان و کاتێکیش کە نوێژکەرەکان دەجەنگان ئەوانی تر نوێژیان بە کۆمەڵ دەکرد. ئەم

دیمەنە لە قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتی (١٠٢)ی سورەتی (النساء) دا ئاماژەی پێدراوە.

نەفس و شەیتان بۆ دوورخستنەوەمان لە نوێژ چەندین جۆر بەهانەمان بۆ دەدۆزنەوە، لەوانەش: "ئیشەکانم زۆرن و دەرفەتێك نادۆزمەوە بۆ نوێژ کردن. یان کە لەسەر کار ڕێم پێنادەن نوێژ بکەم."

باشە ئایا نوێژکردن گرنگترین کردەوە نیە؟ تۆ بڵێی نەتوانین لە کاتی پشوودانی نیوەڕۆدا یاخود لە کاتی پێویستیدا وە یان لە کاتەکانی حەوانەوەدا پێنج تا دە خولەك بۆ نوێژەکانمان جیابکەینەوە و بەجێیان بهێنین. ئەمە لەکاتێکدا نوێژەکانمان دەبنە هۆکاری ڕێکوپێك بەڕێوەچوونی کارەکانمان.

هەندێك لە خەڵکی هیچ کاتێك نوێژەکانیان ئەنجام نادەن بە بیانووی ئەوەی کە لە شوێنی کارەکانیان توانای نوێژکردنیان نیە. هەرچەندە ئەو نوێژانەی کە دەکەونە کاتی کارکردنمان یەك دوو دانەن. بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا لەبەر ئەوەی کاتی نێوان نوێژەکان زۆرە کێشەیەکی وامان بۆ دروست نابێت. بەڵام لە وەرزی زستاندا لەوانەیە کێشەمان لە نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسردا بۆ دروست ببێت. سەرەڕای ئەمەش بە ڕێکخستنێکی باشی ئەو کاتژمێرانەی کە بۆ حەوانەوە پێمان دراوە دەکرێت نوێژەکانمان بەجێ بهێنین.

هەندێك جار ئەو کاتەی کە پێمان دراوە بۆ چوونە سەر ئاو کەمە. بەشی ئەوە ناکات کە دەستنوێژ و نوێژی تێدا بە ئەنجام بگەیەنین. بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەو کەسەی کە دڵی پڕە لە عەشقی نوێژ، لە

چوونی یەکەمدا هەڵدەستێت بە دەستنوێژ گرتن و لە چوونی دواتریشدا نوێژەکەی بە ئەنجام دەگەیەنێت.

ئەگەر هێشتا کێشەی کات و شوێنتان هەبوو ئەوا تەنها ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان بەسە بۆتان.ئەگەر کەسێك لە شوێنی کارەکەی هیچ شوێنێکی نەدۆزییەوە بۆ بەجێهێنانی نوێژەکەی، ئەوا پێویستە هیچ نەبێت بۆ بە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکانی شوێنێکی بەتاڵ یان گەنجینەی شوێنەکە یان هەر جێگایەکی تر بدۆزێتەوە. چەندین ڕێگای جۆراوجۆر هەیە بۆ ئەو کەسەی مەبەستیەتی نوێژ ئەنجامبدات. ئەوەندە بەسە کە ئێمە هەڵپە بکەین بۆ کردنی نوێژەکانمان ئیتر خوای گەورە خۆی شوێن و کاتمان بۆ دەستەبەر دەکات.

نەکەن بڵێن "چی دەبێت ئەگەر چەند نوێژێکمان بە قەزا بگێڕینەوە؟ بەڵکو کردنی نوێژێك لە کاتی خۆیدا هەموو دنیا دەهێنێت! ئێوە لە هەر کات و ساتێکدا بیر لەوە دەکەنەوە کە ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانتان، ئەوا ئەو کاتانە دەچنە حوکمی پەرستشەوە بۆتان.

بەڵێ، نوێژ پەرستشێکی وەهایە کە لە هەر کات و بارودۆخێکدا بێت، نابێت تەرك بکرێت.

ئاوەکان تا گەرمی نەبینن و نەبن بە هەڵم، ناگەن بە ڕوونی. تۆو هەتا نەتەقێت و نەڕزێت، ژیانی چرۆ و گوڵ نایەتە بەرهەم. ڕووبارەکان بەردەوام بەخوڕ دەڕژێن و هەمیشە دەکێشن بە تاشەبەردەکاندا، بەمەش دەپاڵێورێن و خاوێن دەبنەوە و، دەگەن بە ئاستی دڵۆپەکانی چاوی هەور. بە بێ بەفر و باران بەهار نایەت، ئەگەر بشیەت نرخی نازانرێت. ئاڵتوون لەو نرخ و بریسکەیەی کە بەدەستی دەهێنێت و. پۆڵاش لەو بەهێزی و خۆڕاگرییەدا کە خاوەنیەتی، قەرزاری ئەو مەنجەڵ و قازانانەن کە تیایاندا تاونەتەوە. خاکی ڕەق و تەق بە ئەندازەی ئەو هەورەگرمانەی کە بەسەریدا دەبارێن، دەبووژێتەوە و هەڵدەناوسێت و دەگات بە ئاستی دایکایەتی کردن بۆ هەزار و یەک گوڵ و ڕێحانە. تاریکی لە باوەشیدا ڕووناکی گۆش دەکات و لەکۆتاییشدا بە زیانی خۆی دەشکێتەوە. زستان، هەمیشە ئامێری جۆلاییەکەی لەپێناو چنینی بەهاردا دەجووڵێنێت. لەبەر ئەمەیە کە هەموو زستانێك بەهار و، هەموو شەوێك ڕۆژێکی لەدوایە. مردنەکان لەپێناو ژیانەوە و ئازارەکانیش لەبەر خاتری ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگترن. تاك، بەدرێژایی ژیانی هەزاران جار دەمرێت و دەژیەتەوە و، بەمەش لە پەستانە تاریك و خەڵەتێنەرەکانی (من) ڕزگاری دەبێت و، دەگات بە نەمریی ڕۆح.




IRFAN

نرخی ٤٥٠٠ دینارە